

٢٣

# ئیسلامناسیی
# یان
# ئیسلامنەناسیی

وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس


نووسینی:

ئیكرام كەریم



www.tishbooks.com

# ئیسلامناسیی
# یان
# ئیسلامنەناسیی

**وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس**

**نووسینی :**

**ئیكرام كەریم**

**١٤٢٨ كۆچی**　　**٢٠٠٧ زایینی**

ناوی کتێب: ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس

نووسینی: ئیکرام کەریم

شوێنی چاپ: کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر

نۆرەی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردن: (٨٦٨) ساڵی (٢٠٠٧)

ساڵی چاپ: ٢٠٠٧

تیراژ: ١٠٠٠

له بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٢٣)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت: www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

"أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ هَذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ"(الأنبياء: ٢٤).

یان بێجگە لە خوا بە چەندان خوای ترەوە هۆگر ئەبن، بڵێ: بێنن بزانم بەڵگەتان کامەیە، ئەم قورئانە بەڵگەی هەموو ئەوانەیە لەگەڵ مندان و بەڵگەی پێش منیش هەیە (کە ئێوە بە هەڵەدا چوون لەوەدا کە هۆگری خوای تریش ئەبن) بەڵام زۆربەی خەڵك حەق ناناسێت و هەر لەبەرئەوەیە دژایەتی ئەکات.

## پێشەکیی

کتێبی ئیسلامناسی یەکێکە لەو کتێبانەی کە ماوەیەکی زۆرە بە دەست ئەو ڕێکخستانەوە ئەمدەستو ئەودەست ئەکات، کە ئامانجیان ئەوەیە ئیسلامو ئەهلی ئیسلامو مێژووی ئیسلامیی لەبەرچاوی گەنجو لاوانی ئەم میللەتە ناشیرین بکەن، نووسەری ئیسلامناسی کابرایەکە بەناوی (عەلی میر فطروس) کە (شوان ع و سیامەکی بابەك) دوو کەسی نادیارن ناویان ناوە (عەلی میر فیردەوسی) ئەم کتێبەیان بۆ بڵاوکردووەتەوە، ئەم نووسەرە دەیەوێت بیسەلمێنێت کە ئیسلام دینێکی عەرەبییەو پەیوەندی بە میللەتانو وڵاتانی ترەوە نییە، هەروەها ئەیەوێت بە گەنجو لاوانی ئەم میللەتە بڵێ: ئیسلام زادەی بیرو بیرکردنەوەی پەیامبەر موحەممەد ﷺو هیچ پەیوەندییەکی بە خواوە نییە!.

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەیەوێت ئەوە بکاتە هەقیقەت لە خەڵکی، کە مێژووی ئیسلامی هیچ نییە ئەوە نەبێت تۆمارێکە لە شەڕو هەراو کوشتو کوشتارو چەوسانەوەی خەڵك، ئەم نووسەرە جگە لەوەی هەڵبەزو دابەز لە ناوەکەیدا هەیەو دوو ناوی خوازراویش پەسەندیدەی ئەکەن، زۆر (نەزانین)و (ئارەزووبازی) لە نووسینەکەیدا هەیە کە ئێمە لە دواوە ڕاستی ئەم قسەیە ڕۆشن ئەکەینەوە.

من کە ئەم کتێبەم خوێندەوە دوو مەسەلەم بۆ هاتە پێش:

یەکەم: کوێی ئەم کتێبە بدەیتە بەر ڕەخنە، پێشەکییەکەی (کە هی شوانو هی بابەك)ن یان بابەتە بنەڕەتییەکەی کتێبەکە، یان پەراوێزە زیادو ناپێویستەکانی، یاخود سەرچاوە نادروستو نازانستییەکانی!!، چونکە لە ڕاستیدا لە هەموو ئەوانەدا (ئارەزووبازی)و (نەزانین) بە سیمایانەوە دیارەو تۆی خوێنەری بەڕێزیش لەگەڵمان بیت ئەوە لە برگەکانی دواتردا دەبینی.

دووەم: ئایا ئەو سەرچاوانەی ئەم کتێبەکەی لێ وەرگرتووە چۆنی دەستبخەم تا ڕاددەی دەستپاکی نووسەرم بۆ دەربکەوێت لە گواستنەوەکانیدا.

جا لەبەر ئەوەی سەرچاوەکانی نووسەر بە نزیکی هەموو فارسییەو دەستکەوتنی بۆ من زۆر زەحمەت بوون بۆیە تەنیا بۆ ئەو سەرچاوانە گەڕامەوە کە زانیاریی هەستیارو بوختانی شاخداری لێ وەرگرتوونو دەرم خستووە کە لەو گواستنەوانەدا دەسپاك نەبووەو بەڵکو گزیبازی زۆری تێدا کردووە.. لەوەوە گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە نووسەر لەوانی تریشدا هەرهەمان کاری کردووە، چونکە وەك بنەما لۆژیکیەکە ئەڵێ: "أستدل بالمعلوم على المجهول"، بۆ گەیشتن بەوەی نایزانی، ئەوەی ئەیزانی بیکە بە بەڵگە، واتە: ئەگەر کەسێکت بینی دەمی ئەکوتا لە هەموو باسێكو وای دەرئەخست کە لەوسەری هەموویانەوە دێتەوە، تۆش زانیاریت بەو باسانە نەبوو تا بزانی ڕاست ئەکات یان نا، ئەوە هەندێ پرسیاری لێ بکە لەو شتانەی کە خۆت وەڵامەکانی ئەزانی، جا ئەگەر وەڵامەکانی بۆ ئەو شتانەی تۆ زانیاریت دەربارەیان هەیە هەڵەبوون، ئەوە دیارە ئەوانی تریشی هەڵەیەو هەر وا ئەنیشێتە مل شتەکانو تۆ زانیاریت نییە پێیان، خۆ ئەگەر وەڵامەکانی بۆ ئەو شتانەی تۆ ڕاستو دروستو زانستی بوون ئەوە دیارە ئەوانی تریشی هەر زانستیو ڕاستو دروستن.

جا (عەلی میر فطروس) لە بەکارهێنانی زانیارییەکانیدا لەو سەرچاوانەی من دەستم کەوتنو ئەو بەکاری هێناون، تەزویری زۆری کردووە، دەی ئەوە دیارە لەو سەرچاوانی کە (نووسەریان نییە) یان (ساڵی چاپو چاپخانەکانیان)ی نەنووسیوە ئەوە بێگومان بەبێ سڵکردنو سڵەمینەوە بە ئارەزووی خۆی گەزوو پێوانەی کردووە لێیان!

ئەم کتێبەی (شوان ع)و (سیامەکی بابەك)و (عەلی میر فطروس) بریتییە لە چواربەش:

بەشی یەکەم: دوو پێشەکی بزرکاوی پڕ هەڵەو درۆ (بە ڕاستی درۆ) بۆ نموونە سیامەکی بابەك کە گوایە وەرگێڕی کتێبەکەیە (کە دیار نییە لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی یان لە ئینگلیزییەوە) ئەڵێ: "بۆ ڕێنوسی کتێبەکە پێڕەوی کتێبی (ڕێنوسی کوردی دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف، بەغدا ١٩٨٦م کردووە) کەچی دوای سێ دێڕ دەنووسێ ئەم پێشەکییەی لە (١٩٧٨/١)دا نووسیوە!!". دەی ئەمە چۆن وا دەبێت، نووسینێك لە (١٩٧٨)دا بنووسرێ سەرچاوەیەکی بەکارهێنابێ کە لە (١٩٨٦)دا چاپ کرابێ؟!

یان هەر لە لاپەڕەی پێشوودا باس لەو چاپە زۆرانەی ئەم کتێبە ئەکات کە لە دنیادا کراوەو بە ئارەزووی خۆی ساڵ ڕیز ئەکات (١٩٨٧، ١٩٧٩، ١٩٨٠) کەچی ئەم (بابەکە) لە ١٩٧٨/١/١ تەواوی ئەم زانیارییانەی نووسیوە! واتە لە (١٩٧٨)دا ئەو باس لە چاپەکانی (١٩٨٠)ی ئەم کتێبە ئەکاتو ڕێنووسی کتێبەکەشی لە ڕووی کتێبەکەوە نووسیوە کە (١٩٨٦) چاپ کراوە!!

بەشی دووەم: بریتییە لە ناوەڕۆكو بنەڕەتیی کتێبەکە لە (ژیانی پێغەمبەر ﷺو ژیانی خولەفای ڕاشیدین)، کە ئەوەی ڕاستو دروست بێت لە دەمی قەڵەمەکەیەوە نەهاتووەتە دەر ئەگەر ڕاستیشی وتبێت لەبەر ئەوە بووە کە زیانی بە ئامانجەکەی نەگەیاندووە کە شوان لە (ل٨)دا دەڵێ: "لە کۆتایدا ئامانجیش تەنیا ڕوونکردنەوەی ڕووبەرە تاریکەکانی (مێژوویەکە) فراوانترین پانتیی لە بوونو هۆشیاریماندا داگیر کردووە!".

بەشی سێیەم: پەراوێزە زۆر ناپێویستو نا دروستەکانە کە بۆ جۆرێك گزیکردن لە خوێنەر لە پەراوێزەکانی تری جیاکردوونەتەوەو کردوونیەتە بەشێکی سەربەخۆ لە کۆتایی کتێبەکەدا.

بەشی چوارەم: بریتییە لە تۆماری سەرچاوەکان کە زیاد لە تێبینییەك هەڵدەگرێ.. بەڵام من وەڵامەکانم بۆ کتێبەکە کردە سێ بەش، چونکە هەر ئەوەندە پێویستە.

بەشی یەکەم: ژیانی پێغەمبەر ﷺو چەواشەکانی (میر فطروس).

بەشی دووەم: ژیاننامەی خولەفای ڕاشیدینو چەواشەکارییەکانی نووسەر.

بەشی سێیەم: پەراوێزە ناپێویستەکانی نووسەر.

حەزمکرد ڕێکاری نووسینەکەشم لەم کتێبەدا بەم شێوەیە بێت.. سەرەتا قسەی نووسەر بڕگە بڕگە دێنم، پاشان بڕگە بڕگە وەڵامی ئەدەمەوەو ئەوەی (نەزانین)و (ئارەزووبازی) بێتو پێی بزانم دەری دەخەمو چاوپۆشی زۆریش ئەکەم لە هەندێ کاتدا.

ئومێد ئەکەم بەم نووسینەم ئەرکێکی سەرشانم ئەنجام دابێتو سودێکیشم بە لاوانو گەنجانی میللەتەکەم گەیاندبێت، هەروەك ئومێدەوارم هەرکەس ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە ئەگەر چاکم نووسیوە دوعای خێرم بۆ بکات، ئەگەر هەڵەشم نووسیوە بەچاوی بەزەییەوە بڕوانێتە (دیاری)و (خاوەن دیاری)و کوردیش ئەڵێ: دیاری شوان هەڵەکوکەو با لە جیاتی کاری سلبی هەموو ئەو هەڵانەم بە دیاری بۆ بنێرێتو منیش بۆ چاپی تر سوودیان لێ وەربگرم.

**ئیکرام کەریم**

**هەڵەبجە**

**مانگی مەولودی ١٤٢٧ك، نیسانی ٢٠٠٧**

## پاشبەندی لەسەر پێشەکییەکانی (نووسەر)و (وەرگێڕ)و (بلاوکەرەوە)

بۆ ئەوەی خوێنەر هەر زوو تێبگات لە ئاستو ئامانجەکانی نووسەرو وەرگێڕو بلاوکەرەوەی (ئیسلامناسی) بە پێویستم زانی ئەم چەند تێبینییە گشتییە بدەم:

یەکەم: سەرپێیی و بزرکاوی زۆر بەم کتێبەوە دیارەو نازانرێ هۆکەی چییە؟ لە چێشتێك ئەچێ کە هەڵپرووزێنرابێت بۆ مەبەستێکی تایبەتی.. با بۆ نموونە سەیری ئەم شتانەی بکەین:

. لە بەرگەکەیدا نووسراوە (چاپی دووهەم، ٢٠٠٥) کەچی ڕاستەوخۆ لە پەڕەی دوای بەرگدا نووسراوە (١٩٩٩)!

. لە لاپەڕە (٩)دا سیامەکی بابەك باسی چاپەکانی ساڵی (١٩٨٠)ی کتێبەکە ئەکات لە کاتێکدا ئەم قسەیە لە (١٩٧٨/١/١)دا ئەوترێ!!

. بە هەمان شێوە ئەم (بابەکی)یە کە لە (١٩٧٨/١/١)دا کتێبی (ئیسلامناسی) وەرگێڕاوە سوودی لە کتێبێك وەرگرتووە کە ساڵی (١٩٨٦) لە بەغدا بە قسەی خۆی چاپ کراوە!! ئەمە تەنیا لە چوار لاپەڕەی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئەم هەمووە قسە بزرکاوە هاتووە..

دووەم: خوێنەر نازانێ نووسەری کتێب ناوی (علی میر فطروس)ە یان ناوی (عەلی میر فیردەوس)ە، چونکە نووسەر لە هەندێ شوێندا بە (میر فطروس) ناوی ئەبات وەك لە لاپەڕە (١١)دا، کەچی لە شوێنی تردا ئەڵێ: "میر فیردەوسی" وەك لاپەڕە (١٢٨)، لە کاتێکدا کە نووسەرانی تری وەك فوئاد مەجید میصری لە کۆمەڵگەکەیدا هەر بە (میر فطروس) ناوی ئەبات.. جا کەواتە لە خۆڕایی کرنی (فطروس) بە (فیردەوس) ئەگەر نەزانین نەبێت ئەوە گزیبازییە لە گوێو عەقڵی خوێنەر، خۆ ئەگەر لەبەر مۆسیقا، (ط)ی کردبێت بە (د) ئەوە ئەبوو بیوتایە (میر فیدرۆس) نەك (میر فیردەوس).. بەلام دیارە ئەوە، یان ئارەزووبازییە یان نەزانین"ەو هەردووکیشیان هەر خراپە.

سێیەم: ئەم کتێبە نە کتێبێکی زانستییەو نە بەهای زانستیشی وەرگرتووە لەبەر زۆر هۆ:

١. کتێبەکە خۆی هیچ ڕێکارێکی ئەکادیمی پێوە نییەو مەبەستیشم تەنیا سەرەتاو ناوەڕۆكو کۆتایی و پەراوێزو سەرچاوە نووسین نییە، بەڵکو چۆنێتی بەکارهێنانی سەرچاوەکانە.

٢. سەرچاوەکانی نەك ڕەسەن نین بەڵکو نامۆو نەناسراوو گوماناوین، نووسەریش لە زۆر شوێندا ناوی سەرچاوەکانو نووسەری سەرچاوەکان نازانێ!.

٣. نووسەر لە هیچ شوێنێکدا (مەوزوعی) نییەو بەڵکو تەرەفدارەو خۆی (دەعواچییە)و هەر خۆشی دادوەرەو چۆنی ئارەزوو لێیە لەو دادگایەدا بڕیار ئەدات!!

بۆ نموونە لە (ل٦)دا ئەڵێ: "ئاین بۆ ڕاکێشانی مرۆڤە بێ هیواو تێکشکاوەکانی کۆمەڵگا بووە" یان لە (ل٧)دا دەڵێ: "عوسمان زۆرجار بە بیانووی سەرقاڵی کارەوە خۆی لە شەڕ ئەدزییەوەو کەچی لەلایەن پێغەمبەرەوە بەبێ ئاگاداری خۆشی کرا بە پارێزگاری مەدینە!!".

هەر بۆنموونە سەیری (ل ٣٤)و (١٣٠) بکە، نووسەر وا ئەزانی نووسەری (الفصل في الاهواء والملل والنحل) ناوی (ئیبن خورەم)ە لە کاتێکدا نووسەری ئەو کتێبە (ئیبن حەزمی ظاهري)ە جا کاکە سیامەك (حەزم)و (خوڕەم) لە یەك نەکاتەوە، خۆ ئەگەر هەر ئەو جارە بوایە من لای خۆمەوە عوزرم بۆ دائەناو ئەمگوت هەڵئەگرێ هەڵەی چاپ بێت، بەلام بەردەوام هەر (ئیبن حەزم) بە (ئیبن خوڕەم) دەنووسێت!.

لە (ل ٤٥)یشدا بۆ نموونە ئەڵێ: (سەید محمد قوتب ئیسلامناسی میسری) لە کاتێکدا دوو نووسەر هەن لە میسردا (سەید قوتب)و (موحەممەد قوتب)و برای یەکترن، یەکەمیان لە ژیاندا نەماوەو دووهەمیان هەر ماوە، جا کاکە (خورمشانە) هەردووکیانی کردووە بە یەکداو ناوێکی لێ دروست کردوون، ئەوە بەڵگەیەکە ناوی

**نووسەرەکانیش نازانێ، بۆ سەرچاوەکانیش ئەتوانی هەمان قسە بکەی‌و بێ دوودڵی بڵێی: نووسەر نازانێ ئەو کتێبانە چەند بەرگن‌و باس لەچی ئەکەن، بۆ نموونە سەیری ئەم هەڵەیەش بکە..**

**(سیامەك) یان (میر فطروس) ئەڵێ: "اثار الباقیة أبوریحان بیروني" ئەمە سەرچاوەیەکی عەرەبییە ناوەکەی بەم شێوەیەیە (الاثار الباقیة، ابوریحان البیروني) خۆ ئەگەر ئەوە بوبێتە سەرچاوەیەکی فارسی ئەبێ بڵێ (اثار باقیة) کەواتە کاکە ناوی سەرچاوەکانیش نازانێ.. کە نایزانی بە دەرد ی خۆتەوە دانیشە! هەروەها ئەم هەڵەیە لە زۆرێك لە ناوی ئەو سەرچاوانەدا دووبارە بووەتەوە[1].**

**چوارەم: ناوی ئەم کتێبە زۆر لە ناوەڕۆکەکەیەوە دوورە، ناوی ناوە (ئیسلامناسی) لە کاتێکدا دەستی بۆ ناوەڕۆکی ئیسلام‌و باسە هەستیارەکانی ئیسلام نەبردووە، بەڵکو تەنیا باسی لە یەك دوو ڕووی ئیسلام کردووە، ئەویش بە چەواشەکارییەوەو تەنیا باسی لە چۆنییەتی سەرهەڵدانی ئیسلام کردووە. کەچی چاو لەو هەموو گۆڕانکارییە دائەخات کە ئیسلام لە هەست‌و عەقڵ‌و واقیعی ئەو خەڵکەدا دروستی کرد، باسی کێشەیەکی بچووك یان زۆرجار هەڵبەستراو دەکات‌و لێوەی بوختان‌و جنێو ڕیز ئەکات بۆ (صەحابە)و خولەفاو تەنانەت (پێغەمبەریش ﷺ) لەوەش هەر خراپتر تەنانەت قسەی ناشایستەو پیس بەرانبەر زاتی خواش (جل جلالە) ئەکات، ئەوەتا ئەڵێ:**

**"بەڵی، ئەوکاتەی پێی خوا لە کۆمەڵگا دادەکرێتەوە خاوەنداریێتیی تایبەتی کۆمەڵگا بەجێ دێڵێت.."[1]. لە لاپەڕەکانی دواییدا بەدرێژی ئەمانە باس دەکەین‌و دەیسەلمێنین کەسێك بیەوێت ئیسلام بناسێ پێویستە هەموو لایەنەکانی باس بکات، دوای ئەوە ئیتر ئارەزووی خۆیەتی لەسەر برگەیەك یان زیاتر قسە ئەکات بەخێر یان بە شەڕ، ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی دوو مەسەلەی گەورەی لق‌و پۆپ دارە، عەقیدەت‌و شەریعەت.**

**عەقیدەش واتە بڕوادامەزراندن بۆ مرۆڤەکان بە: ١- خوا ٢- پێغەمبەرایەتی ٣- بە زیندوو بوونەوە ٤- بە دونیای غەیب (میتافیزیك).**

**شەریعەتیش واتە بوونی دەستورو یاسا بۆ ئوممەتی ئیسلام کە خۆشیان‌و خەڵکی تریش ملکەچی بۆ بکەن.زانایان ئەڵێن: شەریعەت کار بۆ دامەزراندن‌و پاراستنی (٧) شتی زۆر پێویستی ئەم مرۆڤە ئەکات:**

**١. سەلماندنی دین‌و پێویستی خەڵك بە دین‌و پاراستنی‌و ڕێگەنەدان بە سووکایەتی کردن پێی، چونکە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ ئاسوودەبێت بە بێ دین.**

**٢. سەلماندنی ڕێز بۆ گیانی مرۆڤ‌و پاراستنی‌و ڕێگەنەدان بە کوشتنی‌و لەناوبردنی بەبێ هۆی مەشروع.**

**٣. سەلماندنی ڕێز بۆ وەچەو نەوەکان‌و پاراستنیان‌و ڕێگەنەدان بە لەناوبردنی منداڵ بە (تۆو)ی یان بە (کۆرپەلەیی) یان (بە ساوایی)و هتد..**

**٤. سەلماندنی ڕێز بۆ ماڵ‌و موڵکی خەڵك‌و پاراستنی‌و ڕێگەنەدان بە داگیرکاری‌و مافخواردنی خەڵکی.**

**٥. سەلماندنی ڕێز بۆ عەقڵ‌و پاراستنی‌و ڕێگەگرتن لە هەموو ئەو شتانەی عەقڵ ناهێڵێ یان کزو بێخێری ئەکات.**

**٦. سەلماندنی پێویستی مرۆڤەکان بە دەوڵەت‌و دامەزراندنی‌و پاراستنی بەهەموو هۆکارێکی دروست.**

**٧. سەلماندنی مافەکانی مرۆڤ‌و حورمەتگرتنی‌و ڕێگەنەدان بە (غەیبەت)و (قەزف)و (تەشهیر)و بێ ڕێزی بە بەرامبەر.**

**جا ئەگەر لق‌و پۆپەکانی هەریەك لەو (مادانە)ی دەستووری ئیسلامیی باس بکەین ئەوە چەند کتێبێکی گەورەی دەوێت‌و ئەگەر کاکە شوان یان سیامەك یان (میر فطروس)ەکەیان، بڕوایان وا نییە، با بۆ نموونە نامیلکەیەکی**

---

[1] بۆ نموونە سەیری لیستی سەرچاوەکان بکە لە کۆتایی کتێبەکەدا.

بچووکی وەك "نظام الاسلام"ی (تقي الدين النبهاني) بخوێننەوە، چونکە دیارە تاقەتی خوێندنەوەی کتێبی گەورەیان نییە، با تەنیا بۆ نموونەش چەند بڕگەیەکی کەمی یەکێك لەو مادانە بخەینە بەردەستی ئەو نوسەرانەو خوێنەرانی بەڕێزیش نەك گەڕانەوەمان نەبێت بۆ ئەم خاڵە.

[1] ئیسلامناسی ل (١١١).

## ماددەی "دەوڵەت" لە دەستووری ئیسلامیدا :

. دەوڵەت دامەزراندن، وەزیفەیەکی شەرعییە بەپێی ئیجماعی زانایانی ئیسلامیی .

. دەوڵەتی ئیسلامیی بۆ پاراستنو پاسەوانی دینو ئیدارەدانی دونیا بە دین دائەمەزرێت.

. کاروباری دەوڵەتی ئیسلامیی ئەبێت بە "شورا" ببرێت بەڕێوە .

. شورا حوکمی ئیلزامی هەیە بۆ سەرۆکی وڵات.

. شورای ئیسلامیی لە دوو توێژی ناو خەڵك دروست دەکرێت: زانایان و کاربەدەستان.

. کاربەدەستان پێویستە نوێنەرانی ڕاستەقینەو هەڵبژێردراوی خەڵك بن.

. بەداد جوڵانەوە ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامییە گوێڕایەڵیش ئەرکی جەماوەری موسڵمانە.

. یاخی بوون لە دەوڵەت "بەغی"و لە سنووردەرچوونە، ئەگەر هەڵسوڕێنەرانی دەوڵەت کافرنەبنەوە.

. هێزی نەیار ئەگەر (شەوکەت)[1]ی نەبێت مافی قەوارەو کارکردنی ئەبێتو ڕێگەی پێ ئەدرێ.

. بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەیە لە پێناو ڕاگرتنی دادو یەکسانیدا بە زۆر زەکات لە دەوڵەمەندان بسەنێتو دابەشی بکاتەوە بەسەر خاوەن مافەکانیداو هەرکەسو تاقمێکیش لەم زەکاتدانە یاخیی ببێت دەوڵەت بۆی هەیە شەڕ لە دژی ڕابگەیەنێت.

. دادگاو قەزاوەت دەسەڵاتێکی سەربەخۆیە، لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، دەوڵەت ملکەچە بۆی نەك ئەو ملکەچ بێت بۆ دەوڵەتو دەزگاو کەسەکانی.

هەموو ئەوانەی کە تەنیا بۆ نموونە وتمان، لە کتێبە قانونییەکانی زانایانی ئیسلامیدا بەدرێژی باسیان لێوە کراوە، لەوانە "الاحکام السلطانیة"ی چ ماوەردی شافعی مەزهەبو چ (ابن الفراء)ی حەنبەلی مەزهەب[2]، هەروەها "السیاسة الشرعیة"ی شێخ ئیبن تەیمیەو "نظام الحکم"ی نەبهانیو "التشریع الجنائي" عەبدولقادر عەودەو .. هتد.

جا کتێب بە ناوی "ئیسلامناسی" بوختان ئەبێت ئەگەر هەموو لایەنەکانی ئیسلام باس نەکاتو بێت بنووسێت بە چەند باسێکی کورت و کەمەوە کە ئەو باسانەش بە نێتیی خراپو تەعبیری خراپ باسیان بکات، وەك لە دواوە ڕوونی دەکەینەوە .

پێنجەم: لە پێشەکییەکەی (شوان. ع)دا هەڵەو بوختانی زۆر هەیەو پێویستە پێش ئەوەی بچینە سەر باسە بنەڕەتییەکانی کتێبەکە ئەوانە وەڵام بدەینەوە.

. "شوان. ع" ئەڵێ: "بنەڕەتیترین پایەی هەر ئاینێك، ئەو خۆ بەدەستەوەدانە بەردەوامەیە کە مرۆڤ ناچار بە چۆکدادانو کڕنووشو ملکەچی دەکات بۆ هێزێکی نادیارو ڕەها، گەورەترین گوناهو تاوانیش لای ئاینەکان ئەو کاتەیە کە مرۆڤ بە ئاگادێتەوەو دەیەوێت لەو "هوشیارییە ئاوەژوو کراوە" ڕزگاری بێت"[3].

هەروەها ئەڵێ: "ئاساییە ئەگەر ئایین بە گشتی کەسایەتییەك بەرهەم بێنێت کە موتڵەق بیروڕای خۆی بەڕاست بزانێتو گیانی ڕەخنەگرتنو بیرکردنەوەی تێدا نەبێت"[4].

---

[1] لە زاراوەی زانایانی ئیسلامیدا ڕستەی (ذی شوکە) بەکاردەهێنرێ کە بە تەعبیری ئەم سەردەمە ئەکرێ بوترێ (خاوەن میلیشیا) واتە هێزێکی فیکریو سیاسیی بێت نەك هێزێکی سەربازیی.

[2] لەناو کەلەپووری ئیسلامیدا دوو کتێب هەیە بەناوی "الأحکام السلطانیة". یەکێکیان هی (ماوردی)ە، کە زانایەکی ئوسوڵی شافعییەو ئەوی تریان ناوی "ابن الفراء"ە، کە زانایەکی ئوسوڵی حەنبەلییە.

[3] ئیسلامناسی، ل٥.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەم بۆچوونەی "شوان. ع" لە چەند ڕوویەوەکەوە "نەزانین"و "ئارەزووبازی" تێدایە لەوانە "ئاین مرۆڤەکان ناچاری چۆکدادان و ملکەچی ئەکات بۆ هێزێکی نادیارو ڕەها".

ڕاستە ئاینی ئیسلام مرۆڤ فێری "تەسلیمبوون" بە خواو بە شەریعەتەکەی ئەکات بەڵام نەك کوێرانە بەڵکو لەسەرچاو ڕۆشنی، ئیسلام دێت سەرەتا باسی بوونی خوا ئەکات کە زاتێکی "واجب الوجود"ە[1]، چونکە هەڵناگرێ خوانەبێت لەولاشەوە "موستەحیل" نییە خوا هەبێت، کەواتە کە بوونی خوا مەحاڵ نەبێت و نەبوونیشی مەحاڵ بێت ئەوە ئەکەوێتە جۆرێ "واجب الوجود"ەوە.

پاشان ئیسلام ئەوەش ئەسەلمێنێ کە خوا دارای هەموو سیفەتێکی جوان و پڕ کەماڵە ناکرێ زیندوو نەبێت، دانا نەبێت، بەتوانا نەبێت، نەبینێ و نەبیسێ و نەتوانێ قسە بکات.. هتد، چونکە ئەوانە هەمووی نوقسانین و نابێ خوا خوایەکی نوقسان بێت، کەواتە ئەو خوایە (زانایە بە هەموو شتێ)، (بەتوانایە) بۆ کردنی هەموو شتێ، ئەبینێ و ئەبیسێ، دروستکراوەکانی خۆی ئەدوێنێ و داوای هەرچی لێ بکرێ ئەتوانێ بیکات بۆ بەندەکانی، نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئەو خوایە ڕێنمایی و بەرچاوو ڕوونی و بەرنامەیەکی ناردووە بۆ ئەم مرۆڤەو ئەو مرۆڤەش لەسەریەتی پێڕەوی لەو بەرنامەیە بکات، هەرکەس بیکات خوا خۆشی دەوێ، هەرکەس نەیکات خوا لێی عادز ئەبێت و لێی ئەپرسێتەوەو سزای ئەدات.. ئەو بەرنامەیەش هەروەك خاوەنەکەی کە خوایە کامڵەو نوقسانی تێدا نییە (لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ) (فصلت: ٤٢).

جا باشە ملکەچبوون بۆ خوایەکی داناو زاناو بە توانا بەڵگەیە بۆ خۆڵەدەستدان یان بەڵگەیە بۆ دۆزینەوە؟ ئایا ئەگەر قوتابییەك ملکەچ بێت بۆ مامۆستاکەی یان پەیمانکارو کرێکار بۆ ئەندازیارەکەیان و ناشەرەزا لە هەر بوارێکدا بۆ خەڵکی شارەزا لەو بوارەدا لای تۆ جێگەی ڕەخنەیە، ئەی کەواتە ڕێکخستن و سستمەکانی بەڕێوەبەردن چ نرخێکیان هەیە لای تۆ؟ عەبدێك کە خوا دروستی کردبێت و ئاگاداری هەموو بەرژەوەندییەکانی بێت بەو پێیە بەرنامەی تەواوو گونجاوی بۆ دابنێ ئایا شێتی نییە بۆ ئەو عەبدە یاخی بێت لە خواو بەرنامەی خوا؟!

خوایەك بفەرموێت (أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ) هۆشیار بن! دروستکردنی تەواوی دروستکراوەکان کاری خوایە بە تەنیاو فەرمانکردن بەسەریشیاندا هەرهی خوایە بە تەنیا[2].

کەچی عەبدێکی وەك (شوان. ع)ی لێ ڕاست ببێتەوەو بڵێ ئەسلیمی خواو دینی خوا مەبن و وەرن تەسلیمی من و عەقڵی من یان عەقڵی خۆتان بن، ئایا ئەمە کامیان نادروست و نا عاقڵانەیە؟

لەلاییەکی تریشەوە مرۆڤ هەر ئەبێت تەسلیم بە هەندی شتی نەگۆڕ هەیە ببێت، کە عەقڵ لێ بوەتەوە لێیان و دانی بە "نەگۆڕ"یاندا ناوە لەوانە:

. عەقڵ موناقەشەی بوونی شتێك ناکات کە بوونی "مەحاڵ" بێت، هەروەك موناقەشەی نەبوونی شتێك ناکات کە بوونی "واجب" بێت، بۆ نموونە عەقڵ ناتوانێ قەبووڵی خوایەکی نوقسان و نەزان و بێ دەسەڵات بکات و بە دروستکەری ژیان مرۆڤو بوونەوەریشی بزانێ کە مرۆڤ لە ئەو بەدەسەڵات ترو زاناتر بێ!

[1] عەقڵ و فەلسەفەش، هەموو "بوون" ئەکەنە سێجۆر: جۆرێکیان بوون و نەبوون هەڵدەگرێ جۆێکیان نەبوون هەڵناگرێ، جۆرێکیان بوون هەڵناگرێ، بە یەکەمیان ئەوترێت "مومکن الوجود"، بە دووەمیان ئەوترێ "واجب الوجود"، بە سێهەمیشیان ئەوترێ "مستحيل الوجود".

[2] (لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ) لە زمانی عەرەبیدا پێی ئەوترێت (له الخلق) و (له الأمر) کە (مبتدأ خبر) بەڵام لە هەردووکیاندا (خبر)ەکە پێشکەوتووە کە بنەما وایە لە زمانی عەرەبیدا (مبتدأ) پێش (خبر) بکەوێت، جا ئەگەر لە حاڵێکدا ئەم بنەمایە پێچەوانە بوویەوە ئەوە ئەوترێ (لأفادة الحصر) بۆ ئەوەیە ئەو ئیشە لەو کەسەدا تەنیا حەسر بکات واتە دروستکردن و فەرمانکردن بەسەر دروستکراوەکاندا کاری خوایەو بەس، کەس نەئەتوانێ شت دروست بکات نە مافی ئەوەشی هەیە فەرمان بکات بەسەریاندا.

بەڵكو عەقڵ بڕیاری كۆتایی لەوەدا داوە كە خوا ئەبێت لە مرۆڤ زاناترو بەتواناترو كامڵتر بێت، نەك ئەوە بەڵكو ئەبێ ئەو خوایە سنور نەبێت بۆ "دەسەڵات"و "زانست"و تەنانەت "زاتی پیرۆزیشی"[1].

. عەقڵ لەوە بۆتەوە كە "گشتی شتێك" گەورەترە لە "بەشی شتێك" یان "نەبوون بوونی لێ نایەت" وە هەروەها . عەقڵ لەوە بۆتەوە كە (نەبوون)، (بوونی) لێوە نایەت، نابێت نەبوون بناغە بێت بۆ (بوون).

. عەقڵ كۆتایی بەوە هێناوە كە (دینداری) غەریزەیەكی ڕیشەدارە لە مرۆڤدا، ڕەوشت شتێكی پێویستە بۆ مرۆڤو بۆ كۆمەڵیش، مرۆڤ بەبێ یاسا وەك ئاژەڵی لێ دێتو بەهێز بێهێز دەخواتو بێكەس كەسدار خوێنی ئەمژێو خاوەن پارە هەژار ئەكاتە كۆیلەی خۆیو هەروەها، كەواتە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕێناكەوێ عەقڵ بێتو سەرلەنوێ موناقەشەی شتە نەگۆڕەكان بكات، بۆ نمونە بڵێ: ڕەوشت پێویست نییە بۆ مرۆڤ، یان بڵێ درۆكردن شتێكی باشەو ڕاستگۆیی شتێكی خراپە، یان بڵێ: بەشی شتێك لە گشتی شتێك گەورەترە، یان بڵێ: مرۆڤ خوای دروست كردووە نەك خوا مرۆڤی دروست كردبێت.

بۆ زانیاری زیاتری (شوان. ع)و خوێنەرانی بەڕێزیش شتی نەگۆڕ وەك چۆن لە دیندا هەیەو موناقەشە هەڵناگرێ هەرواش شتی نەگۆڕ لە "عەقڵ"و لە "ژیان"یشدا هەیەو نابێ موناقەشە بكرێ، چونكە پێچەوانەكانیان دەگمەنو مەحاڵن ئەمە لەلایەك، لەلایەكی تریشەوە ئەگەر (شتە نەگۆڕەكان) یەكسان بكرێت بە شتە گۆڕاوەكان ئەوە (سەفسەطە) ڕوو ئەداتو عەقڵ لێی ئەقەومێتو ڕاستو ناڕاست تێكەڵ ئەبێتو ئەوەی هەقی تۆیە ناهەقە لای ئەوی ترو ئەوەی ناهەقە لای تۆ هەقە لای منو بەو شێوەیە.. ئەمە بوو وای لە یەكێكی وەكو (سقراط) كرد كە بزافێكی ڕیفۆرم دژ بە (سۆفستائیەكان)ی (ئەسینا) بەرپا بكاتو زانشتی (منطق) دابنێو بیسەلمینێ كە ئەبێت (عەقڵ) موناقەشەی (نەگۆڕەكان) نەكاتو ئەوەی كە عەقڵ لێی ئەبێتەوە لە سەلماندنی جارێكی تر نەخرێتەوە ناو (گۆڕاوەكان)، ئەگینا مرۆڤو عەقڵ ئەبنە گاڵتەجاڕ، هەموو كەس بۆی هەیە سووكایەتی بە مافو شتە پرۆزەكانی بەرانبەركەی بكاتو ژیان یان مانای نامێنێ..

(شوان. ع) ئەم بوختانە گەورە بەدەم دینەوە ئەكاتو ئەڵێ: "گەورەترین گوناهو تاوانیش لای ئاینەكان ئەوكاتەیە كە مرۆڤ بەئاگادێتەوە"[2].

بە پێچەوانەوە گەورەترین تاوان لای ئیسلام "غەفڵەتو بێ ئاگاییە"، خوای گەورە ئەفەرموێت (فَمَا لِهَـؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا)، یان ئەفەرموێت (فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ) هەروەها ئەفەرموێت (افلا تعقلون).. (ئەوە ئەو خەڵكە چیانە خەریكە لە هیچ تێ نەگەن)، (پەندو عیبرەت وەرگرن ئەی جەوهەردارەكان). (ئەرێ ئەو باسانە نادەنەبەر عەقڵ؟!).

زانایانی ئیسلامی ئەڵێن ئیمانو باوەڕ سێ جۆرە:

١. باوەڕی چاولێكەری (ایمان تقلیدي).

٢. باوەڕی بەڵگەدار (ایمان استدلالي).

٣. باوەڕی ئیشراقی یان ئیمانی شهودی.

لە ئیسلامدا لە كەس قەبووڵ ناكرێت، بە كوێرانەو چاولێكەری دوای دین بكەوێت، بەڵكو داوای لێ ئەكرێت بە بەڵگەوە خواناسیو عیبادەت بكات، مەولەوی لە (عەقیدەی مەرضیە)كەیدا جوان ئەفەرموێ:

(وما خلقت) هەس لە قورئانا

دەفەرمویت لە خلق جنو ئینسانا

---

[1] سەیری كتێبی (قصة الایمان)ی نەدیم جسر، بكە بۆ سەلماندنی هەموو ئەمانە لە ژێر ڕۆشنایی تیۆرە زانستیو فەلسەفییەكاندا.

[2] ل ٥.

حیکمەت عیبادەت (خالق الخلق)ە
ئەویچ بێ ئیمان هەبای موتڵەقە
بەڵ ئەر نەناسیە ناوێ عیبادەت
بەڵ طردە لە فەیض فەوزو سەعادەت
لەکەی موونافات (لکي أعرف) چوو
دەسەمل لەگەڵ "لیعبدون" بوو.

مەولەوی ئەڵێ: "خوا لە قورئاندا ئەفەرموێ: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)، واتە: من جنۆکەو مرۆڤم بۆیە دروست کردووە تا بمپەرستن"، لە فەرموودەیەکی قودسیشدا ئەفەرموێ: (خلقت الخلق لكي اعرف)، واتە: بۆیە دروستم کردوون بمناسن، جا مەولەوی ئەفەرموێ ئەگەر ڕووکەش سەیری ئەم دوو فەرموودەیە بکەی (موونافات)و جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا بەلاّم ڕاستییەکەی ئەوەیە "عیبادەت" بەبێ "ناسین" تۆزی بەربایەو نرخی نییەو خاوەنەکەی نە (فیض) و نە سەرکەوتن و نە کامەرانی دەست ناکەوێت، بۆیە مرۆڤ سەرەتا ئەبێ خوای خۆی بناسێ و زانیاری پەیدا بکات پێی پاشان عیبادەتی بکات، بەو شێوەیە "لەکە"ی موونافات و جیاوازی لە نێوان ئایەتەکەو فەرموودەکەدا نامێنێ و ئەو ئەبێتە بناغە بۆ ئەم و دەست لەمل یەکتری دەکەن!!.

خوای گەورە لۆمەی ئەوانە ئەکات کە ئەڵێن: (إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّهْتَدُون)، ئێمە باوو باپیرانمان لەسەر چی بوون ئێمەیش هەر چاو لەوان ئەکەین، بەڵکو خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)، ئێمە یان ئێوە یەکێکمان لەسەر چاوڕۆشنی و هیدایەتین و ئەوی ترمان لای داوەو چووەتە ناو گومڕای ئاشکراوە".. جیاوازی ئەو دوانەش تەنها بەڵگەیە، کێ بەڵگەی بە دەستەوە بوو ئەوە لەسەر هیدایەتەو کێ بەڵگەی نەبوو ئەوە گومڕاو سەر لێشێواوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەم بوختانەی (شوان. ع) لە هەموو ڕوویەکەوە ناجۆرە لەگەڵ ئیسلامدا: لە ڕووی دەقە ئیسلامییەکانەوە، لە ڕووی مێژووی ئیسلامەوە لە ڕووی واقعی ئێستای موسڵمانانەوە.

**لە ڕووی دەقە ئیسلامییەکانەوە:**

لە قورئاندا هەمیشە مەدحی (زانا)و (زانیاری)و (بەڵگە)و (بۆچوونی بەڵگەدار) کراوەو (بیرکردنەوە)و (موناقەشەی زانستی لە بلاّوکردنەوەی زانیاری و نەشارەدنەوەی) کراوەو بە پێچەوانەشەوە هەمیشە لۆمەی (نەفام)و (نەفامی)و (چاولێکەر)و (قسەی بێ بەڵگە)و (دوای ئارەزوو کەوتن)و (کەللە شەقی) کراوە.. بۆنموونە سەیری ئەم ئایەتانە بکە:

. (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء)، واتە: تەنیا زانایان بە ڕاستی لەخوا ئەترسن.

. (يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ)، خوا هەموو ئەوانەی کە باوەڕدارن و زانیارییان پێدراوە لە ناوتاندا بەرز دەکاتەوە.

. (وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ)، ئەوانەی کە زانیارییان پێدرابوو ئەیانوت: ڕەنجەڕۆبن هەر پاداشتی خوا باشترە.

. (قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي)، بڵێ: ئەمە ڕێگەی منەو خەڵکی لەسەر چاوڕۆشنی بانگ ئەکەم بۆ لای خوا، ئەمە ئەرکی منەو ئەرکی هەموو ئەوانەشە دوای من ئەکەون.

. (قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ)، بڵێ: دەی بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست ئەکەن. (وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ)، پێغەمبەران لە سەریانە بە ڕوونی ئاین بگەیەنن بە خەڵکی. (الْبَلَاغُ الْمُبِينُ) ئەوەیە بەڵگەی هەبێت.

. (قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُرَادَى ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم). (لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (لِقَوْمٍ يَعْلَمُون).

. (وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ). (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ).

. (إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُوراً)، (الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ) .

هەروەها پێچەوانەکانیشی دەیان ئایەتیان لەسەر هاتووە وەك: لە حەزرەتی عەلیان پرسی (ڕەزای خوای لیٚ بێت) عاقڵ کێیە؟ فەرمووی: "ئەو کەسەیە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا دائەنێت"، وتیان ئەی بیٚ عەقڵ کێیە؟ فەرموویەتی: "دەی ئەویشم وت!"[1]. بۆیە هەر ئەو ئایەتانەش بۆ پێچەوانەکانیان ئەشێت، نەك هەر ئەمانە بەڵکو زانایانی ئیسلامی ئەفەرموون: "ئایەتەکانی قورئان زیاتر لە (٦) هەزار ئایەتن، تەنیا (٥٠٠) ئایەتیان باسی عیبادەتکردن‌و نوێژو ڕۆژو زەکات دەکەن‌و نیوەی ئەوەشیان باسی تەشریع‌و فقە دەکات، نزیکەی(٤) هەزار ئایەتی باسی (فکر)و (عەقڵ)و بەکار هێنانیان ئەکات بۆ دەرخستنی یاساکانی خوای گەورە لەم بوونەوەرەدا"[2].

زیاد لەمەی سەرەوەش سەیری قورئان بکە ئەو هەمووە بەکارهێنانەی بۆ وشەی (علم)و لێوە وەرگیراوەکانی بەکاری هێناوە کە ئەکاتە نزیکەی (٨٠٠) جار[3].

## لە ڕووی مێژووی ئیسلامەوە:

لە مێژووی ئیسلامیداو دروست لەو کاتەدا (ئەوروپا لە تاریکایی سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەژیا دونیای ئیسلامی ئەو کاتە لە چەرخی زێڕیندا ئەژیاو هەموو زانستە دینی‌و مرۆڤییەکان گەشتبوونە چلەپۆپەیان[4])و ئەو کاتە زانستەکانی (فەلسەفە)، (طب) (هەندەسە)، (کیمیا)، (کۆمەڵناسی) چ وەك نووسین‌و کتێب‌و چ وەك جێبەجێکردنی لەبرەوی بەردەوامدا بوون.

نکولی لەوە ناکرێت کە زانستی ئەزموونی (العلوم التجريبية) بۆیەکەمجار موسڵمانان دایان هێنا، تەنانەت زانستە مرۆییەکان‌و زانستە ئاینییەکانیشیان لە تەرازووی ئەم زانستەدا ئەکێشاو ئەوەی قورسایی پێویستی نەبوایە ئەدرایەوە بەسەر خاوەنەکەیدا.

مەگەر زانستی (فەرموودەناسی) لقێك نییە لە زانستی ئەزموونی، لێکۆڵینەوە لە (سند)و (متن)چ ڕیوایەتی مێژووی بێت، چ ڕیوایەتی فەرموودەیی بێت ئەمە ناسەلمێنیٚ، نەك ئەمانە بەڵکو صەحابەی پێغەمبەر ﷺ تەنانەت قورئانیشان ملکەچ نەکرد بۆ ئەم زانستە.. ئیمامی بوخاری ئەفەرمویٚ ئەبوبەکر بە (زیدی کوڕی ثابت)و (عومەری کوڕی خەتتابی) وت: لە مزگەوت دابنیشن‌و دەست بەقورئان نووسینەوە بکەن، هەرکەس دوو شاهیدی هەبوو ئەوە ئەو قورئانەی لایەتی لێی وەربگرن، ئیبن حەجەری عەسقەلانی ئەفەرمویٚ: مەبەست بە دوو شایەت ئەوەیە (یەکیٚ لەبەری بێت)و ( یەکێکیش نووسیبێتیی)[5]. جا هەرکەس ئایەتێکی وتبیٚ کە کەس لەبەری نەبووبیٚ، یان کەس بە نووسراوی لای نەبووبێت ئەوە وەرنەگیراوە، تەنانەت لەسەریەك (واو) لە ئایەتێکدا کە صەحابەیەك لە ئایەتەکەدا ئەیخوێندو لە نووسینەکەدا ئەو (واو)ە نەبوو، بڕیاردرا ئەو (واو)ە لە کۆنگرەیەکی ساڵانەی (حەج)دا، یەکلا بکرێتەوە کە موسڵمانانی هەموو وڵاتان ئەو ساڵە ڕوو لە (حەج) ئەکەن، پرسیار لە هەمووی ئەکریٚ تا بزانریٚ ئایەتەکە (واو)ەکەی تێدایە یان نا، ئەوەبوو ئامادەبووانی (حەج)ی ئەو ساڵە هەموو ئایەتەکەیان بە (واو)ەکەوە لەبەر کردبوو بۆیە لە (مصحف)ەکەدا بە (واو)ەکەوە نووسیان، ئایەتەکەش ئەمەیەکە کە ئەفەرمویٚ: (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) (التوبة: ١٠٠). (واو)ەکە بریتییە لە (واو)ی پێش (الذين اتبعوهم)[6].

---

[1] نهج البلاغة ص٦٧٧ برگەی (٢٣٧).

[2] الدعاة والدعوة الاسلامية المعاصرة/ محمد حسن الحمصي (٤٥٦/١).

[3] بۆ نموونە سەیری (مفردات القران) مح- محمد حسن الحمصی بکە . الباب الرابع العلوم والفنون ص ٢٦٨.

[4] جواهر لالنەهرۆ/ لمحات من تأريخ العالم ص٣٥/ پەراوێزی (قالوا عن الاسلام)، د. عمادالدين خليل ص٣٩٩ .

[5] دەوڵەتی خیلافەت بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت، وەڵامێك بۆ کۆمەڵگا لە سایەی خەلافەتدای فوئاد مەجید میصری.

[6] حتى لاتخطئ فهم القران/ محمود غريب ص٢٥.

بەم عەقڵیەتەوەبوو کە موسڵمانان لە مێژوودا توانیان ئەو هەمووە خزمەتە بە بەرەی مرۆڤایەتی بکەن بەڕادەیەك بەویژدانەکانی ئەورووپا شایەتی گەورەیی فەزڵ بدەن بۆ موسڵمانانو لە دڵەوە خۆزگە بخوازن ئەوانیشە لە موسڵمانان بونایە[1].

## لە ڕووی واقعی ئێستای موسڵمانانیشەوە:

بوختانەکەی (شوان. ع) زۆر بێ بەرگو ڕووتەڵەیە.

. موسڵمانان ئەو هەموو لێکۆڵینەوەو دیراسە زۆرەیان نووسیوە لەسەر "گفتوگۆ"و "زانستو زانیاری"و "تازەگەری"و "دەوڵەتو قانون"و.. هتد. ئەگەر بڕوایان بە (عەقڵ)و (بێداری) نەبێت ئەوشتانە ئەنووسن؟

. ئەو هەموو پیاوە خوێنەوارو خاوەن شەهادەیەی لە دەوری ئیسلام کۆبوونەتەوە بەڵگەی ئەوە نییە کە (شوان. ع) بوختان ئەکات ئەڵێ: "گەورەترین گوناهو تاوان لای ئاین ئەو کاتەیە کە مرۆڤەکان بە ئاگابێنەوە".

. لە کۆمەڵگە بچووکەکەی کوردەواری خۆشماندا، مەگەر لە چینی قوتابیانو ڕۆشنبیراندا ئەوەی تەڕاییەکی تێدا بێت بەچاوی ڕێزەوە سەیری ئیسلام ناکاتو پێڕەوی لێ بکات بە پێچەوانەشەوە ئەوەی دوری گرتبێت لەم دینە هەر خەریکی کۆلانگەریو چاوباشقەڵیو مەشروب خواردنەوەو کاری نابەجێ کردن نییە؟ئیتر کامە بێداریو کامە بێئاگایی؟ کێ بێدارەو کێ بێئاگایە؟[*].

. دیسان (شوان. ع) دوور لە ویژدانەوە ئەڵێ: "ئاینی ئیسلام لەبەردەم دەسەڵاتی سیاسیی جیهانیشدا تووشی شکست بووەو ناتوانێت ببێتە وەڵام بۆ ئەو قەیرانانەی کە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی پێوەی دەناڵێنێت"[2].

هۆکەشی ئەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی گوایە ئیسلام دژی ڕەوتی بەرەو پێشچوونی جیهانە[3].

لەم دەقەدا چەند بێویژدانی تێدایە:

١. ئەو ئەڵێ: ئیسلام تووشی شکست بووە نەك موسڵمانان، چونکە ئەگەر ئەمیانی بوتایە تاڕادەیەك قسەکەی واقعی هەبوو.

٢. ئەڵێ: ئیسلام ناتوانێ وەڵامی ئەم هەمووە قەیرانەی ئەمڕۆ بداتەوە.

٣. ئەڵێ: ئیسلام دژی پێشکەوتنە.

بۆ وەڵامی ئەم بێویژدانیانە با چەند شتێ بڵێین:

یەکەم: ئیسلام زیاتر لە هەزارو چوارسەد ساڵە لە ناو کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکاندا هەر بەزیندوویی ماوەو تا ئێستاش دەقەکانی (قورئان)و (فەرموودە) جێگەی سەرنجو سەرسامی خوێندەوارو پیاوانی خاوەن عەقڵەو بەردەوام دیراسەو لێکۆڵینەوەی زانستی ئەکرێت لەسەر ئیعجازی (قورئان)و (هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ)[4].

---

[1] السنة ومكانتها في التشريع الاسلام/ د. مصطفي السباعي، ص ١٠/ المقدمة.

[*] لە کاتی ئەم نووسینەدا لە کەناڵی (الجزيرة مباشر)دا چاوپێکەوتنێك لەگەڵ (د. عبدالمجيد الزنداني)دا کراو ناوبراو کە زانایەکی ئیسلامیو شەرعزانو ڕیشدارە ئەوەی ڕاگەیاند کە دەرمانی نەخۆشی کوشندەی (ئایدز)ی دۆزیوەتەوەو ئێستا کۆمپانیاکانی دەرمان دروستکردن لە ئەمریکاو ئەورووپادا، دانوستانی لەگەڵ دەکەن بۆ کڕینی (براءة الاختراع)ەکەی.

[2] ئیسلامناسی ل(٦).

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[4] "مەریەم نور" ئافرەتێکی بە تەمەنی مەسیحییە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی وردی بۆ هەندێ "ئایەت"و هەندێ "فەرموودە"ی پێغەمبەرﷺ گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە بە یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلامیی ئەتوانرێت چارەسەری گەورەترین نەخۆشییە "دەروونییی"و

دووهەم: ئیسلام وەك دەقەكانو وەك مەزهەبە فقهییەكان تا ئێستاش سەرچاوەیەكی گەورەی تەشریعە چ لە وڵاتە ئیسلامییەكاندا چ لە سەنتەرەكانی یاسادانانداـ. كۆنگرەی لاهای نێودەوڵەی تا ئێستا چەندجار لە ڕاسپاردەكانیدا ئەوەی ڕاگەیاندووە كە فقهی ئیسلامی دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە بۆ یاسادانان، چونكە ئازادی ئیجتیهادكردنی داناوەو ئەوەی ئەم مەزهەب نەیوتبێت ئەو مەزهەب باسی كردووە.

سێیەم: ئیسلامو فیكری ئیسلامیی تا ئێستاش گەورەترین سەرچاوەیە بۆ (مەعریفە) چ وەك لایەنە ڕۆحییەكەی چ وەك لایەنە فیكرییەكەی چ وەك لایەنە ڕەوشتییەكەی، بونی ئەو هەمووە نووسینو لێكۆڵینەوانەش لەسەر فیكری ئیسلامیی بەڵگەی زیندوێتی ئیسلامە نەك شكست خواردوێتیی. وتمان ئەگەر بیوتایە "موسڵمانان تووشی شكست بوون" تاڕاددەیەك قسەكەی عەقڵ ئەیگرێت، هەرچەندە موسڵمانانیش سوپاس بۆ خوا هەر ڕوو لە خێرن و خێریش هەرگیز لە "ئوممەتی ئیسلامیی" نابڕێتو ئەوەتا لە وڵاتەكانی خۆیاندا بوونەتە هێزی نەیارو وڵات بە وڵات هەر بە كەناڵە ڕەسمییەكان شكست بە عەلمانییەتو بیرە تەسكەكانی ناسیونالیزمی دەهێنین وەك توركیا، فەلەستین، میصرو تەنانەت عێراقیش..

بۆ ئەو لەتەی تری بوختانەكەی كە ئەڵێ: "ئیسلام ناتوانێ وەڵامی قەیرەكانەكانی ئەم سەردەمە بداتەوە"، ئەڵێین قەیرانەكانی ئەم سەردەمە ئەكرێ چڕ بكرێنەوە لە پێنج بابەتدا:

١. قەیرانە ئاینییەكان.

٢. قەیرانە سیاسییەكان.

٣. قەیرانە ئابوورییەكان.

٤. قەیرانە كۆمەڵایەتییەكان.

٥. قەیرانەكانی خوێندن.

قەیرانە ئایینییەكان كە لەوەدا ئەبینرێ خەڵك لێی شێواوەو نازانێ كام دینو بەهاكانی كام دین هەقنو شایانی ئەوەیە بیسەلمێنێو پەیڕەوی لێ بكات.

قەیرانە سیاسییەكانیش لەوەدا دەرئەكەوێ كە كۆمەڵێكی زۆر ڕژێمی دنیا خۆرو دیكتاتۆر بوونەتە بار بەسەر كۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە.

قەیرانە ئابووری‌یەكانیش زەقترین قەیرانی ئەم سەردەمەن كە كۆمەڵێكی زۆر لە خەڵكی ولاتان نان نییە بیخۆنو كۆمەڵێكی تریان سەروەتیان لە سنووردا نییە.

قەیرانە كۆمەڵایەتییەكانیش لەم ڕۆژەدا لە زۆر شێوەدا بە دیاردەكەون كە ئاشكراترینیان ونبوونی ئافرەتانە لە ناو كۆمەڵگەداو لە گێژەنە دەرچوونی خێزانە، نەمانی ڕێزی گەورەو بچووكە، بێهێزبوونی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانی خزمو دەرو دراوسێو هاوشاریو هاووڵاتییە، زۆربوونی بەدرەڕوشتییە بەتایبەتی لە ناو گەنجاندا.

قەیرانەكانی خوێندنیش كە ئەمرۆ زیاترو زیاتر لەوەدا ئەبینرێ كە گرنگی بە (فێركردن) ئەدرێت نەك پەروەردە، عەلمانییەتی (علم) ئەسەلمێنرێت، دژایەتی دروست ئەكرێت لە نێوان (زانست)و (ئایین)دا نەك برایەتیی دروست بكرێت.

دەی كاكە (شوان. ع)! ئەگەر بە ویژدانەوەو بەبێ تەرەفانەو بڕیاری پێشوەخت لێكۆڵینەوەیەك بكەی دەربارەی یاساو ڕێساكانی ئیسلام بۆ وەڵامدانەوەی هەریەك لەو قەیرانانەن بڕوا دەكەم لەو سەرەوە بە دەستی بەتاڵ

---

"بەدەنی"ەكانی ئەم سەردەمە بكرێت، بۆ زانیاری زیاتر سەیری (الموسوعة العلمية لأعجاز القران الكريم والسنة المطهرة/يوسف الحاج أحمد) بكرێ.

نایەیتەوەو ئەگەیتە ئەو بڕوایەی کە ئیسلام تەواوی وەڵامەکانی داوەتەوە، بۆ هەریەکەش لەو وەڵامانە (عەقڵ)و (زانست)یش پیشان ئەگری هەرچی لەوە زیاتر بوترێ ڕاڤەو شەرحە بۆ ئەو بنەمانەن با بۆ نموونەش هەندێکیان باس بکەین:

## قەیرانە ئاینییەکان:

**ئیسلام ئەوکاتەش هات ئەم قەیرانە هەبوو..**

. عەرەبەکان هەموو یاسایەکی ئاییئی لایان ئەوەبوو کۆمەڵێك بتیان لە خۆیان کردبووە خواو ئەیانپەرستن و داوای هەموو پێویستییەکی خۆیانیان لیێ ئەکردن و خۆشیان ئەدایە پەنایان لە کاتی ترس لە شتە ترسناکەکاندا، تەنیا دیاردەیەکی دینی ئیبراهیمیش لەناویاندا مەسەلەی (حج) بوون کە ئەمەشیان کردبوویە هۆکاری خۆهەڵکێشان و جۆرەها لادانیشیان تێدا کردبوو لەوانە "تەواف"کردن بە ڕووتی و چەپڵەڕێزان لەکاتی تەوافکردندا.. هتد.

. هیندۆکییەکانیش کە دینی بنەڕەتییان بریتیی بوو لە "بەرهەمی" لە عەرەبەکان کەمتر خوای درۆیین نەبوو بەڵکو وەك مێژوونووسان دەڵێن: "ئاینی بوزا لەناو هیندو لەناو ئاسیای ناوەڕاستدا یەکپارچە بوو بوویە بتپەرستی، بەڕاددەیەك بۆ هەرشوێنێك بڕۆشتنایە پەیکەری خوایەکیان لەگەڵ خۆیاندا ئەبردو لە هەر شوێنێك لایان بدایە پەیکەرێکی بوزایان دائەچەقاندو لەبەری ئەپاڕانەوە"[1].

. یەهودییەتیش ئەو کاتە بریتی بوو لە چەند (طقوس)و باوێك کە گیان مانای تێیدا نەمابوو، هیچ کاریگەرییەکی لەسەر پەیڕەویکەرانی دروست نەئەکرد، نەك ئەوە بەڵکو وەك هەندێ لە مێژووبووسانی خۆشیان دانی پێدا ئەنێت، بتپەرستی کاریگەری لەسەر دینی یەهودی دروستکردبوو، لە (دائرة المعارف اليهودية)دا هاتووە: "عادزی و تووڕەیی پێغەمبەران لە بتپەرستی بەڵگەی ئەوەیە کە پەرستنی بت و خواکانی درۆیی چووەتە ناو دەروونی ئیسرائیلییەکانیشەوە، تا ئەوکاتەش کە ڕۆژانی دەرچوون و نەفی کردنیان لە "بابل"یشدا هەر تێیاندا ماوەتەوە، هەڵگری هەندێ بیروباوەڕی شریکی و ئەفسانەش بوون، تەنانەت (تلمود)یش ئەم شایەتییە ئەدات و ئەڵێ: "بت پەرستی = الوثنية" هێزێکی کەمەندکێشی سەیری تێدا بووە لەلای یەهودییەکان"[2].

. ئاینی مەسیحیش لەولاوە با بوەستێ کە تا ئەو کاتەش هەر موناقەشەی ئەوەیان بوو کە ئایا حەزرەتی مەسیح خۆی خوایە یان کوڕی خوایە؟ کار گەیشتە ئەوەی کە شەڕی خوێناوییان لەسەر ئەو باسانە لەگەڵ یەکتردا ئەکرد[3].

. ئاینی فارسیش هیچی لەم ئاینانە زیاتر نەبوو، بەڵکو هەر لە کۆنەوە لە ناو فارسدا (سروشت پەرستی) دیاردەیەکی گەورە بوو تێیاندا و لەبەر ئەوەی ئاگریان بەسەرچاوەی زۆرشت ئەزانی بە قەناعەتەوە پەنایان بۆ ئەبردو داوای پێویستییەکانی خۆیانیان لێ ئەکردو پەرستاگایان بۆ دروست ئەکرد لە هەموو شارو دێیەکداو (طقوس)ی زۆرو زەبەندیان بۆ ئەو پەرستگایانە دائەناو کە ئەهاتنە دەرەوەش هیچ جیاوازییەکیان نەبوو لەگەڵ کەسێکی بێ دیندا[4]. فارسەکان بە گشتی بڕوایان بە دوو خوا هەبوو "ئەهریمەن"و "یەزدان" ئەهریمەن" خوای خراپە بوو لایان، کە خراپەیەك ڕووی تێ بکردنایە پەنایان ئەبردە بەر ئەهریمەن و لێی ئەپاڕانەوە کە عەفویان بکات و ئەو بەڵاو قات و قڕییەیان لەسەر لاببات ئەگەر حەزیان لە خێرو بێریش بوایە پەنایان ئەبردە بەر "یەزدان"و لێی ئەپاڕانەوە کە شتێکیان بۆ بکات.

---

[1] السيرة النبوية/ الندوي ص٢٨.

[2] السيرة النبوية/ الندوي ص٢٠.

[3] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[4] السيرة النبوية/ الصلابي (١ـ ٢١).

. لەناو ڕۆمییەکانیشدا کە ئەوکاتە بەناوی "ئیمپارتۆریەتی بێزەنطی"یەوە حوکمی یۆنانو بەڵقانو ئاسیاو سوریاو فەلەستینو ناوچەی دەریای ناوەڕاستیان بە گشتیو میصرو هەموو ئەفریقایان ئەکردو پایتەختی ئیمپارتۆریەتەکەیان بریتیبوو لە شاری (قسطنطنیة)، کارێکیان بەسەر دینی مەسیحییەتدا هێنا، خۆزگە بە مرۆڤی "بێدین" ئەخورا، زوڵمو ستەمو دڵڕەقی تەنانەت لە یاریکردنو گەپو گاڵتەشیاندا هەر هەبوو، لە مەیدانی زۆرانبازیدا بۆ کەیف کردن ئاژەڵی دڕەندەیان بەر ئەدایە (ئەسیر)و بەندەکانو سەیریان دەکردن چۆن لەتو پەتیان ئەکردن، دیاردەی کۆیلەکردن تەواو زۆر بووبوو لە ناویانداو میللەتانی چواردەوریش چاویان لیێ دەکردن[1].

ئیسلام ئەوکات هاتو بینشێکی ئاینی "ڕوون"و "منطقي" دایە خەڵکی کە ئەکرێ لەم چەند خاڵەدا کورت و چڕیان بکەینەوە:

١. خوایەك هەیە کە ئەم بوونەوەرەو ژیانو مرۆڤە هەڵدەسوڕێنێ، ئەو خوایە یەکەو کەس لە خودو سیفەت و کارەکانیدا هاوشێوەی نییە، (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ* اللَّهُ الصَّمَدُ* لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ* وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ).

٢. موحەممەد بە بەڵگەو دەلیلەوە پێغەمبەری خوایە، ژیانو ڕەوشتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گەورەترین مرۆڤیشە بۆیە شایانی ئەوەیە کە شوێنی بکەوی، ئەوەی ئەو ئەیڵێت قسەو ئاڕاستەی خوایە بۆ مرۆڤەکانو پاڵپشتیشە بۆ هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی، هەرکەس شوێنی بکەوێ خوا لێی ڕازی ئەبێتو پاداشتی باشی ئەداتەوە، ئەوەشی شوێنی ناکەوێ خوا خۆشی ناوێتو لێی قەبووڵ ناکات، (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (آل عمران: ٣١).

٣. پاش مردن ژیان هەیە، هەرکەس لە ژیاندا ڕێز لە خواو قسەو بڕیارو کارەکانی خوا بگرێت لە پاش مردن ڕێزی لێ دەگیرێت، هەرکەس بێ ڕێزی بکات بەرانبەر خواو بڕیارو یاساکانی خوا ئەوە لەو دنیا ڕێزی لیێ ناگیرێت و بەڵکو سزای سەخت ئەدرێت. (ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى* قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعاً بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى* وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى* قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيراً* قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى* وَكَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى) (طه : ١٢٢ . ١٢٧)

٤. خوای گەورە وەك چۆن تاقانەیەو شەریكو هاوشێوەی نییە، زاتێکی پڕ کەماڵەو تواناى بێ سنوورەو عەبد داوای هەرچی لیێ بکات ئەتوانێ بۆی بکات، بۆیە پێویستە بۆ دەستخستنی هەموو خێرێك داوا هەر لە ئەو بکرێتو بۆ لابردنیو بەرگرتن لە هەموو خراپەو شەڕێکیش پەنا بۆ ئەو ببرێت.

(قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ* تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الَمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ) (آل عمران: ٢٦ . ٢٧).

٥. شوێنکەوتنی قسەو ڕێنماییەکانی خوا مایەی کامەرانیو ئاسوودەییە لە دونیاو ئاخیرەتداو کەسیش ناتوانی لە خوا باشتر بڵێو بڕیار بدات، هەرکەسیش شوێن دینی ڕاستەقینەی خوا کە بە (موحەممەد)دا ناردوویەتی بکەوێت لە دنیادا بە حورمەتەوە ئەژیو لە ئاخیرەتدا بە حورمەتەوە زیندوو ئەبێتەوە.

(وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ* وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ العَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ* أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى علَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ* أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ* أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ* بَلَى قَدْ جَاءتْكَ آيَاتِي فَكَذَّبْتَ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ) (الزمر : ٥٤ . ٥٩).

[1] بۆ زانیاری زیاتر سەیری کتێبی (السيرة النبوية) الصلابي/ بەرگی یەکەم لاپەڕەکانی (١، ١٦، ١٧، ١٨) بکە.

بگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆتان و خۆتانی تەسلیم بکەن، پێش ئەوەی سزای قیامەتتان بێتە سەر پاش ئەوە کەستان سەرکەوتوو نابێت، شوێنی باشترین بەرنامەیەك بکەون کە خوا بۆی ناردوونەتە خوارەوە پێش ئەوەی سزای قیامەتتان بێتە سەر لە کتوپڕێکدا لە کاتێکدا کە هەستتان لای خۆتان نامێنێ* ئەوکاتەی کە هەندێ کەس ئەڵێ: ئەی داخی گرانم بۆ ئەو هەمووە کەمتەرخەمییەی دەرهەق بە خوا کردم و لەگەڵ پێڕی گاڵتەجاڕاندا بووم و وەك ئەوان بووم، یان ئەڵێ: ئەگەر خوا هیدایەتی منیشی بدایە ئێستا منیش بەختەوەر ئەبووم و لەگەڵ خواناساندا ئەبووم* یان کاتێ کە سزای قیامەت بەچاوی خۆی ئەبینێ ئەڵێ: خۆزگە یەکجار ئەیانگێڕامەوە بۆ دونیا تا ئەبوومە پیاوێکی چاك* نەخێر، چەندینین ئایەتی خوات بۆ باسکرا کەچی تۆ بە درۆت ئەزانی و لووت بەرزیت ئەکردو خەریکی کوفرو بێدینی بوویت،

٥. دەرگای حیواری لەگەڵ هەموو دینەکانی تردا کردووەو بانگی کردن بۆ گفتوگۆیەکی عاقڵانەی زانستی، ئیتر دوای ئەوە هەموو کەس ئازادە موسڵمان ئەبێت یان هەر لەسەر دینی خۆی ئەمێنێتەوە، (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

ئێستاش ئەم سەلماندن و بنەما دینییانە مایەی ڕزگارکردنی عەقڵەکان لە (ئەفسانە)و لە (شیرکیات) کێش بڕوا ناکات با تاقی بکاتەوە.

## قەیرانە کۆمەڵایەتییەکان:

ئیسلام ئەوکاتەش کە هات ئەم قەیرانە هەر هەبوو.

. ئافرەت لای عەرەب و لای میللەتانی تریش دروستکراوێکی چارەنا پەزیرو پیس بوون، مایەی شوورەیی بوون باشترین مامەڵە لە گەڵیدا کرابێ ئەوەبووە تەنیا ویستوویانە ئارەزووبازی لەگەڵدا بکەن، لای عەرەب زیندەبەچاڵ کراوە، لای هیندییەکان کەمێردەکەی مردووە ئەمیشیان لەگەڵیدا سووتاندووە، وەك ماڵی میراتی پشك و بەش کراوە.

. هەمیشە دوو چین هەبووە لەناو میللەتانی ئەو سەردەمەدا "ئەشراف و گەورەکان" و "کۆیلەو خزمەتکارەکان"، "کۆیلە کردن" بۆ سادەترین هۆ کاری پێکراوە، قەرزار کە نەیبووبێ لە کاتی خۆیدا قەرزەکە بداتەوە یان خۆی یان منداڵی ئەکرا بە کۆیلە، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر یان وڵاتێکی تر خەڵك هێنراوەو کراوەتە کۆیلە، لە شەڕدا هەر ئەسیرێك گیرابێت کراوە بە کۆیلە، مامەڵەشیان لەگەڵیدا لەوپەڕی دڵڕەقی و نامرۆڤانەدا بووەو هیچ یاسایەکیان بۆ دانەنراوە.

. منداڵ ئاگای ئەوەی نەزانیوە ڕێز لە گەورە بگرێ، یان باوك و دایك وەك پێویست ڕێزیان نەبووە، کەس بە شیاوی نەزانیوە لە فلانە بنەماڵە نزیك بێتەوە یان ژنیان بداتێ یاخود هاتووچۆیان بکات.

. لەسەر داد بوبێ یان لەسەر زوڵم بووبێ پشتیوانی لەبنەماڵەو عەشیرەتی خۆی کردووەو لەو پێناوەشدا هەموو پێشێلکارییەکی ئەنجامداوە.

. هەموو جۆرە مارەکردنێك هەبووە، شیاوو نەشیاو، وەك حەزرەتی عائیشە ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: "لە جاهیلیەتدا چوار جۆر مارەکردن هەبوو، یەکێکیان بەوشێوەیی ئێستا کە هەیە پیاوێك ئەنێریتە خوازبێنی ئافرەتێك بۆ خۆی یان بۆ ناسیاوێکی و مارەی ئەکات و پاشان ئەیگوازێتەوە، مارەکردنێکی تر پیاوێك بە ژنەکەی ئەوت ئەگەر پاك بویتەوە بچۆ بۆ لای فلانەکەس لە (ئەشرافەکان) با منداڵێکی نەجیبمان ببێت! ئیتر پیاوەکەی نەئەچووە لای، واتە ئافرەتەکە (حاملە) ئەبوو لەو پیاوە شەریفە!! مارەکردنێکی تر ئەوەبوو کە کۆمەڵێك پیاو ئەچوونە لای ئافرەتێك کە لە (١٠) کەس کەمتر بوون ئافرەتەکە (حاملە) ئەبوو، کە منداڵەکەی دائەنا ئەینارد بەشوێن

ئەو پیاوانەداو ئەهاتن و ئافرەتەکەش ئەیوت: فلانەکەس ئەمە منالی تۆیەو فەرموو ناوی بنێ، ئیتر ئەبووە منالی ئەو.

مارەبڕینێکی تر ئەوەبوو کە ئافرەتی وا هەبوو بەیداخێکی بە مالەکەیدا ئەکردو هەموو پیاوێکی قەبوول ئەکرد بچێتە لای تا منالی ئەبوو، پاش ئەوەی منالی ئەبوو ئەینارد بە شوێن (قیافەت ناس)داو ئەیوت ئەم منالەی من لە کێ ئەکات، ئەو قیافەتناسەش بیدایە بەسەر هەرکامیاندا ئەبوو قبولی بکردایەو بیکردایە بە منالی خۆی.. بەلام کە خوا پێغەمبەری ﷺ نارد هەموو ئەوانەی هەلگرت و تەنیا مارەکردنە شیاوەکەی هێشتەوە"[1].

هەندی نیکاحی تریش هەبووە کە بێجگە لە حەزرەتی عائیشە باسیان کردووە وەك (نیکاحی موتعە)و (نیکاحی بەدەل) واتە پیاوێك بە پیاوێکی تری وتووە: ژنەکەی خۆتم بدەرێ ژنەکەی خۆم و ئەوەندەش باقیت ئەدەمەوە[2].

مەسەلەی (طلاق)یش با لەولاوە بووەستێ کە بەخراپترین شێوە ئەنجامیان داوەو کاریان پێکردووە.

. جارێك تەلاق ژمارەی هەر نەبووەو ژن نەیتوانیوە هەرگیز لە مێرد خۆی ڕزگار بکات، چەند ئەومێردەی دڕەندەو ناپیاو بووبێت.

. یان تەلاقێکی وای داوە کە نەیتوانیوە لەوەو دوا شوو بکاتەوەو سەری پێ سپی کردووە.

. شەڕو شۆڕو تالانی و دلڕەقی و بێبەزەیی سیمای دیاری پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی ئەو سەردەمە بووە ئەو کەسەی هەستی بە تۆزێك هێزو دەسەلات کردبێ خێرا پەنای بردووە بۆ چەوساندنەوەی خەلکەکەی تر کە لەو بێ هێزترن. شەڕ ئەوکاتانە هەمووی هەر بۆ تالانی و بڕۆ بووەو خاوەنی (پەیام)ێکی وانەبوون کەلە پێناویدا شەڕ بکەن.

. مەسەلە ڕەوشتییەکانیش با بووەستێ کە (عارەق خواردن)و (زیناکردن)و (قوماربازی)و (فرت و فێل)و دەرەچێ و لگاوکردن وەك خۆرە دابوویە هەموو کەسێکی ئەو کۆمەلگایە[3].

ئیسلام کە هات هەموو ئەو قەیرانانەی لەناوبردو لە جێگەیدا یاساو ڕێسای تازەی بەرژەوەندی ئامێزی دانا:

. هات ڕێزی تەواوی بۆ ئافرەت بڕیارداو فەرمووی: (خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ).

. بڕیاری دا بۆ ئافرەتان بە ڕێژەی ئەرکەکانیان مافیان بدرێتێ و فەرمووی: (وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ)، کە ئەو نمرەیەش بریتییە لە (مودیرییەت) لە دامەزراوەی مالدا.

. بڕیاریدا ئافرەت نەمایەی شورەییەو نە بێبەشە لە میرات و نە خۆشی مالی میراتییە، بەلکو فەرمووی: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (الروم: ٢١).

. ئیسلام هات یاسای (ئازادکردنی کۆیلە)ی داهێناو ڕێگەکانی ئازادکردنی کۆیلەی زۆرکرد[4].

. یاسایەکی وردی دانا بۆ چۆنییەتی مامەلەکردنی (منال) لەگەل دایك و باوکیدا، وەك ئەفەرموێت: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيما* وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً) (الإسراء: ٢٤).

---

[1] البخاري/ كتاب النكاح/ باب لانكاح الا بولي.

[2] فتح الباري (٩/ص١٥٠).

[3] السير النبوية (بەدەستکاریەکی کەمەوە) (الصلابی) (١/٣٧ ـ ٤٧).

[4] بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری کتێبی (دەولەتی خیلافەت بوژاندنەوەی کۆمەلگەو گەشەسەندنی شارستانییەت، ل ٢٣٥ تا ٢٤٦) بکە.

. ئیسلام بنەمای خۆهەڵکێشان بە باووباپیرانەوەی هەڵگرت و مەبدەئی (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)ی داهێناو پێغەمبەریش ﷺ بە عەمەلی کچی ئەشرافی مەککەی مارەکرد لە کۆیلەیەکی نادیاری ناو کۆمەڵگەکەی ئەوسای خۆی.

. ئیسلام یاساو ڕێسایەکی وردی بۆ "مارەکردن" و تەڵاق دان و (دایەنی کردن)و (میراتی بردن)و.. هتد، دانا کە بە هەموو شێوەیەك (حورمەت)و مافی دایك و منداڵی تێدا پارێزراوە.

. ئیسلام پەیوەندییەکانی مرۆڤایەتی لەسەر بناغەی (تعارف) دانا وەك ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا)، زانایانی ئیسلام ئەفەرموون: ("تعارفوا" دوو مانای هەیەو یەکەمیان یەکترناسین و ئولفەت گرتن بەیەکەوە، دووهەمیان: چاکەکردن بەرانبەر یەکتری، واتە: (بۆ ئەوەکراونەتە میللەت میللەت و هۆزو هۆز تا یەکتر بناسن و چاکە بەرانبەر یەکتری بکەن).

. ئیسلام وەك چۆن یاسای بۆ ئاشتی داناوە ئاواش یاسای بۆ شەڕکردن داناوەو ئەفەرموێ: (وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِين)، یان ئەفەرموێ: (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ).

. تەنانەت پەیامی دانا بۆ شەڕکردن، شەڕ ئەبێت بۆ ئەوە بێت کە پەیامی پڕدادی ئیسلام بگەیەنرێتە مەزڵومان و پیاوانی بێکەسی دنیا، جا هەرکەس و دەسەڵاتدارێ قەبووڵی کرد باسی ئیسلام بۆ میللەتە ژێردەستەکانی بکرێ ئەوە بێ شەڕ بانگەوازەکەی پێ ئەگەیەنرێت و هەرکەسیش نەیەڵێ باسی ئیسلام بۆ میللەتەکەی بکرێ ئەوەیان ئەبێ (جزيه) بدات، یان ئەبێ باجی ئەو کەللە ڕەقییەی خۆی بدات و قاچی لەسەر ملی مەزڵومان لاببات، خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ).

. بۆ مەسەلە ڕەوشتییەکانیش ئیسلام بە چەپکێك ڕێساو یاسایەك لەدوایەکەکانی باڵەخانەی ڕەوشتی بەرز کردووەو ئەو کۆمەڵگەیەی ئەوکاتەی کردە نموونە لە ڕەوشتدا وای لێهات کە بەراوردکردن بوو بە شتێکی سەرسوڕهێنەر لە نێوان ئەو کەسانەدا کە ماوەیەك لە ئیسلامدا ئەژیان لەگەڵ ئەو ژیانەی کە دوور لە ئیسلامەوە گوزەراندبوویان..

پێشتر پیاوێکی بێڕەحم و ئێستا زۆر بەڕەحم، پێشتر پیاوێکی مەشروب خۆرو کەللە شەق، ئێستا پیاوێکی خۆش قسەو دەمپاك، پێشتر پیاوێکی ڕەزیل و چاوچنۆك، ئێستا پیاوێکی بەخشندەو هەژاردۆست.

دەی ئەم قەیرانانەی ئێستاش لەوانە ئاڵۆزتر نین.. ئیسلام چۆن توانی بە ماوەیەکی کەم ئەو قەیرانانە بنەبڕ بکات ئێستاش هەروا ئەتوانێ، مەگەر یەکێکی وەك (برناد شۆ) ناڵێ: "موحەممەد ئەتوانێ هەموو قەیرانەکانی ئەمڕۆکە مرۆڤایەتی پێوەی ئەناڵێنێ چارەسەر بکات ئاسانتر لەوەی کوپێك ئاو بخواتەوە"[1].

هەموو قەیرانە ئابووری و سیاسیی و پەروەردەییەکانیش هەر بەو شێوەیە ئیسلام یاساو ڕێسای تەواوی بۆ داناون و ئێرە جێگەی ئەو هەموو درێژکردنەوەیە نییە.

(شوان. ع) لە لەتێکی تری بوختانەکەیدا ئەڵێ: "ئیسلام دژی پێشکەوتنە"! ئەمەش بە هەزارو یەك بەڵگە وانییەو ناڕەوایە..

یەکەم: ئیسلام لە هیچ دەقێکی پیرۆزی (قورئان)و (فەرموودە)دا دژی پێشکەوتن نییە.

دووەم: مێژووی ئیسلامی پێشکەوتن سیماو شیعاری هەمیشەیی بووە.

---

[1] وتەی زانایان/ ئەحمەد کاکە مەحمود/ ل١٥.

* نەزان و نەدان/ بۆ نازان و نادان بەکار هێنراوە.

سێیەم: واقیعی ئەمڕۆی موسڵمانانیش بوختانەکەی (شوان. ع) بەدرۆ دەخاتەوە، ئەڵام ئەمڕۆ کە هەلومەرجە سیاسسەکان هەموو دژ بە ئیسلامو موسڵمانان تەییار کراون، کەی گوناهی ئیسلامە یان کەی گوناهی ئیسلامە ئەگەر موسڵمانان نەزانو نەدان بن* بەڕاستی (مەعروف عەبدولغەنی ئەلرصافی جوان ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| یقولون في الاسلام ظلما | بأنه یصد ذویه عن طریق التقدم |
| فان کان ذا حقا فکیف | تقدمت اوائله في عصرها المتقدم |
| ان کان ذنب المسلم الیوم جهله | فماذا علی الاسلام من جهل مسلم |
| هل العلم في الاسلام الا فریضة | وهل امة سادت بغیر التعلَم |
| لقد ایقظ الاسلام للمجد والعلا | بصائر اقوام عن المجد نوم |
| وعما قلیل طبق الارض حکمهم | باسرع من رفع الیدین الی الفم[1]. |

جا کاکە شوان! تۆ بۆ ئەوەندە بێویژدانی بە خەرج ئەدەیو تەڕو وشك پێکەوە ئەسووتێنی، ئەی تۆ بڵێ ئیسلام خۆی پاکەو چاکەو بەکەڵکە، بەڵام هەڵگرانی ئەمەو ئەوەن، وەك (لیو ڤۆلدڤایس) بکە کە پاش ئەوەی دیراسەیەکی وردی ئیسلامیی کرد، بڕیاریدا بێتە جیهانی ئیسلامی تا بە چاوی خۆی ئەو دنیا پڕ لە کامەرانییە ببینێ، کە یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلام دروستی دەکات، بەڵام کە هاتە (کویت)و حکومەتو میللەتی کوەیتی بینی تووشی (خورپە) بوو، ئەوەبوو ئەو قسە بەناوبانگەی کردو وتی: "المسلمون في واد والاسلام في واد آخر"بەڵام ئەمەش وای لێ نەکرد بەرانبەر بە ئیسلام ڕەشبین بێت، بەڵکو بڕیاریدا ناوی خۆی بگۆڕی لە (لیۆڤۆڵدڤایس)ەوە بۆ (موحەممەد ئەسەد)و دەست بکاتە نووسینی کتێب لەسەر حەقیقەتی ئیسلامو یەکەم کتێبی بەناوی (الاسلام علی مفترق الطرق) نووسیو ئەوەی ڕوونکردەوە کە ئیسلام خۆی دینێکی زۆر پاكو بەڕێزو گەورەیەو شایەنی ئەوەیە کە پەیڕەوی لێ بکرێو کێ جێبەجێی بکات کامەرانیو ڕێزی دەست دەکەوێت، کێش لێی دوور بکەوێتەوە تووشی قەیرانو نەهامەتی ئەبێ.

(شوان. ع) حوکمێکی تری ناڕەوا ئەدات کە گوایە (علی میر فطروس) بە بەڵگەی مێژوویی و بەراوردی زانستیانە توانیویەتی بیسەلمێنێ کە "ئاینی ئیسلامیش وەك هەموو ئاینەکانی تر زادەی هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتیو مێژووی دیاریکراوە"[2]!

واتە: ئیسلام دەستکردی خەڵکەو زادەی بیری پێغەمبەرو موسڵمانانە، دەی باشە ئەوەی سەرە واوێکی ئیسلام بزانی پێکەنینی بەم حوکمە (زانستییەی!!) (شوان. ع) نایەت؟

ئایا کەس ئەتوانێ وەك قورئان بڵێ؟ کافرانی قورەیش بە هەموو شێوەیەك قورئان تەحەددای ئەکردنو ئەیفەرموو: (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ* فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن[3] تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٣ ـ ٢٤).

---

[1] مانای گشتیی شیعرەکە واتە: ستەم ئەکەنو ئەڵێن ئیسلام هەڵگرانی خۆی لە ڕێگەی پێشکەوتن دوور ئەخاتەوە، ئەگەر ئەمە ڕاستە، ئەی بۆچی بەرەی یەکەمی ئەم ئیسلامە ئەو هەمووە پێشکەوتوونەی بە دەستهێنا، ئەگەر گوناهی موسڵمانی ئەمڕۆ ئەوەیە کە نەزانن، دەی ئیسلام گوناهی چییە؟! مەگەر لە ئیسلامدا (زانیاریو زانست) فەرز نەکراوە؟ یان ئایا هیچ میللەتێك بەبێ (زانیاری) پیشکەوتنی بەدەست هێناوە؟ ئەم ئیسلامە چاوی میللەتانێکی لە مێژوودا کردەوەو شکۆو سەربەرزی پێدان کە خەوتبوون زۆری نەبرد هەموو سەرزەوی دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی یاساکانی ئەوان، خێراتر لەوەی دەست بۆ دەم بەری.

[2] ئیسلامناسی/ ل ٦.

[3] زانایان ی (نحو) ئەڵێن: وشەی (لن) بۆ (تەئبیدە) واتە: هەتا هەتایە ناتوانن.

واتە: ئەگەر گومانتان لەم قورئانەدا هەیە کە ناردوومانە بۆ ئەم عەبدەی خۆمان، دەی سورەتێك وەك ئەم قورئانە بهێنن، هەرچیش شایەتیتان بۆ ئەدات بانگی بکەن جگە لەخوا* جا ئەگەر نەتانتوانیو هەرگیز ناشتوانن، دەی خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سوتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردەو سازو ئامادەکراوە بۆ کافران.

جا قورەیش کە زۆریان لا مەبەست بوو، ئەم قورئانە بە درۆ بخەنەوەو لە ڕاستیشدا ئەهلی ڕەوانبێژیو حیکمەتیش بوون، بە هەموو توانایانەوە نەیانتوانی بەربەرەکانێی ئەم قورئانە بکەنو تێکی بشکێنن، ناچار (شمشێر)یان لێ هەڵگرتو شەڕی سەربازییان بەرپا کرد لەگەڵیداو ویستیان بەو ڕێگەیە تێکی بشکێنن، ئیتر کاکە لە کوێوە هێناویەتی کە ئەم قورئانە دانراوی موحەممەد ﷺو خەڵکی ئەو سەردەمەیە؟!

زۆر شت هەیە ئەم درۆیە شاخدارتر ئەکات:

یەکەم: پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بووە، خەڵکە زۆر خوێندەوارەکە بە قورئانی نەوێراوەچ جای نەخوێندەوار!

دووەم: ئەو باسو خواسانەی کە قورئان لە خۆی گرتوون زۆر لە ئاستی پێغەمبەر ﷺ بەرزترن وەك:

. مەسەلە زانستییە ئاڵۆزەکانی (فەلەك)و (ڕووەك)و (دەریاکان)و (ناو ڕەحمی ئافرەتان).. هتد.

. مەسەلە غەیبیو نادیارەکانی (ئاسمانەکان)و (چینەکانی زەوی)و (قیامەت)و (بەهەشت)و (جەهەننەم)و جیهانی(فریشتە)و (پەری).. هتد.

. مەسەلە یاساییەکانی (حکم)و (ئیدارە)و (ئابووری)و (سیاسەت)و (یاسا وردەکانی باری تاکەکەسی)و.. هتد.

. مەسەلەی ئیعجازی زانستیو ژمارەییو مێژووییو تەشریعی قورئان کە ئێستاش مایەی سەرسوڕمانی زانایانو لێکۆڵەرەوەکانە[1].

. خەبەردان لە شتەکانی داهاتوو کە هەمووی وەك خۆی بێتە دی.

سێیەم: ئەم قورئانە ڕەخنەی زۆری تێدایە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەی ئەگەر پێغەمبەر ﷺ خۆی دایناببێت چۆن ڕەخنە لە خۆی ئەگرێتو شتە شاراوەکانی خۆی بۆ خەڵك باس ئەکات؟!

. (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاه).

. (وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيل* لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِين* ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِين* فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ) (الحاقة: ٤٤ . ٤٧).

چوارەم: ئەم قورئانە خۆی باسی ئەوە ئەکات کە هی خوایەو ئەفەرموێت: (تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِين) یان ئەفەرموێ: (كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ). دەی ئەگەر ئەمە هی پێغەمبەرە ﷺ، یان هی هەرکەسی تریش بێت لەگەڵیدا، چۆن جوانترین شاکاری خۆی ئەداتە لای خەڵکی تر؟ چۆن گوشراوی عەقڵو ژیانی خۆی ئەداتە پاڵ کەسانی ترو نایداتە پاڵ خۆی؟!

ئەوەی زانراوو بەناوبانگە لەناو خەڵکیدا ئەوەیە زۆرجار خەڵك شتی خەڵکی تر ئەهێنێتو ئەیداتە پاڵ خۆیو خۆی پێوە هەڵدەکێشێت، کەچی کەسانی بوختانچی لێرەدا شتەکە ئاوەژوو ئەکەنەوە.

پێنجەم: ئەگەر گاور یان جولەکە یان خەڵکی قورەیش یان (ورقة بن نوفل)و (امیه بن ابي صلت)و موسەیلەمەو! ئەوانەی (شوان. ع) ڕیزیان ئەکات گوایە بەشەریکی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەم قورئانەو ئیسلامەیان داناوە! ئەگەر وابووایە بۆچی قورئان پڕیەتی لە ڕەخنەو لۆمە لە ئاینو ڕەوشتو دەسپیسی (یەهودو نەصارا)، ئاخر بۆ یەهود بە خەڵکیان نەوت: خەڵکینە ئەم دینەی موحەممەد ئێمە فێرمان کردووەو لە دینەکەی ئێمەوە وەری گرتووە، یان ڕوویان بکردایەتە پێغەمبەر ﷺو بیان وتایە "هَـٰذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا" یان بۆ موسەیلەمە وەك ئەم قورئانەی

[1] زانایانی ئیسلام باسی زیاتر لە (دە) جۆر (ئیعجاز)ی قورئان ئەکەن، سەیری (مباحث في علوم القران)، (مناع القطان، ص ٢٥٢) بکە

نەوت و خەڵك بکاتە خۆی؟ ئەمانە هەمووی با بخەینە لایەك و لەوە زیاتر هەوڵی ئەوە نەدەین کە شاخی بوختانەکەی (شوان. ع) درێژ بێتەوە.

باشە ئەو هەمووە پیلانەی لە ئیسلام کراوە بە درێژایی مێژوو ئەگەر لە هەر فیکرەو دین و میللەتێکی تر بکرایە ئێستا تۆزیشی مابوو.. باشە هەر ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە خوا (جل جلالە) خاوەنی ئیسلامەو هەر ئەویش ئەیپارێزێ، وەك ئەفەرموێ: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)، ئیتر کاکە شوان، ئایا ئیسلام خوا کردە یان مرۆڤ کرد؟! مەیلی خۆتە حەز ئەکا چی ناشیاوە بەرانبەر بە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام بیڵێ، بەڵام خۆت زەرەر ئەکەیت، لەوە ئاگاداربە کە خوا هەیەو قورئان هی ئەوەو هەر ئەویش ئەفەرموێت: (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ * أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاء رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ) (فصلت: ٥٣ ـ ٥٤).

(شوان. ع) هەر لەو یەك دوو لاپەڕەی پێشەکییەدا دیسان ئەڵێ: "ئێمە بە چاکمان زانی بۆ جارێکی تر وەرگێڕانەکەی (سیامەکی بابەك) بە چاپ بگەینینەوە بە هەندێ دەستکارییەوە.."[1].

بەر لە هەموو شتێك من نازانم ئەم دەمارگیرییە بۆ وشەی "بابەك"و "زەردەشت"و "مەزدەك"و ئەو شتانە لەبەرچی؟ ئایا بابەکی خورەمی چییە وا ئێستا (شوان. ع)و (م. ه) سۆزیان بۆی ئەجووڵێ، باشە ئەی دەستکاری کتێبی یەکێکی تر لە کاتی چاپکردنەوەدا یانی چی؟ ئەوە شتی وا ئەکرێت؟ یان ئەوە مافی نووسەرەو کاری لەو جۆرەی شوان ناپاکییە؟ ئەی ئەو شوێنانە کامانەن دەستکاری کراون؟ وە بۆچی؟ بەرهەرحاڵ، با سەرەتا ئەوە بڵێین بابەکی خورەم کابرایەکی یاخی و زۆر بەرەڵڵا بووە لە مێژوودا.

شانازییەك (شوان. ع)و (م. ه)و (فوئاد مەجید میصری)و هاوبیرەکانیان شکی ئەبەن بۆی ئەوەیە لە دەسەڵاتی ئیسلامی کاتی خۆی یاخی بووەو دەستی داوەتەوە موسڵمان کوشتنن ئەویش بە غەدرو زوڵم و ناجوامێری.

مێژووی ڕاستەقینە ئەڵێ: "خاوەنی کتێبی (الانساب) کە عەبدولکەریمی کوڕی موحەممەدی سەمعانی مەروزییە، ئەڵێ: (خورەمی بەو کۆمەڵە خەڵکە ئەوترێ کە باتنی مەزهەبن)، پێشیان ئەوترێ (خوڕەمدینییەکان) کە هەرچییان ویست و حەزیان لە هەرچی کرد ناوی ئەنێن دین و ئەیکەن، بۆیەش بەم شۆرەتە (لەقەبە) ناویان دەبەن، چونکە هەموو شتێکیان لا حەڵاڵە، عارەق و هەموو شتێکی خۆش و مارەکردنی هەموو مەحرەمێکی خۆیان و لەزەت بردن بە هەموو شێوەیەك، لەم (بەرەڵڵاییەیاندا) لە (مەزدەکییەکانی) ناو ئاگرپەرستەکان ئەچن، ئەو کۆمەڵەی کە لە سەردەمی (قابازدا) یاخی بوون و ئافرەتیان بەگشتی بۆ هەموو کەس حەڵاڵ کردو هەموو موحرەمێکیشیان بۆ خاوەنەکەی حەڵاڵ کرد تا سەردەمی نەوشیروان کوڕی قاباز، ئەوەبوو نەوشیروان هەموویانی لەناوبردو کوشتنی، لەبەر ئەوەیە چۆن بە (مەزدەکی) ناوئەبرێن واش بە (خورەمدینی) ناوئەبرێن، خاوەنی کتێبی (القاموس)یش ئەڵێ: خورەم دێیەکە لە وڵاتی فارسداو بابەکی خورەمی خەڵکی ئەوێیە، پاشان ئەڵێ کە ئەوترێ (بووبەخوڕەمی) واتە: دینی خورەمییەکانی قبوڵ کرد کە بڕوایان بە بەرەڵڵایی بێ قەیدو شەرت و (تناسخ)[2] هەیە"[3].

---

[1] ئیسلامناسی، ل ٨.

[2] تناسخ الارواح/ بیروباوەڕێکی هیندی و فارسییە مەبەستیان ئەوەیە (ڕۆح) کە لەلەشی مرۆڤەکان دەرئەچێت ئەچێتە لەشی گیاندارێکی ترەوە، جا ئەگەر ڕۆحەکە هی کەسێکی چاك بێت، ئەچێتە لەشی گیاندارێکی ماڵی بەسوودو ئەگەر ڕۆحی کەسێکی خراپیش بێت ئەچێتە لەشی گیاندارێکی دڕەندەو بەزیان.

[3] الدوله العباسیه/ خضری بگ/ ص ١٩٧.

**نزیکەی ٢٠ ساڵ شوڵی بێ شەرمی لێ هەڵکێشاو بەربوویە گیانی خیلافەتی ئیسلامی لە پێناوی بڵاوکردنەوەی بەرەڵلاییو دینی مەزدەکیدا، ئاماری ئەوانەی ئەو کوشتونی لەو ماوەیەدا بە (٢٥٥٠٠) کەوس مەزندە دەکرێ، لە کۆتا شەڕدا کە "ئەفشین" ناوێك لە گەڵیدا ئەیکاتو ئەشکێنێ (٧٦٠٠) ئەسیریشی لە چنگ ڕزگار ئەکات[1].**

**زانایانی مێژوو ئەڵێن: خورەمییەکان دوو دەستەن، دەستەیەکیان ناویان "بەرگ سوورەکان"ەو بە خورەمییە سەرەتاییەکانیش ناو ئەبرێن کە ڕێبەرەکەیان (مەزدەکی کۆن)ی پێ ئەوترێ، ئەم مەزدەکە فەرمانی بە شوێنکەوتووەکانی ئەکرد کە: حەز لە هەرچی ئەکەن بیخۆنو بیکەنو هەوڵبدەن بگەنە ئەوپەڕی ڕابواردنو خۆشیو خواردنو هاوکاری یەك بنو تێکەڵاوبن لەگەل یەکتریو کەس خۆی نەکات بە دیکتاتۆر بەسەر ئەوی ترەوە بۆ هەموو کەس حەڵاڵە کە بەشداربێت لە کچو ژنی خەڵکی ترداو نابێ ڕێگەی لێ بگیرێت، نەریتێکی سەیریان هەبوو لە میوانداریدا کە لەناو هیچ میللەتێکی دنیادا نییە، ئەویش ئەوەیە میوان دەستی بخستایەتە سەر هەرچی لەو ماڵەدا پێیان ئەدا، ئیتر ئەو شتە هەرچی بوایەو هەرکێ بوایە، (مەزدەکی کۆتاییش) لەسەر ئەم ڕێڕەوە بوون (نەوشیروان) خۆیو پێڕەوانی گشت کوشتن.**

**دەستەی دووەم خورەمییە بابەکییەکان کە ڕێبەرەکەیان ناوی (بابەکی خورەمی) بوو، ئەم بابەکە خۆی لە پێڕەوکەرانی کردە خواو گۆڕانکارییەکی زۆری لە مەزهەبی خورەمیدا دروست کرد، وەك کوشتو کوشتارو داگیرکارییو شەڕەنگێزیو ئەتککردنی کوژراو کە لەبنەڕەتدا دینی خوڕەمی ئەوشتانەی تێدا نەبوو، "ئیبن نەدیم" بەم شێوەیە باسیان ئەکات[2]. ئەوەندە هەیە ئیبن نەدیم ئەڵێ: "خوڕەم" بە "حێی بێ نوختە" نەك بە "حێی نوختەدار".**

**جا نازانم ئیتر ئەم خۆنیسبەتدانەی (سیامەك) بۆ لای بابەك چ هونەرو جوانییەکی تێدایە؟! کەس بڕا بوو ئەم ناوەکەی بخوازێ، بێ ڕەوشتێکی وەکو (بابەکی خورەمی) نەبێت، بەڵام دیارە وەك کورد ئەڵێ: "تەیری گول عاشق بە داری ژەقنەبووتە"، زۆر قسەیەکی ڕاستو مەنتیقییە.**

**(شوان. ع) کە قسە بۆ لاوانی کورد ئەکات وەك ئەوەی قسە بۆ کۆمەڵێك نەفامو نەخوێندەوار بکات و وا گومان ئەبات کەس تاقەتی ئەوەی نییە بە دوای ڕاستی و ناڕاستی قسەکانیدا بڕوات، ئەڵێ: "پێغەمبەر، ئەو بەرنامەیەی کە هەیبووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی، بەپێی تەرازووی هێزەکانو کاتو شوێنی شیاوی خۆی جێبەجێی کردووە، وەك ئەو ئیسلامە سیاسییە کە تا ئێستا پڕوپاگەندەی دیموکراتیو برایەتیو یەکسانیو کاری پەرلەمانی دەکات، ئەمەش ئەو ڕاستییە مێژووییە دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێت: بەکارهێنانی ئاین وەك هۆیەکی گرنگ لەلایەن کەسانێکەوە بۆ خواپەرستی و نزیکبوونەوە لە خواوەند نییە بەڵکو ڕاکێشانو کۆکردنەوەی ئەو مرۆڤە بێ هیواو تێکشاوانەی کۆمەڵگایە کە بەدوای ڕزگارکەرێکدا دەگەڕێن.."[3].**

**ئێمەش ئەڵێین:**

**- جارێ بەر لە هەموو شتێ، ئەمە کێ وتی: (ڕاستی مێژوویيە)؟! کام کەسو کام سەرچاوە؟ پاشان"**

**- ئایا پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی بەکارهێناوە بۆ مەبەستەکانی خۆی؟! مێژوو واناڵێت، بەڵکو مێژوو بە پێچەوانەوە ئەڵێت: مێژوو ئەڵێت: "عوتبەی کوڕی ڕەبیعە" کە یەکێك بوو لە ئەشرافی عەرەبی ئەو کاتە بە نوێنەرایەتی قورەیش ئەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ دانوستان تا لەگەڵیدا ڕێك بکەوێتو پێی ئەڵێ: برازای بەڕێز! جەنابت بنەماڵەو شوێنو جێگایەکی مەزنت هەیە لامان وەك ئەزانی، ئێستاش تۆ شتێکت هێناوەتە ناو ئەم عەشیرەتەت لەتو پەتت**

[1] هەمان سەرچاوە/ ل ١٩٩.

[2] الدولة العباسية/ خضري بگ ص١٩٧.

[3] ئیسلامناسی، ل ٦، ٧.

کردووه پێی، جا حەزەکەم گوێم بۆ بگریت، من هەندی شت هەیە ئەیخەمە پێش چاوت، ئومێد دەکەم هەندێکیانم لیێ قبول بکەیت، پێغەمبەر فەرمووی: ئەبا وەلید! گوێم بۆ گرتوویتو چیت پێیە بیڵێ، ئەبو وەلید وتی: برازای بەڕێزم! ئەگەر ئەمەی تۆ دەستت داوەتێ مەبەست ئەوەیە پارەو سامانێکی پێ کۆ بکەیتەوە، ئەوە ئێمە بڕیارمانە ئەوەندە سامانت لە ناوخۆماندا بۆ کۆبکەینەوە ببیتە سەرمایەدارترین کەسی ناومان، ئەگەر مەبەستیشت بەم کارەت ئەوەیە پێی گەورە ببی ئەوە ئێمە بڕیارمانداوە تۆ بکەینە گەورەی سەر خۆمان، بڕیاربێت بێ ئیزنی تۆ هیچ کارێك ئەنجام نەدەین، ئەگەر موڵكو پاشایەتیشت ئەوێ ئەوە تۆ هەر لە ئێستاوە پاشای ئێمەی خۆ ئەگەر ئەمەش تۆ باسی ئەکەی خەیاڵاتو خەوی هەڵەجو بەڵەجەو ناتوانی زاڵ ببی بەسەریداو لە خۆتی دوور بخەیتەوە، ئەوە بڕیامانداوە هەموو سەروەت و سامانمان بۆت سەرف بکەین تا ڕێمان لەو دکتۆرە ئەکەوێ کە چاکت ئەکاتەوە، کە عوتبە لەم قسانەی بوویەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێبویتەوە ئەبو وەلید؟ دە تۆش گوێ بۆ من بگرە، پێغەمبەریش سورتی (فصلت) لە ئایەتی یەکەوە بۆ خوێندەوە تا گەیشتە ئەو ئایەتەی ئەفەرموێ: (فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ)[1].

پاشان پێغەمبەر ﷺ سوجدە ئەبات، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە (ابن کثیر) لە (البدیة والنهایة)دا (٤٧/١)دا ئەڵێ: جارێکی تر ئەبو تالبی مامی ئەنێرنە لایو داوای ئەوەی لێ ئەکەن کە واز لە بانگەشەکردن بۆ ئەم دینە تازە بهێنێو چی ئەوی بۆی ئەکەنو بابەسبێت زیان گەیاندن لە قەوارەی قورەیش، ئەویش ئەفەرموێ: (یاعم! والله لو وضعوا الشمس في یمیني والقمر في یساری علی أن اترك هذا الامر ماترکته حتی ینصرالله أو اهلك دونه)[2].

ئیتر نازانم (شوان. ع) ئەو قسە ناقۆڵایەی لە کوێ هێنا کە پێغەمبەریش ﷺ بانگکردنی خەڵکی بۆ نزیکبوونەوە لە خوا نەبووە!!.

نەك هەر ئەمەیان هەڵەیە بەڵکو لەوەشدا هەر بە هەڵەدا چووە کە ئەڵێ: ئیسلامییەکانی ئەمڕۆش ئیسلام بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی تێکشکاوو بێ ئومێد بەکار دەهێنن!! لە ڕاستیدا زۆر کەس ئەم قەوانە کۆنە لێئەدات و منیش بە پێویستی ئەزانم سێ سەرنج لێرەدا بدەم:

یەکەم: ئەمە بەرامبەر پێغەمبەریش ﷺ هەر وتراوەو ئەوەتا (شوان. ع)یش هەمان قسەی قورەیشییە موشریکەکان ئەکاتەوە.. قورەیش ئەیانوت: "ان هذا لشيء یراد"، ئەوە شتێکی تری مەبەستە بەم باسکردنی ئیسلامە.. کەواتە وتنی ئەم جۆرە قسانە تازە نینو هەر سەردەمی ناسەردەمێك ئەمە ئەوترێتەوە، هۆکەشی تەنیا "ناشیرینکردنی ئەهلی ئیسلامو خودی ئیسلامە".

دووەم: کێ بە قەدەر خەڵکی عەلمانی دینو پیاوانی دین بەکار دەهێنێ بۆ مەبەستەکانیان؟ حکومەتە عەلمانییەکان خودی ئیسلامو فەتوای کۆنو تازەو مەلاکانو سەندیکای زانایانی ئیسلامو وەزارەتی ئەوقافو لە هەندێ شوێندا دامەزراوەی گەورەی وەك "ئەزهەر".. هتد، بەکار دێنن بۆ مەبەستەکانی خۆیان کە لە دوورو نزیکیشەوە ئەو مەبەستانە پەیوەند نین بە دینەوە؟ جا لە ڕاستیدا عەلمانییەکان دین ئیستغلال ئەکەن نەك ئیسلامییەکان![3].

---

[1] سیرة ابن هشام (١٨٥/١)و بۆ زیاتر سەیری (فقه السیرة الغزالي، ص١١٣) و حیاة محمد هیکل، ص١٥٢، بکە.

[2] "کاندهلوی" لە (حیاة الصحابة: ٢٩٦/١)دا ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مابي ماتقولون، ما جئت، بما جئتکم به أطلب أموالکم ولا الشرف فیکم والملك علیکم ولکن الله بعثني الیکم رسولا وأنزل علی کتابا وأمرني أن أکون لکم بشیرا ونذیرا، فبلغتکم رسالات ربي ونصحت لکم، فان تقبلوا مني ما جئتکم به فهو حظکم في الدنیا والاخرة، وان تردوه علی، أصبر لأمرالله حتی یحکم الله بیني وبینکم!!".

[3] لە دەورەیەکی هەڵبژاردندا حزبێکی عەلمانی بە دامەزراوە حزبییەکانی خۆی وتبوو لە یەکێك لە وڵاتەکاندا (بچنە لای مەلاکانو با لە وتاردا باسمان بکەن، چونکە بەخوا مەلاکان شتێکمان بۆ ئەکەن هیچمان پێی ناکرێ!!).

سێیەم: ئیسلامییەکان کە باسی دین ئەکەن لە واقعیشدا دین نەخش و ڕێزی هەیە لایان و جێگەی گرنگییانەو بڕوایان بە ئیسلام هەیەو بە هەق و بە ڕاستی ئەزانن..

. خۆیان نوێژگەرو قورئانخوێن و ئەهلی مزگەوتن.

.. ماڵ و منداڵیان سەرپۆش بەسەرو نوێژگەرو ئەهلی دینن.

. بنکەو بارەگاکانیان قورئانی تێدا ئەخوێنرێ و مزگەوتی تێدایەو خەڵکی بۆ دەرس و دەورەی دینی بانگ دەکەن.

. حەزئەکەن دین پێش بکەوێ، خەڵکی ڕوو لە ئیسلام بکات، ئیسلام سەر بکەوێ و لەو پێناوەشدا چییان پێ بکرێ ئەیکەن، لە بەخشینی ماڵ و سەروەت و سامانەوە تا بەخشینی گیان و نەفسیان.

لەبەر ئەوە ئەمانە باسی ئیسلام بکەن و ئایەت و فەرمووده بخوێننەوە، بۆ خەڵکی سەیر نییەو بەڵکو سەیر ئەوەیە باسی ئایەت و فەرموودەو پێغەمبەر ﷺ نەکەن و دوای ئەوە بکەون کە خەڵکی عەلمانی دوای کەوتووە.

بەڵام کەسانێکی مارکسی باسی ئایەت و فەرموودەو زانایانی بەڕێزی ئیسلام بکەن، بەڵام خۆیان:

. هەر بڕوایان بە ئیسلام و خواو دین نەبێت و هەشیان بێت مولحید بێت.

. نوێژنەکەرو مەشروبخۆرو زیناکەر بن.

. ماڵ و منداڵیان ڕووت و بەرەڵڵاو بێ ئیلتیزام بێ و لە قورئان و مزگەوت دوریان بخەنەوە.

. بنکەو بارەگاکانیان شوێنی کوفرکردن و بەدبینکردنی خەڵك بێ بەرامبەر بە دین و شوێنی چەقەنە لێدان و گۆرانی و سەماو هەڵپەڕکێی نادروست و ناشەرعیی بێت.

. حەز بکەن دین تێك بشکێ و شتی پیرۆز نەمێنێ و باسی حەرام و حەڵاڵ لابرێ و لەو پێناوەشدا هەموو شتێ سەرف بکەن لە کات و نووسین و ڕاگەیاندن پارەو تەنانەت ڕوح و گیانیش.

لەڕاستیدا ئەمانە باسی دین بکەن ئەوە ئەکرێ و جێی خۆیەتی بووترێ "ئیستیغلالکردنی دین" و ئەهلی دین، چونکە وەك ئەڵێن ئەوان و دین کوجا مەرحەبا!! یان وا دیارە (شوان. ع) و ئەوەی لەسەر مەزهەبی ئەوە نایانەوێ کەس باسی دین بکات، نە ئیسلامی و نە عەلمانی! بە چاك بێت یان بە خراپ! ئەمانە ئەڵێن: دین خەباتی بۆچییە؟ خۆی بڵاوئەبێتەوە !! لەسەرووی ئەمانەشەوە، باشە کاکە (شوان. ع) لە دەستووری هەرچی وڵاتانی ئیسلامیدا نەهاتووە کە دینی دەوڵەت ئیسلامەو ئیسلام یەکێکە یان سەرچاوەیەکی سەرەکیی تەشریعە! دەی هەر کۆمەڵ و هێزێك ئەگەر هەوڵ بدات دەستووریانە کار بکات و ئەو بڕگەیەی دەستوور بۆ نموونە بکاتە شتێکی عەمەلی ئەو نایاسایی ئەکات یان ئەوەی هەوڵ ئەدات ئەو بڕگەیەی دەستوور بکاتە شتێکی پووچ و بێ ماناو ناوەڕۆکی وشە کە هەڵبکۆڵێ و تەنیا قەباغەکەی بهێڵێتەوە؟! (مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُون)؟!

من دڵنیام ئەمانە تۆش ئەیانسەلمێنی بەڵام نکوڵییان لێ ئەکەی، ئەمەش هەر لە قورئاندا باسکراوەو خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً)، واتە: نکوڵی لە ئایەتەکانی خواو یاساو ڕێنماییەکانی دین ئەکەن هەرچەندە لە دەروون و ناخیاندا یەقینیان بەڕاستی ئەو قسانە هەیە، بەڵام لەبەر لوتبەرزی و ستەمکاری خۆیان دانی پێدا نانێن.

ئیتر لەسەر ئەوەیان ڕاناوەستین کە ئەڵێ: "دین مرۆڤە تێکشکاوو بێ ئومێدەکان بانگ ئەکات بۆ لای خۆی"، چونکە نازانم خەڵکی مەزڵوم و بێکەس و زەحمەتکێش لای (شوان. ع) ناویان تێکشکاوە، کەچی کە دێتە سەر بانگەشە بۆ بیرە کۆنەکەی خۆی ئەوانە زەخیرەی شۆڕش و جوامێرو خەڵکی دڵپاکن!!

خۆ ئەو هەمووە کەسەش ئێستاو لە هەموو دونیادا لە دەوری دین کۆبوونەتەوە، زیاد لە خەڵکە بێ نەواکان هەموو پیاوانی زاناو پسپۆڕو سەرمایەدارو قات لەبەرو سیاسەتمەدارن ئیتر ئەو ئەبێ مەبەستی کێ بێ؟

جارێکی تر (شوان. ع) ئەڵێ: "پێغەمبەر کە بووەتە هێزو دەسەڵات بە زەبری داگیرکردنو شەڕو باجو سەرانە پرۆسەی بە ئیسلامبوونی پەرەپێداوە"[١].

ڕەخنە لەو هەڵوێستەی پێغەمبەریش ﷺ ئەگرێت، کە لە صوڵحی "حودەیبیە"دا نواندنیو بە مەبەستەوە ئەڵێ: "موحەممەد بە هەموو مەرجو قسەکانی ئەبو سوفیان کە چنگی بەخوێنی موسڵمانەکان سوور بوو بوو ڕازی بوو، تەنانەت ئەگەر لەبەر نامەی ئاینەکەی خۆشی دوور کەوتبێتەوە"[٢].ئەم عەلمانییانە سەیرن! شەڕ ئەکەی هەر ڕازی نین، سوڵح ئەکەی هەر ڕازی نین، باسی زوڵمو زاڵمان ئەکەی ڕازی نین باسیان ناکەی ڕازی نین، خەبات ناکەی ئەڵێن تا دوێنێ لەکوێ بوون، خەبات ئەکەی ئەڵێن ئیسلام سیاسەتی بۆ چییە؟ دژ بە ئیمپریالیزم ئەجەنگێ تیرۆرستی، باسی ئیمپریالیزم ناکەی دۆستی داگیرکەریو کلکی سەرمایەدارییی! ئاخر کاکە شوانە! ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبییەدا ئەزانی هۆکەی چی بوو؟ بۆ خۆتی لێ لائەدەی، ئەترسێ ڕێسی ڕستەکەی سەرەوەت بکاتەوە بە خوری، کە ئەڵێی (بەزەبری داگیرکاریو شەڕو باج پرۆسەی بە ئیسلامبوونی پەرەپێداوە)!.

پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبییەدا بۆ شەڕ نەچوو، بەڵکو بۆ (عەمرە)و زیارەتی ماڵی خوا چوو، کەچی قورەیش شەڕیان پێ ئەفرۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمە بەبێ چەك هاتووینو نیازمان عەمرە کردنە، قورەیش گوێی پێنەدان، مێژوو ئەڵێ: خالیدی کوڕی وەلید – کە ئەو کاتە هێشتا موسڵمان نەبووبوو – خۆییو کۆمەڵێك لە سوارچاکەکانی قورەیش ڕێگەی بە پێغەمبەرو صەحابەکان گرت، پێغەمبەریش (عابدی کوڕی بەشیر)ی لەگەڵ چەند صەحابەیەکی تردا لە ڕووی ئەوەوە داناو نوێژی (ترس)ی بۆ کردنو پاشان فەرمووی (یاویح قریش! أكلهم الحرب، ماذا عليهم لو خلوا بيني وبين سائر العرب فان هم اصابوني كان ذلك الذي ارادوا، وان اظهرني الله عليهم دخلوا في الاسلام وافرين، وان لم يفعلوا قاتلوا وبهم قوة، فما تظن قريش، فوالله لاأزال اجاهد على الذي بعثني الله به حتى يظهره الله أو تنفرد هذه السافلة)"[٣].

واتە: "هەی هاوار بۆ قورەیش، باشە خۆ شەڕ گشتیانی خوارد! باشە چی ئەبێ واز لە من بهێننو لێم بگەڕێن بزانن منو عەرەبەکانی تر چیمان بەسەر دێت، جا ئەگەر ئەوان منیان تێك شکاند ئەوە ئەوان ئەوەیان ویستووەو دەستیان کەوتووە، خۆ ئەگەر خواش منی زاڵ کرد بەسەر ئەواندا ئەوە ئەوان ئەگەر ویستیان دێنە ناو ئیسلامو ئەو کاتە زۆرو زەبەندیشن، ئەگەر ئیسلامیشیان قەبووڵ نەکردو شەڕیان هەڵبژارد، هێزێکیان هاتووەتەوە بە بەرداو ئەوە باشترە بۆیان، باشە قورەیش گومانی چی ئەبەن؟ سوێند بەخوا هەتا هەتایە لە پێناوی ئەم ئاینەدا تێدەکۆشم کە خوا بۆی ناردووم، ئیتر یان خوا زاڵم ئەکات یان ئەم سەرەم لە لاشەم جیا ئەبێتەوە".

هەر بۆ زانیارییت کاکە شوان ژمارەی ئەوانەی هاتنە ناو ئیسلام لە سەرەتای دابەزینی قورئانەوە تا پەیماننامەی حودەیبییەو ئەوانەی دوای حودەیبییە هاتنە ناو ئیسلامەوە تا فەتحی مەککە بە بەراورد نیو ئەوەندەی ئەمان بوون، هۆکەشی ئەوەبوو کە دیارە ئەم ئیسلامە لە هەلومەرجو بارودۆخی ئاشتیدا زۆرتر گەشە ئەکاتو پەرە ئەسێنێ، تا سەردەمی شەڕو کوشتو کوشتار، پێغەمبەریش ﷺ ئەو صوڵحەی کرد هەموو بڕگەکانی کە تۆ گاڵتەت دێت پێی، ڕاستە بۆ کەسی کورتبین جێگەی ڕەخنەیە، بەڵام بۆ مرۆڤی دووربینو عاقڵ جێگەی سەرنجو ئیعجابە، بۆ نموونە:

---

[١] ئیسلامناسی، ل ٧.

[٢] ئیسلامناسی، ل ٧.

[٣] الموجز في تاريخ الاسلام والمسلمين، ص ١٧٢.

. پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو هەرکەس لە ناو ئەمانەوە بچێتەوە ناو قورەیش با پیرۆزیان بێت‌و هەرکەسیش لە ناو ئەوانەوە هاتە ناو ئەمان وەری ناگرن..

بە ڕووکەش ئەمە زیانە بۆ موسڵمانان‌و سوودە بۆ قورەیش، دیارە پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی ئەویست کە قورەیش ڕووکەش سەیری بڕگەکانی پەیماننامەکە بکەن.

ڕاستییەکەی ئەمەیە:

ئەوەی خۆی بچێتە ناو قورەیش دیارە (مرتد) بووەتەوەو تازە بە کەڵکی ئیسلام نایەت، ئەوەشی بەڕاستی ئیسلام قەبووڵ بکات مەدینەش وەری نەگرێت، پەنایەك هەر بۆ خۆی دروست ئەکات‌و تازە ناچێتەوە ناو قورەیش، هەرکەسیش بە (سیخوڕی) بیەوێت بێتە ناو لەشکری پێغەمبەر ﷺ ئەوە پەیماننامە ڕێگەی نادات، لە کاتێکدا پەیماننامەکە دەرگای کردووەتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر پێغەمبەر ﷺ هەواڵگرێك بنێرێتە ناویان "بەڕووکەشی!!"، کەواتە ئەو بڕگەیە چەند ئامانجی پێغەمبەری ﷺ پێکا.. ئەوەش بوو هەموو ئەوانەی دوای حودەیبییە موسڵمان بوون لە قورەیش پەناگایەکیان بۆ خۆیان دروستکردو کەوتنە شەڕی پارتیزانی لەگەڵ قورەیش‌و تەنگەتاویان کردن[1]. تا بەناچاری هاتنە لای پێغەمبەرو داوایان لێکرد کە بەڕەزامەندی هەردوولا ئەو بڕگەیە لابرێت، پێغەمبەر ﷺ ئەو پیاوەتی‌و چاکەیان لەگەڵدا بکات‌و ئەوانە وەربگرێت.

. ئەو سوڵحە گەورەترین زیانی بە قورەیش گەیاندو گەورەترین (فتح)یش بوو بۆ موسڵمانەکان، چونکە دەست‌و دەمی موسڵمانەکانی کردەوەو بەبێ ترس بەناو شارو دێ‌و تایفەو عەشیرەتەکاندا ئەگەڕان‌و باسی ئیسلام‌و بنەماکانی ئیسلامیان ئەکرد بۆ خەڵك، ڕۆژ بەڕۆژ پەرەیان بە ئاینەکەیان ئەداو خەڵکی زیاتر لە دەوریان کۆ ئەبوویەوەو خەڵك‌و عەشرەتەکان بەبێ ترس ئەبونە هاوپەیمان‌و هەواداری ئیسلام‌و پێغەمبەری خوا ﷺ. قورەیش نە (فکرو)و نە (کێشەیەکی ڕەوا)ی نەبوو باسی بکات بۆ خەڵکی لەو ماوەیەدا، بەڵام موسڵمانەکان خاوەنی (فیکرە)و (کێشەیەکی ڕەوا) بوون، هەر بواری ئەوەیان ببوایە دەمیان بگاتە خەڵکی کاریگەرییان لەسەری دروست ئەکرد، هەر ئەوەبوو وای کرد قورەیش توانای قەبوڵکردنی ئەو گەشە زۆرەی دینی نەماو لە ناکاوێکدا دایان بەسەر تیرەیەکدا کە بوو بووە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ بەوەش پەیمانەکەیان یەك لایەنە هەڵوەشاندەوە.

(سبحان الله) ئەمڕۆش لە دوێنێ ئەچێ!! گەورەترین کێشە لای عەلمانییەکانی ئەم دنیایە ئەوەیە خەڵکی موسڵمان ئازاد بێت‌و باسی دین‌و حەقیقەتی دین بکات بۆ خەڵك، موسڵمان ئازادبێت لە مومارەسەکردنی مافی خۆیدا، باسی بەهەشت‌و جەهەننەم ئەکەی ئەڵێن: گوناهە بۆ منداڵ بە بەهەشت‌و جەهەننەم ئەترسێنن‌و مێشکیان بە دوکەڵی جەهەننەم دەئاخنن!! مەگەر خۆیان بزانن چەند وشەو ڕستەی ناجوان‌و ناشایستە لەو ڕەخنانەیاندا بەکار دێنن بەرانبەر بە تۆسقاڵێك ئازادی کە بدرێتە ئیسلام‌و موسڵمانان، ئەگەر باسی سیاسەت ئەکەی ئەڵێن ئیسلام سیاسەتی تێدا نییە، دین مەپێچن بە سیاسەتەوەو دین هەندێ بەهای ڕۆحییە، باسی سیاسەت ناکەی ئەڵێن: "دین تلیاکی گەلانە"و بە کەڵك نایە!!

---

[1] یەکەم کەس کە موسڵمانبوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، ناوی (أبو جندل) بوو کە کوڕی نوێنەرەکەی قورەیش بوو، پێغەمبەر ﷺ وەری نەگرت، بەڵام قسەیەکی کرد لە ڕوویداو بوو بە (جفرە) یەك بۆی‌و سوودی زۆری لێ وەرگرت! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یا ویح امه! مسعر حرب لوکان معه رجال)، دایك ڕۆڵەڕۆی بۆ نەکات! شۆڕش هەڵگیرسێنە ئەگەر چەند پیاوێکی لەگەڵدا بوایە، نووسەرانی، (سیرە) ئەڵێن: (أبوجندل وأبو بصیر) سودیان لەو ڕستەیەی پێغەمبەر ﷺ زۆر وەرگرت، ئەوە بوو زۆری نەبرد هەموو ئەوانەی موسڵمان ئەبوون‌و پەیماننامەکە ڕێگەی نەئەدان بچنە مەدینە ئەچوون بۆ لای ئەبو بەصیرو ئەبو جەندەل‌و تا ئەهات ژمارەیان زیادی ئەکرد لە (دەرەوە)، تا چەند مەفرەزەیەکی پارتیزانی لێ دروست بوو ڕۆژانە چالاکییان ئەنجام ئەدا دژ بە قورەیش، هەندێ لەو بڕوایەدان کە "ئەبو بصیر" کورد بووە لەناو ئەو مەفرەزە سەرەتاییانەدا، (ژیانی ئەبوبەصیر) سەرکردەی مەفرەزە پارتیزانییەکانی پێغەمبەر ﷺ، موحەممەد سەنگاوی، ل١٥.

جا کاکە شوان! مەسەلەی سوڵحی حودەیبییە کتێبی گەورە گەورەی لەسەر نووسراوە[1]و لە ڕاستیدا تۆ خراپ حاڵی بووی، ئەوە (تنازل)و دوورکەوتنەوە لە ئاین نەبووە، بەڵکو زەمینەسازکردن بووە بۆ برەوی زیاتری ئاین.. چونکە لە ڕاستیدا ئایین لەناو کەش و هەوای ئازادیو ئاشتیدا زیاتر گەشە ئەکات، تا شەڕو شۆڕو هەرا.

ئەم هێرشە ناڕەوایەی ئەمڕۆش بە بیانوی (ئیرهاب و قاعیدە)وە ئەکرێتە سەر ئیسلامو موسڵمانان هەر لەبەر ئەوەیە ئازادی لە موسڵمانان زەوت بکرێ، مەگەر (صاموئیل هینگلۆن)لە کتێبی (صدام الحضارات)ەکەیدا ناڵێت: "ڕەوەندی ئیسلامییەکانی ڕۆژئاوا لەبەر ئەوەی بونە تە بەشێك لە کۆمەڵگای خۆیانو (حەساسیەت) نەماوە لە نێوان ئەوانو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوادا، گەورەترین کاریگەری دینییان لەسەر ئەو کۆمەڵگەیە داناوە".

هەر ئەمەیە وای کردووە ئێستا ڕۆژئاواو بە دوایاندا هەموو هێزێکی نەیار بە ئیسلام ئەوپەڕی هەوڵ ئەدەن کە (حەساسیەت) بۆ خەڵك دروست بکەن بە ئیسلامو خەڵکی ئیسلامیی، بەڵام ئەم پیلانو هەوڵەش هەر کۆنەو سوودی نابێت، چونکە ئیسلام هی خوایە نەك هی ئەو خەڵکە، خوا برەوی پێئەدات نەك خەڵك، خوا سەری ئەخاتو خۆشەویستی ئەکات نەك خەڵك، قورئان ئەفەرمووێ: (يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ). خەڵکی دوور لە دین ئەیانەوێ نوری خوا بەدەم بکوژێننەوە، بەڵام خوا بڕیاری داوە هەر ئەبێ دین نوری بەردەوام بێ.

پێشەکییە دوو لاپەڕەکەی "سیامەکی بابەك" هەموو هەڵەو پەڵەیەو هیچی بەسەر یەکەوە نییە، بەڵام لەبەر ناچاری با نەبێتە بوختان چەند شتێکی لەسەر ئەنووسین:

یەکەم: ئەم پیشەکییەی وەك خۆی ئەڵێ: لە (١٩٧٨/١/١)دا نووسیوە، کەچی سەیرە باسی ڕەواجی ئەم کیتێبە ئەکات لە ساڵانی دوای (١٩٧٨)دا، کە چۆن لە فلانە ساڵو فیسارە ساڵدا خێرا لە بازاڕدانەماو دوادانەی تەواو بووە، یەکێك لەو ساڵانە چاپی پێنجەمیو شەشەمی ساڵی ١٩٧٩و چاپی حەوتەمی ١٩٨٠!! جا خوێنەری بەڕێز کەس بێعەقڵی وا نەکات، لە (١٩٧٨)دا باسی بازاڕگەرمی کتێبێك بکات کە (١٩٧٩ – ١٩٨٠) چاپ کراوە!! کە هێشتا ساڵەکە لەدایك نەبووە.

لەمە قەڵبتر ئەڵێ: لە ١٩٧٨/١/١دا سوودم لە کتێبێکی ئەوڕەحمانی حاجی مارف[2] وەرگرتووە کە لە ساڵی ١٩٨٦ چاپ کراوە لە بەغدا!!.

دووەم: باسی ئەو هەموو چاپو بڵاوکردنەوەیە ئەکات (بەسوبعەت) بەبێ ئەوەی بڵێ لە کوێ، کام چاپخانە، ژمارەی سپاردن، ژمارەی تیراژ، هەر هیچ، جا کێ بێ بتوانێ باوەڕ بە شتی وا بکاتو ناویشی "لێکۆڵینەوەی زانستی"بێ!! ئەگەر ئەوترێ ئەو زانیارییانە پێویست نین، ئەڵێین شتی زانستی ئەوەی ئەوێو کابراش لێکۆڵینەوەکەی ناونا "زانستیانە" پاشان ئەی بۆچی بۆ ناوی کتێبەکەی ئەوڕەحمانی حاجی مارف هەموو زانیارییەکان ئەڵێ، لەگەڵ ئەمانەشدا باسی دوو چاپی (١٩٧٩) ئەکات، گوایە لە ئێراندا چاپکراوە[3].

لە کاتێکدا ئەوەی لای خەڵکی ئەم ناوچەیە ئاشکرایە (١٩٧٩) ئێران لەناو پاشاگەردانیو بی سەروبەریدا ئەژیاو ڕۆژ ڕۆژی شۆڕشو هەڵاو وریا بوو نەك ڕۆژی کتێب چاپکردنو بڵاوکردنەوە، ئەگەر مەبەستی چاپی شاخ و ئۆفسێتی ناو ئەشکەوتە ئەبوو بیوتایە، تا کەس ئەم ڕەخنەیەی نەوتایە.

هەروەها ئەڵێ: "ئەم کتێبە لە ڕووی چاپی نۆیەمی (ئیسلام شناسی) ئەمریکاوە گۆڕییە سەر زمانی کوردی"، کە خوێنەر نازانێ ئایا لە ئەمریکا بە زمانی فارسی چاپ کراوە، یان بە ئینگلیزی! بەرهەحاڵ سیامەکی بابەك وەك

---

[1] السيرة الحركية/ منير الغضبان، زاد المعاد/ ابن القيم، بروانە ئەو ڕێساو یاسایانەی کە لەم سوڵحەوە وەریگرتووە.

[2] کتێبی (ڕێنوسی زمانی کوردی، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەغدا، ١٩٨٦م) هەرچەندە خۆ ئەو زانیارییە سوودی پێ نەگەیاندووەو بووەتە هۆی نەگبەتیو ئابڕووچوون بۆی!

[3] ئیسلامناسی، ل ٩.

ئەوەی هیچی نەهێڵابێ و خێرو بێری گەورەی بۆ ئەم میللەتە هێنابێ بە تەرجەمەکردنی ئەم کتێبەم ناچاك و نازانستیەو ناوی ئەنێ دڕدان بە تاریکی و پاشان ئەڵێ: "پێموایە کۆڕپەی کارکردن لەم ڕاڕەوەدا ئەو گەلانەن خۆری بەندی تاریکستان بکەنە کۆڵ و پرشنگی ژیەنەری بگەیەننە دوورترین کەل و قوژبنی کوردستان"[1].

ئەو گەل و گروپانە کامانەن خۆری بەندکراو بگرنە کۆڵ و بیگەیەننە کوردستان، ئەو خۆرە چییەو کامەیە؟! کوردستان هەر ئەمەی کەمە وەك چۆن خواردنی لە قوتونراوی بۆ ئەهێنرێ ئاواش بیروباوەری لە قوتونراوی بۆ بهینرێ، بیری ناسیۆنالیزمی بۆ هێنرا ئەو تەواو نەبوو بیری سوسیالیزمی بۆ هێنرا، ئەو تەواو نەبوو بیری شۆسیال دیموکراتی بۆ هێنراو ئەوانە تەواو نەبوون ئێستا گەرمەی بیری دیموکراسییە بەبێ ئەوەی بوترێ ئێمە ئەوەندە لەو بیروباوەڕانە وەردەگرین کە بۆ کۆمەڵگاکەمان بەسوود بیت، دژایەتی بیروباوەڕی میللەتەکەمان نەکات، چاکەکانیان وەردەگرین و خراپەکانیش ئەدەینەوە بەسەر خاوەنەکانیاندا، جا ئەگەر (سیامەکی بابەکی) مەبەستی لەو خۆرە دینی مارکسییەت و مەبەستی بە تاریکی ئیسلام و مێژووی ئیسلام و بیروبڕواکانی ئیسلامە ئەوە لە سەدلاوە لێی قەوماوە:

یەکەم: بیروباوەڕی مارکسیەت ئیکسپایەر بووەو هەر لە سەرچاوەکەیەوە فڕێ دراوە.

دووەم: مارکسیەت بە زیاتر لە حەفتا ساڵ (حوکم) کە هەرچی دەسەڵاتی ماددی هەیە لە ئیختیاری دابوو، نەیتوانی ئیسلام بکوژێنێتەوە، ئیستا (شوان. ع) و (سیامەك بابەکی) و فلان و فیسار بەیەك دوو کتێبی منالانەو نازانستانە ئەتوانن بیکوژێننەوە؟

سێیەم: دین هی خوایە، خواش بڕیاری بە دەستە، ئەگەر فرسەتێکیش بدات بە هەندێ عەبدی یاخی و بێ شەرمی خۆی هەندێ لاساری بکەن، ئەوە تەنیا بۆ تاقیکردنەوەیە، ئەگینا خوا بڕیار بەسەر هەر ئەندامێکی لەشی ئەو عەبدەدا بدات لە کار ئەکەوێ و بە زەلیلی و ئیفلیجی باقی ژیانی ئەبی بباتە سەر[2] پیسی بکاتە ژێر خۆی و کەسیش زەرە ناکات خۆی نەبێت، خوای گەورە ئەفەرموێت: (لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ)، کەس ناتوانێ پەرچ لەبەردەم بڕیارو حوکمی خوا دروست بکات، خوا حیساباتی زۆر خێرایە!! خوا بەهەر عەبدیکی وت بمرە، ئەبێ بمرێ، پیر ببە، ئەبێ پیر ببێ، نەخۆش بکەوە، ئەبێ نەخۆش بکەوێ، ڕیسوا ببە، ئەبێ ڕیسوا ببێ، فلان ئەندامی لەشی لەکار بکەوە، ئەبێ لەکار بکەوێ، کەواتە شێتی نییە عەبد یاخی ببێت و دژایەتی خواو دینی خواو دۆستانی خوا بکات.

(فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ* إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ* لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ) (التكوير: ٢٦ . ٢٨).

بۆ کوێ ئەڕۆن، ئەم قورئانە هیچ نییە ئەوە نەبێ یادخەرەوەیە بۆ هەموو جیهان، بۆ هەرکەسێ لە ئێوە بیەوێ ڕاست ڕاوەستێ.

خۆ ئەگەر مەبەست لە هەڵگرتنی خۆر ـ هێنانی بۆ کوردستانێکی تاریك تا ئێسلامی پێ ڕاو بنێ ـ بیری سەرمایەداریی و کلکایەتی و سیخوڕی بێت ئەوە لەمەشدا هەر بە هەڵەدا چووە، چونکە:

[1] هەرمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] عەفیف ئەصغەر/ نووسەرێکی عەلمانیی تونسی بێحەیایەو ئەوەی نەشێ و نەبا بە دینی وتووەو نووسیویەتی، خوای گەورە دەردی ئیفلیجی داوە بە کۆڵیدا، ئێستا ئەو "ڕۆشنبیرە گەورەیە!" نیازی خۆکوژی هەیە بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت لەو بارە قورسەی خوا داوێتی بەسەریدا، کەچی بیر لەوە ناکاتەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی و داوای لێبوردنی لێبکات لەو هەمووە بێشەرمیی و لاسارییەی بەرانبەر خواو پێغەمبەرو دینەکەی کردوویەتی و وەك عاقڵان تەمەنێکی تازە دەست پێ بکاتەوە، سەیری (عەلمانییەت و ئوسوڵیەت، ل ٧) بکە.

یەکەم: سەرمایەدارییش لە وڵاتی خۆیاندا لێی کەوتوونە تەقەو[1] سەدوو یەك کونی تێ بووەو هەرچەندە هەر تێیدا بووە لە بنەڕەتدا.

دووەم: میللەتانی ئەم ناوچەیە هەر بەم زووییە خەریکن باجی بیروباوەڕی سەرمایەداری ئەدەن.

سێیەم: ئەم سەرمایەدارییەی ئەمریکا بە ڕوسیاو بە ئەوروپاو بە ئەمریکای لاتین‌و فەنزولیاو باخچەی پێشتەوەی ئەمریکا قەبووڵ ناکرێ ئێستا تۆ ئەتەوێ کوردستانێکی بێ دەرەتان بەبێ قەیدو شەرت قەبوڵی بکات؟! بۆ تۆ کوردو خاکی کوردان بەچی ئەزانی، وا ئەتەوێ بیکەیتە تاقیگە بۆ هەرچی بیروباوەڕ هەیە؟! ئەی ئیتر ئەم خۆرە تاریکەی تۆ چییەو کێ ئەیگرێت بە کۆڵەوە، ئەترسم لە ئەنجامدا تەنیا پشتی خۆتان بسووتێنێ‌و لەش‌و مێشکتان ڕەش‌و تاریك بکات ئەگەر نەیکردبێ.

. سیامەکی بابەکی باسی ئەوە ئەکات کە هەندێ گۆڕانکاری و جوانکاری کردووە لەوەرگێڕانەکەیداو ئەوەتا ئەڵێ: "لە مەڕ وەرگێڕانەکەوە پێویستە سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشم کە زۆرجار ناچاربووم بۆ نزیککردنەوەی ڕۆحی دەقێکی مێژوویی لە کاتی نووسینەوە گیان‌و حاڵەتی سایکۆلۆژی دەقەکە بپارێزم‌و وەك دیاردەیەکی زیندووی خاوەن زمان سەیری بکەم‌و ڕەنگە ئەوەش بەلای خوێنەرەوە زۆر ئاسایی نەبێت‌و بێ ڕەچاوکردنی ئەم تێبینییە بە کەم‌و کورتی تێ بگات، کە خۆم بە ئیمتیازم زانیوە"، نەك هەر ئەمە بەڵکو بۆ ئایەتەکانیش وای کردووە[2].

بۆ وەڵامی ئەم دەستکاری‌و چەواشەکارییە تەنیا ئەوەندە ئەڵێین:

وەرگێڕان هونەرو زانستێکی وردەو هەمووکەس بە ئاسانی فێری نابێ، پابەند نەبوون بە مەرجەکانی وەرگێڕانەوە یان (نەتوانین) یان (نەزانین) یان (گزیکردنە)، چونکە وەرگێڕانی سەقەت ماناو مەبەست تێك ئەدات، بۆ نموونە سەیری ئەم گزییە گەورەیەی (جولدتسیهر) بکە کە (سیامەکیش) چاوی لەو کردووە:

(جولدتسیهر) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی یەهودیی بەتوانایەو کتێبێکی زۆری لەسەر ئیسلام‌و مێژووی ئیسلام‌و مێژووی (حەدیس) داناوە، لەو شوێنەدا ئیمامی زوهری (کە ئیمامێکی گەورەی ئەهلی سوننەیە) باسی نووسینەوەی فەرمووده ئەکاتو ئەڵێ: "يا أيها الناس، اناكنا منعناكم امرا بذلناه الآن لهولاء، وان هؤلاء الامراء اكرهونا على كتابة الا حاديث فتعالوا حتى أحدثكم بها.."، جا "جولوتسیهر"ی یەهودی (شەیتانانە) یان (نەزانانە) هاتووەو ئەڵێ: "ان الزهري أعترف اعترافا خطيرا في قوله الذي رواه عنه معمر، ان هولاء الامراء أكرهونا على كتابة أحاديث"[3].

جا خوێنەری بەڕێز: سەیر بکە ئەو دوو قسەیە چەند جیاوازن، خۆ تەنیا یەك (ئەلفولام)یشی جیاوازە (أحاديث)و (الاحاديث)، مەبەستی ئیمامی زوهری ئەوەیە کە خەلیفەکانی سەردەمی ئەوو دروست خەلیفە (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) دا وایان لێ ئەکەن وەك چۆن قورئان نووسراوەتەوەو بووەتە کتێبێك‌و ئەخوێنرێتەوە، واش هەوڵ بدەن فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بنوسرێتەوەو خەڵك بیانخوینێتەوە، بەڵام ئیمامی زوهری‌و بێجگە ئەویش بڕوایان وابووە فەرمووده هەر بەسەر دەمەوە بگێڕدرێتەوەو لە بەر بکرێت نەك بنووسرێتەوە، کاتێك کە خەلیفەکان ئیلحاحی زۆریان لێ ئەکەن‌و هانیان ئەدەن بۆ ئەوە، بە ناچاری دەست ئەدەنە فەرمووده نووسینەوە.

بەڵام جولدتسیهر ئەڵێ: "أكرهونا على كتابة أحاديث"، کە ماناکەی وایە: زۆریان لێکردن بۆ نووسینی هەندێ فەرمووده، کە ئەو مانایەکی خراپی لێ دەرهێناوە" گوایە پێشەوایانی فەرمووده بۆ شاباش‌و بەرتیل خواردن

---

[1] لە ئەفسانەی دیموکراتیدا کاك فازیل قەرەداغی باسێکی ئەم بابەتە ئەکات، شایانی ئەوەیە هەر کەس ئەیەوێ بۆی بگەڕێتەوە.

[2] ئیسلاماناسی، ل ١٠.

[3] السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي/ مصطفى السباعي، ص ٢٢١.

فەرموودەیان داناوە لە بەرژەوەندی کاربەدەستان. لە کاتێکدا دەقەکە وەك لە پێشەوە باسمانکرد: "أكرهونا على كتابة الاحاديث" نەك "على كتابة أحاديث".

جا سیامەکی بابەکی ئەگەر وابزانێ وەگێڕان هەروا ئاسانەو حەزی کرد لە هەرچی (ئارایش)ێکی بکات، ئەوە وەك وتمان یان "گزی بازیی"یە یان "نەتوانین"و عەجزە یان (بێ ئاستییە).

د. کەمال مەزهەر لە کتێبی (مێژوو)دا دەڵێ: "مێژوو نووس چەند دەتوانێت زیاتر دەبێت لە نووسین و نرخاندنەکانیدا (بێلایەن) بێت بۆ ئەوەی (ڕاستی بۆ خۆی چۆنە) وەها بیپێکێت، یان بەلانی کەمەوە چەند دەتوانێت هێندە لە ڕاستی نزیك بکەوێتەوە، لایەنگری زیانی هەیە قازانجی نییە"[1].

جا د. کەمال مەزهەر چەند نموونەیەك دێنێتەوە لەسەر ئەوانەی نرخی خۆیان و کتێبەکەکانیان داناوە لەسەر ئەوەی کە بەلایەنگری مێژوویان نووسیوەتەوە یان گواستووەتەوە[2]، بۆیە سیامەکی بابەك ئەو دەستکاری کردنەی زۆرجار بۆ دەقە مێژووییەکان نرخی خۆیو نرخی کتێبەکەش لە ناو ئەبات و ئەوەش بڕیاری ئێمە نییە بەڵکو بڕیاری عەقڵ و زانست و مێژووە.

با ئەمە بەس بێت و بچینە سەر بابەتە بنەڕەتییەکانی کتێبەکەی (شوان. ع)و (سیامەکی بابەك)و (میر فطروس)ی ڕێبەرو مامۆستایان.

---

[1] مێژوو، ل٢٦.

[2] سەیری لاپەڕەکانی (٢٧) بەدواوە بکە.

## کورتەیەك لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ

ئێمە لەم بڕگەیەدا بە ناچاری خۆمان پابەند ئەکەین بەو لایەنانەوە کە "علی میر فطروس" لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هێناونی و کردوونی بە ڕەخنەو عەیبە.

ئەوکەسەی کە ژیان و بوونەوەرو مرۆڤی دروست کردووە، یاسای وردیشی بۆ داناوە تا بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچێت، ئەو ئامانجەی بۆی دانراوە بهێنێتە دی زانایانی ئیسلامی ئەفەرموون: هەرچی ئافەریدە (خولقاو) هەیە دوو بەشە: زیندوو، نازیندوو، نازیندووەکان بریتین لە زەوی و ئاسمانەکان و ئاوو هەواو ئاگرو خۆڵ و دارو بەرد.

زیندووەکانیش دوو جۆرن: خاوەن ژیان و خاوەن گیان.

خاوەن ژیانەکان وەك ئاژەڵ و دارو درەخت و هەموو باڵندەو مێروو زیندەوەرەکانی تر، خاوەن گیانەکانیش وەکو مرۆڤو فریشتەو پەری، کە ئەمانیش دوو جۆرن خاوەن ئیرادەکان کە مرۆڤو پەریەو بێ ئیرادەکان کە فریشتەن، "کاك ئەحمەدی موفتی زادە" . بیریاری گەورەی ئێرانی . ئەفەرموێ، هەرچی دروستکراو هەیە سێ بەشە: بەشێکیان ماددەی و موجەرەدن، بە شێکیان ماددەکە (ژیان)ی پێدراوە، بەشێکی تریان ماددەکە ژیانی پێدراوەو گیانیشی بۆ زیاد کراوە.. واتە دروستکراوەکان یەکسانن بە:

١. ماددی ڕووت (مادە مجردە).

٢. ماددە + ژیان (حیاة).

٣. ماددە + ژیان + ڕۆح (گیان).. ئەمە چۆن ئەزانین؟ یان بە (شەرع) ئەیزانین یان بە (عەقڵ).

دیاردەکانی ژیان: جوڵە، هەناسە، گەشە، زیادبوون، زۆربوون..

دیاردەکانی گیان: عەقڵ، بیرکردنەوە، ئیرادە، ڕەوشت، هەست و نەست (احساس و شعور)[1].

هەموو ئەمانە دروستکراون و خوای تاك و تەنیا باڵادەستە بەسەریانەوە، دووجۆر بەرنامەی داناوە بۆیان (بەرنامەی تەکوینی)و (بەرنامەی تەشریعی).

مەبەست بە یەکەمیان ئەو ڕێساو یاسایە کە دانراوە بۆ هەموو دروستکراوە بێ ئیرادەکان کە بەبێ ئیختیار ئەبێ لەسەری بڕۆن، (بەرنامەی تەشریعی)یش دانراوە بۆ هەموو ئەو دروستکراوانەی کە خاوەنی ئیرادەن و ئیختیاری هەڵبژاردن و ڕەفزکردنیان دراوەتێ.. بە یەکەمیان ئەوترێ (سنن) بەپێی زمانی قورئان و بە دووهەمیان ئەوترێ "دین".

خوای گەورە دەربارەی یەکەمیان ئەفەرموێ: (اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ* وَسَخَّر لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَينَ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ* وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ) (إبراهیم: ٣٢ . ٣٤).

"اللە" ئەو خوایەیە کە زەوی و ئاسمانەکانی دروست کردووە، لە ئاسمانەوە باران ئەبارێنێت، زۆر نابات بەرووبووم سەردەردێنێ و ڕزقتان بۆ فەراهەم ئەکات، هەروەها کەشتی بۆ ماڵی و ژێربارکردوون کە بەدەریاکاندا بڕوات بە فەرمانی خواو دەریاکانیشی هەموو ڕامو ژێربارکردووە بۆتان، مانگ و خۆری بۆ ژێربار خستوون بە هەمیشەیی و بێ پشتیوان، هەروەها شەوو ڕۆژیشی بۆ ڕام هێناون و لە خزمەتیاندایە هەرچی داوا بکەن پێدانی

[1] فیترە وهیدایەت/ أحمد موفتی زادە/ نەواری ژمارەی تایبەت.

داوه، ئەگەر بێن و نیعمەتەکانی خوا بەسەرتانەوە بژمێرن ناتوانن بیژمێرن، بە ڕاستی مرۆڤی (کافر)[1]، زاڵم و سپڵەیە".

خوای گەورە دەربارەی دووهەمیشیان ئەفەرموێ: (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُون* مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِين* مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ) (الروم: ٣٠ ـ ٣٢).

ڕوو بکەنە دینی ڕاستەقینە بەبێ ئەملاو ئەولا کردن، بە گوێی فیترەتتان بکەن، ئەو فیترەتەی کە خوا مرۆڤی لەسەر دروست کردووە، کەس ناتوانێ دینی خوا بگۆڕێ، ئەوەیە دینی ڕاگری خوا، بەڵام زۆربەی خەڵك ئەمە نازانن، تۆبە بکەن و بەرەو خوا بچنەوەو خۆتان لە عادزی ئەو بپارێزن و نوێژ بکەن و مەبنە (موشریك) ئەوانەی کە جیاوازی لە دیندا دروست ئەکەن و دەستە دەستە لێی ئەوەستنەوەو هەموو حیزب و پێڕێکیش دڵی بەوە خۆشە کە خۆی لەسەری ئەڕوات".

کەواتە زەوی و ئاسمانەکان و ڕۆژو شەو دەریاو هەواو.. هتد، ژێربارو (مسخر)ن و ئیرادەیان نییە، لە مرۆڤ یاخی بن، یان بێزار بن یان خزمەتی ئەم بکەن و هی ئەو نەکەن، بەڵکو هەموویان خزمەتکارو گوێڕایەڵن خۆ ئەگەر خوای گەورە ویستی هەرکامیان لەم مرۆڤە هەڵبگەڕێنێتەوە ئەوە ژیانی لێ تاڵ ئەکات.

کەچی لەملاوە مرۆڤی وا دروست کردووە ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی یاسای خوادا (فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُر)، (إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُمَّ إِلَى رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ) (الزمر: ٧).

(کێ حەز دەکات با ئیمان بهێنێ و کێ حەز دەکات با کوفر بکات). "ئەگەر خۆتان کافر بکەن، خوا پێویستی بە ئێوە نییەو ئەگەر سوپاسی خواش بکەن لێتان ڕازی ئەبێت و گوناهی کەسیش نادرێ بە کۆڵی کەسی ترداو پاشان هەمووشی ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ئەوکاتە هەواڵی هەموو کارەکانتان پێ ئەگەیەنێ، چونکە بە ڕاستی خوای گەورە زانایە بە ئەوەی لە سنگی مرۆڤەکاندا هەیە".

کە خوا بەرنامەی بۆ ئەم مرۆڤە هەبیت ئەبێت بیگەیەنێت پێی، ئێ خۆناشکرێ هەموو کەسێك خوا ڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە بکات و دینی خۆی پێ بڵێ، بۆیە لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا پەیوەندی بە چەند کەسێکەوە ئەکات و دینی خۆی ئەگەیەنێت پێیان و ئەیانکاتە پێغەمبەر ﷺ و فەرمانیان پێ ئەکات، ئەو دینە بگەیەننە خەڵکی تر، بۆ ئەوەش خەڵکی بڕوایان پێ بکەن چەند (معجزة)یەکیان ئەداتێ، ئەو پێغەمبەرانەش بە ئەمانەتەوە دینەکە ئەگەیەنن بە خەڵکی و ئەوەی عاقڵ بێت شوێنیان ئەکەوێت و بڕوایان پێ دێنێ و ئەوەشی نەگبەتی بێت یاخی ئەبێت و خۆی لە دین شێت ئەکات و گاڵتە بە دین و بە پێغەمبەرانیش ئەکات و هەشە هەوڵی کوشتن و کوژانەوەیان ئەدەن.. کۆتا پێغەمبەریش بریتییە لە حەزرەتی موحەممەد ﷺ و کۆتا دینی خوای پێ دراوە کە بیگەیەنێتە هەموو گرۆهی ئادەمیزاد ئەوەش قورئان گەورەترین موعجیزەیە،و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو ڕاست ئەکات، جا کێ ئیمان دێنێ با پیرۆزی بێت و کێش یاخی ئەبیت هەر پیرۆزی بێ بابزانین کێ زەرەر ئەکات.

(وَلاَ يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئاً).

(إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْكُفْرَ بِالإِيمَانِ لَن يَضُرُّواْ اللّهَ شَيْئاً وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (آل عمران: ١٧٧).

[1] (الانسان) لێرەدا لەفزێکی (عام)و بە مانای (خاص) دێت، واتە: ئەو مرۆڤەی لە جێگەی ئەوەی سوپاسی نیعمەتەکانی خوا بکات، نکولی لێ ئەکات و سپڵەیی ئەنوێنێ.. سەیری (مختصر تفسير الامام الطبري، ص ٢٦٠).

(وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْماً وَلَهْمُ عَذَابٌ مُّهِينٌ) (آل عمران: ١٧٨).

"خەفەت مەخۆ بەو كەسانەی كە لەناو كوفردا پێشبركی دەكەن، ئەوانە هیچ زیانێك بەخوا ناگەیەنن". "ئەوانەی كە ئەچن كوفر ئەكڕنو ئیمان ئەدەن لە جیاتیدا هیچ زیانێك بە خوا ناگەیەننو سزایەكی پڕ ئێشو ئازاریان بۆ ئامادەكراوە* با ئەوانەی خۆیان كافر ئەكەن وا حساب نەكەن تا مۆڵەتی زیاتریان بدەین لە دونیادا بۆ ئەوان باشەو خێرە، مۆڵەتدانی ئێمە بۆ ئەوان بەبێگومان بۆ ئەوەیە تا گوناهی زیاتر بكەن، (بیانوویان نەمێنێت) سزایەكی پڕ سوكایەتییان ئەدرێتێ".

كەواتە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) كاریان ئەوەیە كە ئەو سپاردەیەی لەلایەن خواوە بۆیان هاتووە بیگەیەننو هیچ دەخالەتێكی تریان نییە لە باسەكەدا (وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِين)، پێغەمبەران هیچیان لەسەر نییە ئەوە نەبێت بەڕوونی خەڵك ئاگادار بكەن..

(رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ).

واتە: پێغەمبەران مژدە دەرو ترسێنەرن تاكەس بیانووی بەسەر خواوە نەمێنێ پاش هاتنی پێغەمبەران!

(موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا)ش ﷺ، یەكێك بوو لەو پێغەمبەرانە نە خۆی ئاگای لەوەبووە ئەبێتە پێغەمبەر نە كەسی تریش، نە هەوڵی بۆ داوەو نە ئاواتی بۆ خواستووە، نە ئەگەر هەوڵیشی بۆ بدایەو ئاواتی بۆ بخواستایە دەستی ئەكەوت، چونكە پێغەمبەرایەتی (كەسب) ناكرێت وەك شتی تر بەڵكو پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردنی خوایەو بە دەستی مرۆڤەكان خۆیان نییە.

(وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيراً لِّلْكَافِرِين* وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ آيَاتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِين* وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (القصص: ٨٦ ـ ٨٨).

تۆ هیوای ئەوەت نەبووە كە كتێبی ئاسمانیت بۆ بێت، ئەوە سۆزی پەروەردگارتە بەرانبەرت، بۆیە هەرگیز پشتیوانی لە كافران مەكەو هۆشت بێ! بادوورت نەخەنەوە لە ئایەتەكانی خوا پاش ئەوەی دابەزیونەتە سەرتو خەڵك بانگ بكە بۆ لای پەروەردگارت، هۆشت بیٚ! نەبیتە (موشریك)و كەس لەگەڵ خوادا بانگ مەكە، چونكە خوا تاكو تەنیایەو هەرچی هەیە هەمووی تیا ئەچێت، تەنیا خوا نەبێت، بڕیار تەنیا هی ئەوەو گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای ئەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە مەككەداو لە ساڵی (فیل)دا لە دایك بووە، كە ئەكاتە ساڵی (٥٧٠) عیسایی، پێش ئەوەی لە دایك بێت باوكی ئەمرێت، پاش شەش ساڵ لە دایكبوونیشی دایكی ئەمرێت، ئەبوتالبی مامی ئەیباتە لای خۆیو بەخێوی ئەكات، كە تەمەنی ئەگاتە (بالغ بوون) لەگەڵ مامەیدا ئەكەوێتە ئێشكردنو سەفەركردن، كە متمانەی (كەسابەت) پەیدا ئەكات لەناو خەڵكدا، خەدیجە كە ئافرەتێكی ناودارو سەرمایەداری مەككە ئەبێت، لەبەر دەسپاكی موحەممەد ﷺ بڕێكی باش پارەو سامان ئەخاتە بەردەستی بۆ كاسبی كردن، كە موحەممەد بەخێرێكی باشەوە ئەگەڕێتەوە بۆ مەككە، خەدیجە پرسیار لە خزمەتكارەكەی كە ناوی (مەیسەرە)یە ئەكات كە لە سەفەرەكەدا لەگەڵ موحەممەد بووە، خزمەتكارەكە زۆر باسی عەقڵو دەستپاكیو بەڕێزی موحەممەد لای خەڵك ئەكات بۆ خەدیجە، خەدیجە كە ئەو كاتە تەمەنی لە (٤٠) ساڵاندا بووەو پێغەمبەر ﷺ لە دەوروبەری (٢٥) ساڵاندا بووە، سەرسامیو خۆزگەكانی دڵی ئەگۆڕێت بۆ خۆشەویستیو هیوای شوپیكردن، مێژوو ئەڵێ: خەدیجە هات هەستو خۆشەویستی خۆی بەرانبەر موحەممەد لای خوشكەكەی خۆی باسكرد. لە گێڕانەوەیەكی تردائەڵێ: لە لای (نەفیسەی كچی مونەییە) باسی كردوو ڕای سپارد كە بچێتە لای موحەممەدو ڕای وەربگرێ لەسەر هێنانی ئەو!،

(نەفیسە) ئەچێتە لای موحەممەدو پێی ئەڵێ: باشە بەنیازی ژنهێنان نیت؟ موحەممەد ئەڵێ: شتێکی وام بەدەستەوە نییە ژنی پێ بهێنم: (نەفیسە) ئەڵێ: باشە ئەگەرە یەکێك کە خاوەنی جوانیش و ماڵیش و بنەماڵەش بێت و هاوشان بەتۆ بێت و حەزیشت لێ بکات تۆ قەبووڵی ئەکەی؟ موحەممەد ئەڵێ: ئەوە کێیە؟ نەفیسە بەیەك دوو وشە وەلامی ئەداتەوەو ئەڵێ: خەدیجەیە! موحەممەد ئەڵێ: جا چۆن ئەوە ئەکرێ؟ (نەفیسە) ئەڵێ: ئەوە جێ بهێڵە بۆ من، نەفیسە کارەکەی ڕێکو پێك ئەکات و مامەکانی خەدیجەو مامەکانی موحەممەد بۆ کاری مارەبڕینەکە کۆ ئەکاتەوەو مارەکردنەکە ڕائەگەیەنێت و موحەممەد خەدیجە ئەگوازتەوەو خێزانێکی کامەران دروست ئەکات[1].

لەو ساڵانەدا قورەیش بڕیاریان هاتە سەر دروستکردنەوەی "کەعبە"و هەر تیرەیەك خەریکی دروستکردنی لایەکی کەعبە بوو، کە کۆکردنەوەی بەردو دروستکردنی ئەو لایە ئەرکی ئەو تیرەیە بوو بە تەنیاو تیرەیەکی تر ئەولاکەی ترو وە هەروەها، موحەممەدیش یەکێك بوو لەو خەڵکە، کە گەیشتە ئەوەی (بەردە ڕەشەکە) کام تیرە بیخاتە سەر بیناکە بوویە دەمەقاڵەیەکی گەورەو هەرتیرەیەك سەنگەری لەوی تر ئەگرت، موحەممەد پێشنیاری ئەوەی کرد کە گەورەی هەر تیرەیەك چمکی عەبایەك بگرێ و بەردەکە بخەنە ناوی تا هەمووان بەشداری ئەو ڕێزە بن و کەس لێی بێبەش نەبێت، ئەم پێشنیایەریان زۆر پێ پەسەند بوو، مێژوو دوو قسە ئەکات لەسەر تەمەنی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا: هەندێ ئەڵێن تەمەنی (٢٥) ساڵان بوو(أبی اسحاق)ی مێژوونووس ئەڵێ: (٣٥) ساڵان بوو، هەرکامیان بێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موحەممەد خاوەنی ڕێزو حورمەتی تایبەت بووە لەلای هەموو تیرەو تایەفەکانی ئەو سەردەمەو ئەو شوێنە لەو تەمەنەکەمەیدا.

خوای گەورە کەم کەم موحەممەدی سازو ئامادە ئەکرد بۆ ئەوەی پەیامو ئاخرین دینی خۆی پێدا بنێرێ بۆ مرۆڤایەتی، بۆیە نایە دڵیەوە کە جار جارە گۆشەگیری بکات، لەو کۆمەڵگەیەو بچێتە شوێنێکی چۆڵ و لە قرەقرو گاڵەی خەڵکی خۆی دوور بگرێت کە ئەوە لە دوولاوە بۆی بەسوودە، یەکەمیان بیرو هۆش و دڵی تازە ئەبێتەوەو ژەنگی هەراو موناقەشەی لەسەر کاروباری دونیای لێ ئەبێتەوەو لەلایەکیشەوە خەڵکی بە چاوێکی ترەوە بۆی ئەڕوانن[2].

لە تەمەنی (٤٠) ساڵیداو لە کاتێکدا کە لە ئەشکەوتی (حراء)دا ئەبێت حەزرەتی (جوبرئیل) بە فەرمانی خوای گەورە دێتە لای موحەممەدو پێی ڕادەگەیەنێت کە خوا بڕیاری داوە بتکاتە پێغەمبەرو ئەبێت هەستی بە گەیاندنی ئەوەی خوای گەورە بۆتی ئەنێرێ و سورەتی (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ)ی بۆ ئەخوێنێتەوەو پێی لەبەر ئەکات، پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئەگەرێەوە بۆ ماڵ زۆر بیر لەو دیمەنانە ئەکاتەوە کە لە ئەشکەوتەکەدا نیشانی دراوە، بۆیە بە خەدیجە ئەڵێ: جێگەیەکم بۆ داخەو دام پۆشە، خەدیجە ئەڵێ: وتم هیچ شتێکی تازە ڕوویداوە؟ موحەممەد مەسەلەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی بە تەواوەتی سەری لە مەسەلەکە دەرنەئەچوو، وای گومان ئەبرد ئەوە ڕووداوێکی ناخۆشبوو بیت و بەسەریدا هاتبێ[3]، بەلام خەدیجە وتی: ئامۆزاگیان، مژدەبێت و دڵت خۆش بێت، بەو کەسەی نەفسی خەدیجەی بەدەستە هیوا ئەکەم کەبوبیتە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە، سوێند بەخوا

---

[1] حیاە محمد/ محمد حسین هیکل، ص ١٢١ ـ ١٢٢.

[2] محمد حسین هیکل لە (حیاة محمد)دا ئەڵێ: "لەناو عەرەبەکاندا لە کاتی خۆی باوێك هەبووە کە (عابد)و پیاوی بەئەزموونیان لە ساڵدا چەند جارێك خۆیان گۆشەگیر کردووەو تێکەڵی خەڵك نەبوون، عیبادەتی خواکانیان کردووەو هیوایان وابووە کە تووشی خێرو دانایی ببن".

[3] محمد حسین هیکل، ئەڵێ: هەندێ لە ڕیوایەتەکان ئەڵێن: لە خەودا سورەتی (الخلق)ی پێ ئەخوێنێ و پێی لەبەر ئەکات. هەندێکیش ئەڵێن: هەر لەکاتی بەخەبەر بووندا بووە. ص ١٣٣.

هەرگیز خوا تۆ ڕیسوا ناکات، تۆیەك خزمایەتی بفامی وڕاستگۆ بیت و باری هەژارانت بە کۆڵەوە بێت، میوان پەزیر بیت، هاوکاری هەموو لێقەومانێك بیت، چۆن خوا ڕیسوات ئەکات؟!

پێغەمبەر ﷺ بە جۆرێك لە دڵنیاییەوە خەوت و خەدیجەش لەولاوە کەوتە ناودەریای بیرکردنەوەو دیمەنەکەو سورەتی (العلق)و قسەکانی گشتی ئەهێنایەوە بەرچاوی خۆی تا زیاتر لەمەسەلەکە دڵنیا بێت، کە سەری زۆر لێ دەرنەئەچوو بڕیاریدا بچێتە لای یەکێك کە شارەزایی لەو مەسەلانەدا هەبێ، بۆیە یەکسەر خۆی نا بە ماڵی (وەرەقەی کوڕی نوفل)ەوە، کە خزمێکی نزیکی خۆی بوو، کاتی خۆی ببوە نەصرانی و لە ئینجیلدا شارەزایی هەبوو، خەدیجە هەموو مەسەلەکەی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوەو زۆر تکای کرد کە ڕاستی مەسەلەکەی پێ بڵێ و لێی نەشارێتەوە (چونکە خەدیجەش ترسی ئەوەی بوو کە مێردەکەی شتێکی خراپی بەسەر هاتبێ)، وەرەقە پاش ئەوەی ورد گوێی بۆ گرت، وتی: قدوس قدوس! بەو کەسەی گیانی وەرەقەی بەدەستە، ئەگەر ئەمانەت بەڕاستی بۆ گێڕابێتمەوە خەدیجە! ئەوە "نامووسی هەرە گەورە"[1]، کە ئەهاتە لای (موسا) هاتووەتە لای ئەویش و بووە بە پێغەمبەری ئەم ئوممەتەو بڕۆرەوەو دڵنیای بکەرەوەو پێی بڵێ: خۆڕاگر بێت، کە خەدیجە گەڕایەوە سەیری کرد پێغەمبەر ﷺ هێشتا هەر لە خەودایەو هەڵنەساوە، بەهێمنییەکەوە لەپاڵ سەریدا دانیشت و پاش کەمێ سەیری کرد ناوچاوی پێغەمبەر ﷺ عارەق ئەکات و دەمی ئەجوڵێنێ، کە خەبەری بوویەوە خەوەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوەو فەرمووی: ئەو کەسە لە ئەشکەوتی (حراء)دا هاتە لام ئێستاش لە خەودا هاتە لام و ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندم (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ* قُمْ فَأَنذِرْ* وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ* وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ* وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ* وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ* وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ) (المدّثر:١ ـ ٧).

خەدیجە وتی: ڕاکشێوەو پشوویەك بدە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "کاتی خەوو پشوودان نەما خەدیجە، ئەوە جوبرەئیلەو فەرمانی خوای بۆ هێناوم کە ئەبێت بکەومە بانگ کردنی خەڵك بۆ لای خوا"[2]. خەدیجەش بۆ زیاتر دڵنیایی باسی چوونەکەی خۆی بۆ لای وەرەقە بۆ کردو قسەکانی ورەقەشی بۆ گێڕایەوەو خەدیجە ڕای گەیاند کە ئەو بڕوای بە پێغەمبەرێتی ئەم کردووەو ئامادەی گوێڕایەڵی خوایە لەمەودوا.

ماوەیەك بەسەرچوو "سروش" نەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ، چ پێغەمبەر ﷺ خۆی و چ خەدیجەش گومانی ئەوەیان بۆ دروستبوو کە خوا (جل جلاله) لە پێغەمبەر ﷺ بەهۆیەکەوە لێی عاجز بووبێت، ئیتر ئەوە ئەوەڵ و ئاخیری پەیوەندی خوا بووبێت بە پێغەمبەرەوە، بۆیە زۆر دڵگران بوو، تووشی ڕاڕایی هات و زوو زوو ڕێ ئەکەوتەوە ئەشکەوتەکەو لەخوا ئەپاڕایەوە کە ڕاستی مەسەلەکەی بۆ دەربخات، ئەوەبوو حەزرەتی جوبرەئیل سورەتی (الضحى)ی بۆ هێنا کە یەك پارچە دڵنیایی و ڕێزو بەرەکەت بوو بۆی، وەك ئەفەرموێ (وَالضُّحَى* وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى* مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى* وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى* وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى* أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى* وَوَجَدَكَ ضَالّاً فَهَدَى* وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى* فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ* وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ* وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ) (الضحى: ١ ـ ١١). (سبحان الله) لە وردی و پڕمانایی ئەم ئایەتانە، دوو سوێند لە پێش دوو هەواڵدا بە دوایدا دوو پەیمان، بە دوایاندا سێ یادگاری و سێ خەڵات، بەدوای ئەو سێ بیرەوەریی و سێ خەڵاتەدا، سێ حاڵەت و سێ فەرمان.

| | |
|---|---|
| ـ وَالضُّحَى* وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى | دوو سوێندەکە. |
| ـ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى | دوو هەواڵەکە. |
| ـ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى | پەیمانی یەکەم. |
| ـ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى | پەیمانی دووەم. |

[1] ئەهلی کیتاب بە جوبرەئیل ئەڵێن (الناموس الاكبر) واتە/ خاوەنی نهێنی هەرە گەورە (ارشاد الساري: ١/٦٥).
[2] حياة محمد/ هيكل، ص ١٣٧.

. أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى		بیرەوەریی یەکەمو خەڵاتی یەکەم.
. ووَجَدَكَ ضَالّاً فَهَدَى		بیرەوەریی دووەمو خەڵاتی دووەم.
. ووَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى		بیرەوەری سێیەمو خەڵاتی سێهەم.
. فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَر		حاڵەتی یەکەمو ئەرکی یەکەم.
. وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ		حاڵەتی دووهەمو ئەرکی دووەم.
. وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ		حاڵەتی سێهەمو ئەرکی سێیەم.

جا سەیر لەو بەراوردکارییە:

. بێ باوکی خۆی (بیرەوەرییە) ئەبێ بێ باوکانی لەبیر نەچێت هەرگیز.

. بێ ئاگایی لە دینی ڕاستەقینە، (بیرەوەرییە) ئەبێ خەڵکی دوور لەدینی لەبیر نەچێو وەڵامیان بداتەوە.

. هەژاریو بێ نانی (بیرەوەرییە) نابێ نیعمەتی خوا لەکەس بشارێتەوە.

کەواتە ئەبێ پێغەمبەر ﷺ

. لانەی هەتیوان بێت.

. مەشخەڵ هەڵگری ڕێگەی هیدایەت بێت بۆ خەڵکانی دوور لە دین.

. هەمیشە ئەوە بەبیر خەڵکی بێنێتەوە کە ئەوان لە ژێر باری نیعمەتی خوای گەورەدان.

زۆر لەم وردەکارییانەی سورەتی (والضحى) وردبوومەوە سەیرم کرد هەموو سوورەتەکە ئەبێتە (١٨) بڕگە، سێ دوو بڕگەی کە هەموو یەك ڕستە دروست ئەکەن، دوو سێ بڕگەی کە ڕستەیەکی تر دروست ئەکەن، دیسان دوو سێ بڕگەی تر کە ڕستەیەکی تر دروست ئەکەن.

سێ دوو بڕگەی یەکەم (دوو سوێندو دوو هەواڵو دوو پەیمان) دوو سێ بڕگەی یەکەم (سێ بیرەوەریو سێ خەڵات) دوو سێ بڕگەی کۆتایی (سێ حاڵەتو سێ فەرمان).

ڕستەی یەکەمی (شەش بڕگەی پێشوو) یەك ڕستەیە (پیاوێکی دڵنیا لە خۆیو لەخوای خۆی).

ڕستەی دووهەمی (شەش بڕگەی دواتر) یەك ڕستەیە (پیاوێکی کامڵو پڕچەك بە سامانو بە زانیاریی).

ڕستەی سێهەمی (شەش بڕگەی کۆتایی) یەك ڕستەیە (پیاوێکی ئیشکەرو تێکۆشەر).

ئەگەر ئەنجامی ئەو هەژدە بڕگەیە ورد بکەیتەوە ئەبێتە سێ سیفەتی پێویست بۆ پێغەمبەر ﷺ.

١. متمانە بوون.

٢. کامڵبوون.

٣. نەسرەوتن.

کە هەریەکەیان سێ مەیدان ئەگرێتە خۆی (متمانەبوون بە خۆی، بەخوا، بە هەوادارو خەڵکەکەی)، (کامڵبوون لە ڕووی عەقڵیو ماڵیو نفوزەوە)، (نەسرەوتن لە خزمەتکردنی خەڵکو گەیاندنی دینو عیبادەتکردنی خوادا).

ئایەتەکانیش هەموو ئەوانەی تێدایەو سروشتییە کە پێغەمبەر ﷺ لە هەمووی حاڵی بووبێو پێڕەوی لێ کردبێ.

پاش ئەم سورەتی (والضحى)یە ئیتر ئایەتەکانی قورئان بەردەوام دائەبەزیینە سەر پێغەمبەر ﷺ ئەویش ئەوەی دەمی پێی دەگەیی لە خەڵکی دوورو نزیك ئاگاداری ئەکردنەوە لەو ئایەتانە..

پێغەمبەر ﷺ خۆیو خەدیجەو کچەکانیو عەلی کە هەر بە منداڵی هێنابوویە لای خۆی پێکەوە هەموو جارێ نوێژیان ئەکردو خەڵکی سەیری دەکردن، کەم کەم بازنەی هەوادارانی ئیسلام فراوانتر ئەبوو لە خانەوادەی پێغەمبەرەوە ﷺ گەیشتە ئەبوبەکرو بەبۆنەی ئەبوبەکرەوە عوسمانو پاشان عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفو

تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵاو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس‌و زوبێری کوڕی عەوام‌و پاشان پۆلێکی تری وەك ئەبوعوبەیدی کوڕی جەراح و کیٚ و کیٚ هاتنە سەر دینی ڕاگەیەنراو.

زانایانی مێژووی ئیسلامی ئەڵێن: پیاوەتی‌و ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر ﷺ ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە بەدەمەوەهاتنی خەڵکدا بۆ ئاینەکەی[1].

بەڵام هەر ئەوەندەی کە سەرمایەدارو خاوەن بەرژەوەندییە بەرتەسکەکان زانییان ئەم دینە سەری لە خێرەوە دەرناچێ بۆ ئەوان، چونکە موڵکایەتی بڕیارئەدات بۆ هەموو کەسێ با کۆیلەو ژن‌و منداڵ‌و بیٚ نەواش بێ، ئەوان یەکسان ئەکات بە هەموو کەسێکی تر لە بناغەی دروستبونیانداو هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا ناهیڵێ‌و لەبەردەم دین‌و شەرعدا هەموویان لە (ماف)و (ئەرك)دا یەکسان سەیر ئەکات، بڕیارەکان ئەگەڕێنێتەوە بۆ لای خوا نەك بۆ لای ئەوان..

بۆیە کەوتنە دژایەتی کردن‌و ئازاردانی شوێنکەوتووەکانی، سیٚ ساڵ بەسەر ئەم بانگەوازەدا ڕۆشت‌و پێغەمبەر ﷺ خەڵکی بە ئاشکرا لە ناو جەماوەردا بانگ ئەکرد بۆ لای ئیسلام، یەکسەر قورەیش کەوتنە خۆمەحکەم کردن تا تیشك‌و ڕووناکی ئەم دینە نەیانبڕێت‌و دەسەڵاتی زاڵمانەیان لە چنگ دەرنەهێنێ، بۆیە بە چەند ڕێگە کەوتنە دژایەتی کردنی ئیسلام‌و پێغەمبەر ﷺو شوێنکەوتەکانی.

لەو جۆرانە:

یەکەم: هەوڵدان بۆ (بێلایەنکردنی) ئەبوتالب‌و خێڵەکەی لە شەڕەکەدا تا ئەم ئاینە بیٚ دەست‌و چرنوك بێت، لە پێشەوە وتمان قورەیش ئەبوتالبیان نارده لای پێغەمبەر ﷺ تا ڕێبکەویٚ لەگەڵیداو واز لە بانگەشە بۆ دینی ئیسلام بهێنێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی مامی بەڕێزم، بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ڕۆژ بخەنە دەستی ڕاست‌و مانگیش بخەنە دەستی چەپم، بۆ ئەوەی واز لەم دینە بهێنم وازی لیٚ ناهێنم، تا یان خوا سەرم ئەخات، یان سەرم لە پێناویدا دائەنێم، تەنانەت ڕیوایەتەکەی (ابن كثير)[2] ئەڵێ: (فظن رسول الله ﷺ أنه بدأ لعمه بدو وانه خاذله ومسلمه وانه قد ضعف عن نصرته).

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەو گومانەی بۆ دروست بوو کە مامەی هەڵوێستی گۆڕاوەو لەوانەیە پشتی بەربدات‌و تەسلیمی کافرانی بکات‌و توانای سەرخستنی نەمابێت.

لە هەندیٚ ڕیوایەتدا ئەڵێ: قورەیش (عەممارە)ی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەیان برد بۆلای ئەبوتالب‌و پێیان وت: ئەبوتالب خۆت ئەزانی جوانخاسترین لاوی ئەم تایەفە بریتییە لە (عەممارە) ئێمە تەسلیمی تۆی ئەکەین‌و بیکە بە کوڕی خۆت[3] و خوێن‌و گشت سوودەکانی بۆ تۆ، تۆش ئەو برازایەی خۆتمان تەسلیم بکە کە ئاژاوەی دنیای خستووەتە ناومان‌و پێچەوانەی دینی تۆش‌و باوو باپیرانیشت ئەکات‌و گاڵتەی بە عەقڵمان دیٚ، با بیکوژین، پیاوێك بە پیاوێك، ئەبوتالب وتی: بەڕاستی قەڵبترین مامەڵەتان پێیە بۆم، منداڵێکی خۆتانم ئەدەنیٚ بۆ تانی بەخێو بکەم‌و قەڵەوی بکەم‌و منیش منداڵێکی خۆمتان بدەمیٚ بیکوژن؟! سوێند بەخوا هەرگیز شتی وا نابینن لێم[4].

---

[1] هيكل . ص١٤١، حياة محمد.

[2] البداية والنهاية، (٤٩/١).

[3] لەناو عەرەبەکاندا باوێك هەبووە کاریان پیٚ ئەکرد پێی ئەوترا "بە کوڕ کردن = التبني" هەموو کەسێك ئەیتوانی هەرکەسی بویستایە بیکردایە بە کوڕی خۆی، ئیسلام هات ئەم باوەی هەڵوەشاندەوە بە ئایەتی (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ).

[4] السيرة النبوية/ الصلابي (٢٦٩/١).

ئەم ئیستیفزازکردنەی ئەبو تالب گەیشتە ڕادەیەك سوێندی خوارد بە هەرچی شتی پیرۆز هەیە لای قورەیش، کە ئەوەی دەستی ناڕەوا بۆ پێغەمبەر ﷺ درێژ بکات ئەم خۆیو عەشیرەتەکەی لە سەر دائەنێ، تەنیا لەبەر (خزمایەتیو کەللەی عەشایەریش بوو نەك لەبەر ئەوەی چوبێتە سەر دینەکەی).

دووەم: هەوڵدان بۆ ناشیرین کردنی پێغەمبەر ﷺو ئیسلام لە لای خەڵك.

قورەیش گەورەترین شاڵاوی ناشیرینکردنیان ڕاگەیاندو دژ بە پێغەمبەر ﷺو ئیسلام..

وەلیدی کوڕی موغیرە کە پیاوێکی دەمڕاستو قسە ڕۆیشتووی ناو قورەیش بوو، لە دانیشتنێکدا کە قورەیش لە کەعەبەدا کردی، پێش هاتنی کاتی حەج.. وەلید هەستایەوەو وتی: خزمانی قورەیش! ئەوە کاتی حەج کردن هاتووەو نوێنەرانی هەموو عەرەب دێنە شارەکەتانو دەنگو باسی ئەم کابرایەش (مەبەستی پێغەمبەر بوو ﷺ) گەیشتووە بە خەڵکی، جا تکا دەکەم، با یەك ڕاو یەك قسەبین لەسەریو هەریەکەی قسەیەك نەکاتو ئەم ئەو بەدرۆ بخاتەوەو ئەم قسەی ئەو ڕەت بکاتەوە..

وتیان دەی (ئەبا عبد الشمس) تۆ قسەیەك بکەو با هەمووان هەر ئەوە بڵێین.

وتی: نا، ئێوە جارێ ڕای خۆتانم پێ بڵێن.

وتیان: با بڵێین "کاهین"ە[1].

وتی: نا "کاهین" نییە، چونکە من کاهینم بینیوەو ئەوەی ئەم نە چفە چفی کاهینەو نە داڕشتنی دوا پیتی ئەوانیشە.

وتیان: با بڵێین "شێتە".

وتی: شێتیش نییە، هەموومان شێتمان بینیوە ئەم نە جنۆکە دەست ئەنێتە ملیو نە وڕێنەو سوەسەشی پێ ئەکات.

وتیان: با بڵێین شاعیرە.

وتی: شاعیریش نییە، هەموومان شعر ئەناسینو ئاگامان لە هەموو وەزنەکانو بەحرەکانی هەیە.

وتیان: با بڵێین جادووگەرە (ساحیرە).

وتی: جادووگەریش نییە، جادووگەرو جادووشمان بینیوە، ئەم لە کەسیان ناچێ، نەفوو ئەکات بە شتداو نە گرێ ئەدا لە دەزوو.

وتیان: دەی باشە ئەبو شەمس چی بڵێین باشە؟

وتی: وەڵڵاهی تا بڵێی قسەکانی شیرینە، بناغەی قسەکانی وەك ڕەگی دارخوماو لق و پۆپەکانیشی وەك بەری دارخورما وایە، هەرچی بووترێ دەربارەی، خەڵکی ئەزانێ کە چەواشەکاریو بەتاڵە، بەڵام نزیکترین قسە ئەوەیە بوترێ، جادووگەرەو ژن لە پیاو جیا ئەکاتەوەو منال لە باوكو برا لە براو ڕۆڵە لە عەشیرەتەکەی ئەکات[2].

ئەوەبوو خوای گەورە وێنەیەکی ئەم دیمانەیەی لە قورئاندا تۆمار کرد، بۆ ئەوەی تاقیامەت بخوێنرێتەوەو ببێتە پەند بۆ ئەوانەی وا ئەزانن بە ڕاگەیاندنی چەواشە ئەتوانن ئیسلامو ئەهلی ئیسلام لەکەدار بکەن، ئەگەر ناووناتۆرەو شتی ناشیستەو ناجوان بدەنە پاڵیان، (ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً* وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَّمْدُوداً* وَبَنِينَ شُهُوداً* وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيداً* ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ* كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيداً* سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً* إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ* فَقُتِلَ كَيْفَ

---

[1] کاهن: بەو کەسانە وتراوە لەناو عەرەبکاندا کە دەمیان لە غەیب کوتاوەو باسی شتی داهاتوویان کردووە، جۆرێك لە پیرۆزییان هەبووە لە ناو خەڵکیدا.

[2] السيرة النبوية/ الصلابي ١/ص٢٧٣.

قَدَّرَ* ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ* ثُمَّ نَظَرَ* ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ* ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ* فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ* إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ* سَأُصْلِيهِ سَقَرَ) (المدّثر: ١١ ـ ٢٦).

سێیەم: ئەشکەنجەدانی پێغەمبەرو یارانی" قورەیش کەوتنە شەڕی ڕووبەڕوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺو یارانیداو بەتایبەت ئەوانەیان کە بێ کەس‌و بێ نەوابوون، ئازاردانی قورەیش بۆ یارانی پێغەمبەرﷺ گەیشتە ئەو ئاستەی زۆرێك لە یارانی هاواریان لێ بەرز بوویەوەو هانایان برد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ڕێگە چارەیەکیان بۆ بدۆزێتەوە..

(ابن كثير) لە کتێبی (البداية والنهاية)[1]دا ئەڵێ: "بوخاری ئەڵێ: خەباب ئەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوو، ئەشکەنجەدانی قورەیشیش تینی بۆ هێنابووین، عەرزم کرد ئەری قوربان ئەوە لەخوا ناپاڕێیتەوە بۆمان؟! پێغەمبەر ﷺ دەموچاوی سور هەڵگەڕاو دانیشت‌و فەرمووی: کەسانی پێش ئێوە لەشیان بە شانەی ئاسن دائەهێنران‌و ئەگەیشتە گۆشت‌و دەمارو ئێسقانیان، کەچی هەروازیان لە دینەکەیان نەئەهێنا، هەیانبوو مشار ئەخرایە تەوقەسەرییان‌و ئەیانبڕینەوەو ئەیانکردن بە دوو کەرتەوە، هەروازیان لە دینەکەیان نەئەهێنا، بێگومان بن خوا ئەم دینە سەر ئەخات‌و ئەیگەیەنێتە ئەنجام‌و ئەوەندەش هێمنی‌و ئاسایش بال بەسەر خەڵکیدا ئەکێشێ سوار لە (صنعاء)ەوە بۆ (حضرموت) ئەڕوات، بە تەنیا لە خوا نەبێت لەکەس ناترسێ"، لە ڕیوایەتێکی تردا زیادەیەکی هەیە ئەڵێ: "هەروەها لە گورگ کە مەڕەکانی بخوا"، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەڵێ: پێغبەر ﷺ ئەمەشی فەرمووە: "بەڵام ئێوە پەلە دەکەن".

نووسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ باسێکی درێژ ئەکەن دەربارەی چۆنێتیی ئازاردانی قورەیش بۆ تاکە تاکەی یارانی پێغەمبەر ﷺ هەرکەس ویستی با بگەڕێتەوە بۆ (البداية والنهاية)ی (ابن كثير)، بۆ نموونە باسەکانی (فصل في مبالغتهم في الاذية لاحاد المسلمين المستضعفين)، (بەرگی سێ، لاپەڕە ٤٩ تا ٥٧)، هەروەها لە (فصل في أذية المشركين لا حاد المسلمين المستضعفين)، (هەمان بەرگ، لاپەڕە ٥٧ ـ ٦٠). ئازاردانی قورەیش بۆ یارانی پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ڕاددەی تاقەت پڕوکێن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆ دەرکردنیان لەو ئەشکەنجەدان‌و ئازاردانە فەرمووی (لو خرجتم الى ارض الحبشة، فأن بها ملكا لايظلم عنده أحد، وهي أرض صدق حتى يجعل الله لكم فرجا ممأنتم فيه)[2].

ئەوەبوو بە دانەدانەو کۆمەڵ کۆمەڵ، ڕێگەی کۆچیان گرتە بەر، ئیمامی بەیهەقی ئەفەرموێ: ئەنەس ئەفەرموێ: "عوسمانی کوڕی عەفان‌و ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ کە خێزانی بوو یەکەم کەس ئەو ڕێگەیان گرتە بەر بەرەو حەبەشە، ماوەیەك هەواڵیان نەبوو، پێغەمبەر ﷺ دڵی داخوڕپا، تا ئافرەتێکی قورەیشی هەواڵی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺو وتی: "موحەممەد، زاواکەتم لە ڕێگەدا بینی لەگەڵ ژنەکەیدابوون پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حاڵیان چۆن بوو؟! ئافرەتەکە وتی: ژنەکەی سواری کەرێك کردبوو، خۆیشی ڕەشمەکەی ڕادەکێشاو بارێکی قورسیشیان پێبوو.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا یارو یاوەری هەردووکیان بێت، عوسمان یەکەم کەسێکە دوای (لوط) پێغەمبەر لەگەڵ خێزانەکەیدا کۆچ بکات"[3].

(ابن كثير) درێژەی ناوی ئەو کەسانە ئەهێنێ کە هیجرەتیان کرد بۆ حەبەشە، لە پیاوان‌و لە ژنانیش[4]. ئیبن ئیسحاق ئەڵێ: "هەموو ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، بە ژن‌و پیاوو مناڵەوە بریتیبوون لە (٨٣) کەس ئەگەر عەمماری کوڕی یاسریشیان لەگەڵدا حساب بکرێت"[1].

---

[1] (٣/٥٩).

[2] البداية والنهاية، (٣/٦٦).

[3] رواه البيهقي في دلائل النبوة: (٢/٢٩٧).

[4] البداية والنهاية (٣/٦٦، ٦٧، ٦٨، ٦٩).

قورەیش زۆر هەوڵیدا ئەم کۆچەکەرانە بگێڕێتەوە، نەجاشی "حەصانە"یان لێ بسەنێتەوە، بەڵام دیاربوو لە ڕاستیدا "نەجاشی" کە (شا)ی حەبەشە بووە بەو شێوەیە دەرچووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی: حەبەشە ئەو پارچە زەویەیە کە ڕاستی تێیدا ئەخوات، پاشایەکی لێیە کەس لای ئەو ستەممی لێ ناکرێت.

(ئیبن عەساکیری فەرمووەزان) ئەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر لە زمانی جەعفەری باوکیەوە ئەڵێ: قورەیش عەمری کوڕی عاص و عەمماری کوڕی وەلیدی بە دیارییەکی زۆری ئەبوسوفیانەوە نارده لای (نەجاشی) کە هاتنە ژوورەوە ئێمەش لای نەجاشی بووین، وتیان بە نەجاشی: کۆمەڵێك کەسی گێل و سوك و سەلیمان هاتوونەتە وڵاتەکەی تۆ، داواکارین تەسلیممان بکەیتەوە، نەجاشی وتی: نەخێر شتی وا نابێت، تا گوێ بۆ ئەوانیش نەگرم! ناردی بە شوێنمانداو کۆبووینەوە لای نەجاشی، لێی پرسین: ڕاتان چییە لە قسەی ئەمانە؟ ئێمەش وتمان: ئەمانە گەلێکی بتپەرستن، خوای گەورەش پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین لە خۆمان، بڕوامان پێی هێناوەو پێڕەویشی لێ دەکەین، نەجاشی وتی: ئەمانە کۆیلەی ئێوەن؟ وتیان نەخێر، وتی: ئەی قەرزتان لای کەسیان هەیە؟ وتیان: نەخێر. وتی: دەی کەواتە وازیان لێ بهێنن، (عەمر)و (عەممار) لای نەجاشی هاتنە دەرەوەو پاشان گەڕانەوە بۆ لای نەجاشی وتیان: ئەمانە قسەی ناشایستە دەربارەی (عیسا) ئەکەن کە پێچەوانەی ڕاونبۆچوونی ئێوەیە! نەجاشی وتی: ئەگەر وابێ شتێ بڵێین دەربارەی عیسا کە من نەیڵێم، ئەوە نایەڵم یەك سەعات چییە لەم زەوییە بمێنن.. جارێکی تر ناردیانەوە بەوشێمانداو ئەمجارەش وەك جاری یەکەم دڵمان داخورپا، نەجاشی وتی: ڕێبەرەکەتان دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم چی دەڵێ؟ وتمان: ئەڵێ، عیسا ڕوحی خوایەو ئەو وشەیەیە کەفرێی داوەتە ناو مەریەمی داوێن پاکی کچە عازەب.. نەجاشی وتی: ئا بڕۆن فلانە قەشەو فلانە ڕاهیبم بۆ بانگ بکەن، هەندێ کەس هاتنە خزمەتی و نەجاشی لێیانی پرسی: ئێوە چی دەڵێن دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم، وتیان: قوربان جەنابت لە هەمووومان زیاتری، خۆت چی ئەفەرمووی؟ نەجاشی دانەوییەوەو پارچە پووشێکی لە زەویەکەدا هەڵگرت و وتی: ئەوەی عیسا ئەیڵێ و ئەوەش ئێوە ئەیڵێن بە ئەندازەی ئەم پووشە جیاوازییان نییە! پاشان ڕووی کردە ئێمەو وتی: کەس ئازارتان ئەدات؟ وتمان بەڵێ. بڕیاریداو وتی: هەرکەس ئازاری ئەمانە بدات چوار درهەم غەرامەی لێ بسەنن، پاشان وتی: بەڕای ئێوە ئەوەندە بەسە؟ وتمان: نەخێر قوربان، کردیە دوو ئەوەندە. جەعفەر ئەڵێ: کە پێغەمبەریش ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو خوا لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تری ئەبرد، چووینە لای نەجاشی و وتمان: قوربان: پێغەمبەری خوا ﷺ خوا زاڵی کردووەو کۆچی کردووە بۆ مەدینەو هەموو ئەوانەی کە بۆمان باس کردی ئێستا تیاچوون، ئێمەش بەنیازین بچینەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، گێڕانییەوەو وتی: زۆرباشە! هەستا ماڵ و تفاقێکی باشی بۆ ئامادە کردین و وتی: هەواڵم بگەیننە ڕێبەرەکەتان و عەرزی بکەن چیم بۆ کردوون ئەمەش نوێنەری منە لەگەڵتان ئەینێرم، ئەوەش بزانن منیش شایەتی ئەدەم کە تەنیا یەك خوا هەیە ئەویش (ئەڵڵایە)و موحەممەدیش پێغەمبەرو فوروستادەی خوایە، عەرزی بکە با لەخوا بپاڕێتەوە تا لیم خۆش بێت، جەعفەر ئەڵێ: حەبەشەمان بەجێهێشت و گەیشتینە مەدینەو پێغەمبەر ﷺ باوەشی پێدا کردم و فەرمووی: نازانم بە کامیان خۆشحاڵ بم، بە گەڕانەوەی جەعفەر یان ڕزگارکردنی خەیبەر، (چونکە ئەوساتانە فەتحی خەیبەریان کردبوو)، پێغەمبەر ﷺ دانیشت و نوێنەرەکەی نەجاشی وتی: قوربان ئەوە جەعفەرە پرسیاری لێ بکە ڕێبەرەکەی ئێمە چۆن بووە لەگەڵیاندا، جەعفەر ئەڵێ: بەڵێ باشترین مامەڵەی لەگەڵدا کردوین، ئاوەهاو ئاوەها بووە لەگەڵماندا، پاشان ئەم هەموو تفاق و زەخیرەشی بۆ پێچاوینەتەوەو شایەتی ئەوەشیدا کە تەنیا یەك خوا هەیە ئەویش زاتی (اللە)یەو تۆش پێغەمبەری خوایت، ئەوەشی پێ وتین کە عەرزی جەنابت بکەین دوعای بۆ بکەیت و لەخوا بپاڕێیتەوە کە لێی خۆش بێت، پێغەمبەر ﷺ هەستایە سەرپێ و دەستنوێژێکی گرت و دەستی کردە دوعاکردن و سێجار فەرمووی (اللهم اغفر

[1] هەمان سەرچاوە (٦٩/٣).

للنجاشي) موسڵمانەکانیش هەموویان وتیان: ئامین.. پاشان جەعفەر ئەڵێ: وتم بەنوێنەرەکەی نەجاشی دەی ئیتر تۆ خوات لەگەڵ‌و بگەڕێوە بۆلای ڕێبەرەکەت و چیت دیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیگێڕەرەوە بۆیان"[1]. لە یەکێك لەو دانیشتنانەدا نەجاشی جەعفەرو هاوەڵەکانی بانگ کردوو داوای لێکردن حەقیقەتی ئەم دینەی خۆیانی بۆ باس بکەن، ئەوەبوو وتی: "ئەم دینە تازەی ئێوە چییە وا دەستبەرداری دینی باوو باپیرانتان بوون‌و نەبوونەتە (نەصرانی)‌و نەبوونەتە (یهودی)ش؟".

جەعفەر فەرمووی: "پاشای بەڕێز! ئێمە گەلێکی موشریك‌و بت پەرست بووین، شتی مردارەوەبوومان ئەخواردو بۆ دەرو دراوسێ خراپ بووین‌و هەندێکمان خوێن‌و شتی تری ئەومانی بە حەڵاڵ ئەزانی بۆ خۆی، حەڵاڵمان بە حەڵاڵ نەئەزانی‌و حەرامیشمان بە حەرام نەئەزانی، خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین لە خۆمان باش باش وەفاداری‌و ڕاستگۆیی‌و دەستپاکی ئەناسین، بانگی کردین بۆ لای خواو پێی وتین تەنیا ئەو خوایە بپەرستین‌و شەریکی بۆ بڕیار نەدەین، بەڕەحم بین بەرامبەر خزم‌و خوێشەکانمان، چاك بین بەرانبەر دەرو دراوسێمان‌و نوێژ بکەین بۆ خواو ڕۆژووی بۆ بگرین‌و بێجگە لە ئەو نەپەرستین. (ئیبن ئیسحاق) ئەڵێ: جەعفەر فەرمووی: بۆ لای خوا بانگمان ئەکات‌و ئەڵێ: خوا بەتاك‌و تەنیا ڕابگرن‌و عیبادەتی بۆ بکەن، خۆتان لە هەموو ئەو عیبادەتانە دابڕن کە باوو باپیرانتانی لەسەر بووە چ بتپەرستی و چ شەخص پەرستی، فەرمانمان پێ ئەکات کە ڕاستگۆ بین لە قسەکردنداو دەستپاك بین لە سپاردە وەرگرتنداو بەڕەحم بین لە خزمایەتیداو چاك بین لە دراوسێییەتیداو دەست بۆ حەرام‌و خوێنی خەڵکی نەبەین، بەرگری لێ کردووین لەوەی کە دواێن پیسی بکەین یان قسەی درۆ هەڵبەستین‌و ماڵی هەتیوان بخۆین‌و ئافرەتی داوێن پاك تۆمەتبار بکەین، فەرمانی ئەوەمان پێ ئەکات تەنیا خوا بپەرستین‌و شەریکی بۆ بڕیار نەدەین‌و ڕۆژوویش بگرین (کۆمەڵێکی تر ڕێنمایی ئیسلامیان بۆ باسکرد)، قوربان! ئێمەش بڕوامان بە ڕاستی قسەکانی هەیەو شوێنی کەوتووین‌و بڕوامان وایە ئەوەی ئەو ئەیڵێ لەخواوە بۆی هاتووە، بۆیە تەنیا عەبدایەتی بۆ خوا ئەکەین‌و شەریکی بۆ بڕیار نادەین، بە هەموو شێوەیەك ئەوەی ئەو بە حەرامی دابنێ ئێمەش بە حەرامی دائەنێین‌و ئەوەشی ئەو بە حەڵاڵی دابنێ ئێمەش بە حەڵاڵی دائەنێین، کەچی گەلەکەی ئێمە ستەممان لێ ئەکەن‌و بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان کە لەم دینە دوورمان بخەنەوەو سەرلەنوێ بمانگێڕنەوە بۆ بت پەرستی‌و هەموو ئەو شتە خراپانەی کە جاران بە حەڵاڵمان زانیوە، دەستی پێ بکەینەوە، بۆیە کاتێك کە دەستیان دایە ەشکەنجەدان‌و زوڵم‌و زۆر بەرانبەرمان‌و هەموو ڕێگەیەکیان لێ تەنگ کردینەوە بواری جێبەجێکردنی دینەکەیان لێ گرتین، سەری خۆمان هەڵگرت بۆ لای جەنابتان بە ئومێدی ئەوەی کە لەپەنای تۆدا کەس زوڵممان لێ نەکات، بە مەبستیشەوە جەنابتمان هەڵبژارد نەك غەیری تۆ، نەجاشی وتی: شتێکتان لەبەرە لەو کتێبە کە بۆ ڕێبەرەکەتان هاتووە؟ (پێشتر قەشەکانی هەموو بانگ کردبوو کاغەزو قەڵەمیان دەرهێنابوو ئامادەبوون بۆ نووسین)، جەعفەر وتی: بەڵێ، وتی: ئادەی چیتان لەبەرە بۆمی بخوێننەوە! جەعفەر سەرەتای سوورەتی (کهیعص)ی بۆ خوێندنەوە، سوێند بەخوا نەجاشی خۆی دەستی کردە گریان‌و فرمێسك بە ڕیشیدا هاتە خوارەوەو قەشەکانی چواردەوریشی دەستیان کردە گریان‌و پەڕەو کاغەزەکانی بەردەمیان تەڕکردن پاشان نەجاشی وتی: سوێند بەخوا ئەمەی ئێوەو ئەوەی موسا هەردووکیان لەیەك دەلاقەوە هاتوونەتە خوارەوە، خوا یارو یاوەرتان بێت، وەڵڵاهی تەسلیمی کەستان ناکەمەوە.."[2].

ئەوە حاڵی ئەوانەبوو کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، بەڵام ئەوانەی مانەوە لە مەککەو کۆچیان نەکرد حاڵیان بەردەوام بەرەو خراپی ئەڕۆیی، بە ڕادەیەك قورەیش هەڵوێستی خۆیان یەکخست دەربارەی دانانی سنوورێك بۆ پێغەمبەر ﷺ‌و یارانی‌و تەنانەت ئەبوتالب‌و خێڵی بەنی عەبدولموتەلیب‌و بەنی هاشمیش بە گشتی، بۆیە

[1] (ابن كثير) ئەڵێ: "ئیبن عەساکر ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی (حسن غريب)ە".

[2] البداية والنهاية (٣/٧٤).

بڕیاریاندا ئابلۆقه بخەنه سەریان‌و بیان خەنه دۆڵەکانی ئەبوتالب‌و نوسراوێك بنووسن بۆ خۆیان‌و گشت لایەکی پێوه گەردنگیر بکەن، که ئەمه کورتەکەیەتی وەك (ابن کثیر) باسی دەکات[1]: "کەس لەگەڵیاندا نابێ دابنیشێ‌و نابێ کەس شتیشیان پێ بفرۆشێ‌و نابێ کەس ژنیان لێ بهێنێت‌و ژنیان پێ بدات‌و نابی کەس بچێته ماڵیان تا پێغەمبەریان تەسلیم نەکەن بۆ ئەوەی بیکوژن.. هیچ سوڵح‌و دانوستانێك له بەنی هاشم هەرگیز قەبوول ناکرێت‌و ڕەحم به کەسیان ناکرێت تا پێغەمبەر ﷺ تەسلیم نەکەن بۆ کوشتنی".

ئەم ئابلۆقەدان‌و دەنگ دابڕینه سێ ساڵی خایاند، تا ئەوەبوو هەندێ کەس که تێکەڵی ژن‌و ژنخوازی لەگەڵ بەنی هاشمدا هەبوو غیرەتی خزمایەتی‌و دەماری عەشایەری گرتنی‌و سەریان کرد به یەکداو کەوتنه دەنگ کۆکردنەوە بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەو ئابلۆقه ئابووری‌و کۆمەڵایەتییه، "ئیبن هشام"یش ئەڵێ: هەندێ له زانایان ئەوە ئەگوازنەوە که پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکیان به ئەبوتالبی مامی فەرمووە: "یاعم ان الله قد سلط الارضة علی صحیفة قریش فلم تدع فیها اسما هو لله الا أثبتته فیها، ونفت منها الظلم والقطیعة والبهتان"[2]. ئەبو تالیب وتی: خواکەت ئەمەی پێڕاگەیاندی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەبو تالب وتی: دەی سوێند بەخوا نابێ جارێ کەسی تر بێته لات، پاش ماوەیەك ئەبوتالیب چوو بۆ لای قورەیش وتی: ئەی تایفەی قورەیش! موحەممەدی برازام هەندێ هەواڵی پێ ڕاگەیاندوم، جا بڕۆن سەرێك بدەن له پەیماننامەکەتان که له کەعبەدا هەڵتان واسیوە، ئەگەر ئەوەی ئەو ئەیڵێ وابوو، بەسه ئیتر دەست لەم بێ ڕەحمیه هەڵگرن‌و وازی لێ بهێنن، خۆ ئەگەر واش نەبوو ئەوە مەرج بێ بەدەستی خۆم موحەممەدی برازامتان تەسلیم ئەکەم، قورەیش وتیان: ڕازین، بڕیاریان لەسەر ئەمه داو چوون پەڕەی پەیماننامەکەیان دەرهێنا، سەیر ئەکەن بەو شێوەیەیه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بەڵام قورەیش یاخی بوون‌و ئەوانەشی که کەوتبوونه دەنگ کۆکردنەوە کارەکەیان بۆ ئاسانتر بوو[3].

"واقیدی" ئەڵێ: له موحەممەدی کوڕی صاڵح‌و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدولعەزیزم پرسی: بەنی هاشم چ ساڵێك ئابلۆقەیان لەسەر نەماو له دۆڵی ئەبوتالب هاتنه دەرەوە، وتیان: له ساڵی دەیەمدا (واته دوای ده ساڵ پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ) که ئەکاته سێ ساڵ پێش کۆچکردن بۆ مەدینه..

له ماوەی ئەو سێ ساڵەو پاش ئەو سێ ساڵەی کۆچکردن بۆ مەدینه ڕووداوی سەیر سەیر ڕوویدا بەردەوامیش ئایەتەکانی قورئان دائەبەزینه سەر پێغەمبەر ﷺ قورەیشیش ئەوەیان به هەڵئەزانی که به ئازادی تەبلیغاتی چەواشەکارانه بکەن دژ به ئیسلام‌و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ.. بۆ نموونه:

توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی که سەرۆك عەشیرەتێکی خاوەن نفوز بوو له ناو دەوسییەکاندا، لەو ماوەیەدا هاته مەککەو پیاوه ئەشراف‌و ناودارەکانی مەککەی لێ کۆبوویەوەو حەزەری زۆریان پێدا لەوەی نزیك پێغەمبەر ﷺ ببێتەوە، داوایان لێکرد له گەڵی کۆنەبێتەوەو گوێی بۆ نەگرێت، توفەیل ئەڵێ: وەڵڵاهی ئەوەندەیان تر ساندم له پێغەمبەر ﷺ بڕیارمدا که توخنی نەکەوم‌و تەنانەت گوێم به لۆکه ئاخنی بۆ ئەوەی قسەیشی، نەچێت به گوێمدا، چوومه مزگەوتی کەعبەو سەیر ئەکەم پێغەمبەر ﷺ به پێوه نوێژ ئەکات، منیش هەندی لێی نزیك بوومەوەو دیاربوو خوای گەورە هەر ئەیویست هەندێ قسەی لێ ببیستم، بەڵێ هەندێ قسەی جوانم لێ بیست له دڵی خۆمدا وتم: دایك ڕۆڵه ڕۆت بۆ بکات، تۆفەیل! باشه خۆ تۆ پیاوێکی عاقڵی‌و شاعیرێکی بەتوانای قابیله چاك‌و خراپ نەناسی؟! بۆ گوێ بۆ ئەم کابرایه ناگری، ئەگەر شتی چاکی پێبوو ئەوە لێی وەربگرەو ئەگەر شتی خراپیشی پێبوو

---

[1] هەمان سەرچاوە (٣/٨٤).

[2] واته: مامی بەڕێزم: خوای گەورە خۆرەی بەرداوەته پەیماننامەکەی قورەیش‌و هەرچی ناوی خوای تێدا بووە هێشتوویێتییەوەو ئەوەشی ستەم‌و دەنگ دابڕان‌و بوختانی تێدایه هەمووی خواردووەو هەڵی کۆڵیوە.

[3] البدایة والنهایة (٣/٩٦).

ئەوە بیدەرەوە بەسەریدا، توفەیل ئەڵێ: دەنگم نەکرد تا پێغەمبەر ﷺ چوویەوە بۆ ماڵ و منیش بەدوایدا ڕۆیشتم و چووم بۆ ماڵی، وتم: ئەرێ موحەممەد من کە هاتمە مەککە گەلەکەی تۆ ئەوەندە باسی خراپەی تۆیان بۆ کردم لە تاودا گوێم بە لۆکە ئاخنی، بۆ ئەوەی گوێم لە دەنگ و وشەت نەبێ، بەڵام خوا ویستی وابوو هەندێ قسەتم بیست سەرنجی ڕاکێشام، جا بەڕاستی حەز ئەکەم بزانم پەیامی تۆ چییەو بۆمی باس بکە!

توفەیل ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی ئیسلامی بۆ کردم و هەندێ قورئانیشی بۆ خوێندمەوە، سوێند بەخوا تا ئەوکاتە شتی لەوە جوانترو پڕ لە دادترم نەبیستبوو، بۆیە شایەتمانم هێناو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من پیاوێکی قسە ڕۆیشتووم لەناو عەشیرەتی خۆمداو حەز ئەکەم کە بانگم کردن بۆ ئیسلام هەموویان بەگوێم بکەن، لەبەر ئەوە داواکارم دوعایەکم بۆ بکەی خوای گەورە بەڵگەو نیشانەیەکم بداتێ لەم کارەمدا سەرکەوتووبم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە بەڵگەو نیشانەیەکی پێ بدە، توفەیل ئەڵێ: کەوتمە ڕێ بەرەو لای عەشیرەتەکەم و گەیشتمە نشێوییەك ئەیڕوانی بەسەر شارداو ڕووناکییەك کەوتە نێوان هەردوو چاوم وەك چرایەك ئەدرەوشایەوە، دوعام کرد خوایە ئەم ڕوناکییە بخەیتە بێجگە لە دەم و چاوم نەوەك عەشیرەتەکەم وابزانن خواکانی ئەوان غەزەبیان لێ گرتووم، چونکە دینەکەی ئەوانم فڕی داوە، دوعاکەم گیرابوو، ڕووناکییەکە هاتە سەر لوتی قەمچییەکەم، خەڵکی شار هەموو ئەو ڕوناکییەیان ئەبینی کە وەك چرایەکی هەڵواسراو ئەگڕا، تا هاتمە ناویان و ڕۆژ بوویەوە، کە گەیشتمەوە ماڵەوە باوکم هات بۆ لام و باوکم پیاوێکی پیرو بەساڵاچووبوو، وتم: باوکە من و تۆ تازە بەیەك ناخۆین باوکم وتی: بۆچی ڕۆڵە؟ وتم: من موسڵمان بووم و شوێن موحەممەدی پێغەمبەر ﷺ کەوتووم، باوکم وتی: جا ڕۆڵە دینی تۆ دینی منیشە! وتم: دەی کەوابوو بڕۆ غوسڵێك بکەو جلەکانت بشۆرەو وەرەوە بۆ لام با ئەوەی فێری بووم فێرتی بکەم، توفەیل ئەڵێ: باوکم ڕۆیشت و غوسڵی کردو جلەکانی شۆردو هاتەوە بۆ لام و منیش باسی ئیسلامم بۆ کردو دەم و دەست موسڵمان بوو، پاش ئەوە ژنەکەم هات بۆ لام، پێم وت: من و تۆ تازە بەیەك ناخۆین، وتی: باشە بەساقەت[1] بم بۆچی؟ وتم: ئیسلام من و تۆی لەیەك جیاکردۆتەوە، من موسڵمان بووم و شوێن پێغەمبەر کەوتووم، ژنەکەم وتی: جا دینی تۆ دینی منیشە، وتم: دەی کەواتە بڕۆ بۆ چەمەکەی (ذی شری)[2] غوسڵێك بکەو جلەکانت بشۆرەو وەرەوە بۆلام، وتم: باشە بە ساقەو بم، ناترسی (ذي شرى) زیانێك بە منداڵەکانمان بگەیەنێ؟ وتم: نا من زەمانەتی ئەوەت ئەکەم، ڕۆیشت و غوسڵی خۆی کردو هاتەوە بۆلام منیش باسی ئیسلامم بۆ کردوو ئەویش دەم و دەست موسڵمان بوو، پاشان لە ناو (دەوس)دا بانگی ئیسلامم ڕاگەیاندو داوام لێکردن موسڵمان بن، کەچی نەهاتن بەدەممەوە، گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە مەککەو عەرزم کرد: قوربان زیناکردن لەناو (دەوس)دا ئەوەندە زاڵە نەهاتن بەدەممەوە، بەڵکو دوعایەکیان لێ بکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اللهم اهد دوسا)، خوایە هیدایەتی خێڵی دەوس بدەی، پاشان فەرمووی: بگەڕێوە بۆ ناو گەلەکەت و بە هێمنی و دڵ نەرمانە بانگیان بکە بۆ ئیسلام، توفەیل ئەڵێ: چوومەوە بۆناو عەشیرەتەکەم و بەردەوام بانگم ئەکردن بۆ لای ئیسلام تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، شەڕی بەدرو ئوحدو خەندەقیش ڕوویدا پاش ئەوە چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەگەڵمدا موسڵمان بوو بوون کە نزیکەی حەفتا یان هەشتا بنەماڵە ئەبووین کە گەیشتینە خەیبەر پێغەمبەر ﷺ پشکی بۆ ئێمەش دانا لە غەنیمەت و وەك هەموو موسڵمانانی تر، لە خزمەتی پیغەمبەر ﷺ مامەوە تا فەتحی مەککەی کرد[3].

ئەم هەوڵی ناشیرینکردنی پێغەمبەر ﷺو ئیسلام و ئەهلی ئیسلامە گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە نووسەرانی "سیره" ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ئە یفەرموو: "من یؤوینی؟ من ينصرني؟ حتى ابلغ رسالة ربي وله الجنة" کەچی

---

[1] لە زمانی عەرەبیدا ئەوترێ (بأبى أنت وامى) بەڵام من ئەوەی سەرەوەم لە کوردیدا بە گونجاو زانی، لەبەرانبەریدا دابنرێ.

[2] (ذی شری) بتێك بوو لەلای چەم و ئاوێکی سازگارەوە دانرابوو، خێڵی دەوس ئەو بتەیان ئەپەرست.

[3] البداية والنهاية (٣/٩٧ ـ ٩٨).

کەسێك نەبوو بچێت بەدەمیەوە نەك هەر ئەوە بەڵكو خزمانی موشریکی پێغەمبەر لە هەرشوێنێكدا کەسێکیان بدیایە کە ئەهاتە مەککە ئەڕۆیشتنە لایو دەستیان ئەکردە پڕوپاگەندەکردن لە پێغەمبەرو ئەیانوت ئاگات لەو کابرایە بێت فریوت نەدات[1].

پاش ئەوەی هەموو دەرگاکان لە پێغەمبەر ﷺو بانگەوازەکەی داخرا، خوای گەورە ڕێگەی بە پێغەمبەر ﷺدا کە کۆچ بۆ مەدینە بکات، پێغەمبەریش بەرنامەیەکی توندوتۆڵو زۆر وردی بۆ ئەم کۆچە دانا کە لە ڕاستیدا تەواوی زانستی بەڕێوەبردنی تازەی تێدا ڕەچاو کردووە.

زانستی ئیدارە لەسەر چوار "دینگە" وەستاوە:

١. نەخشەدانان ( التخطیط)

٢. ڕێکخستن ( التنظیم)

٣. هاندان ( التحفیز)

٤. چاودێری کردن ( الرقابة)

زانایانی زانستی بەڕێوەبردن ئەڵێن: نەخشەدانان بە (حەوت) قۆناغدا ئەڕوات:

١. دیاریکردنی کێشە بنەڕەتییەکە.

٢. کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەسەر کێشەکە.

٣. لێکۆڵینەوەی تەواو لەو زانیاریانەو ڕیزکردنیان بەپێی گرنگییان.

٤. دیاریکردنی ڕێگەچارەکان.

٥. هەڵسەنگاندنی ئەو ڕێگەچارانە.

٦. بڕیاردان لەسەر چاکترینیان.

٧. جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەو بەشوێندا ڕۆشتنی[2].

(راشد علي الاثري) لە کتێبی (الاسس الشرعیة والفكریة للعمل الاسلامي)دا ئەم هەنگاوانە بەم هێڵکارییە پیشان ئەدات[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ٣/١٥٨.

[2] المدخل الی العقیدة والاستراتجیة العسكریة/ جمال محفوظ، ص ١٢٨.

[3] الاسس الشرعیة والفكریة للعمل الاسلامي/ الاثري، ص ١١٢.




نەخشەی چۆنێتی بڕیاردان بەپێی زانستی بەڕێوەبردن


نەخشەی چۆنێتی بڕیاردان بەپێی زانستی بەڕێوەبردن

ڕێکخستن بریتییە لە گرێدانی هەوڵەکان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك کە بەدوو قۆناغدا ئەڕوات:

. قۆناغی یەکەم: قۆناغی بێدەنگی (ستاتیکی) یان هەندێ پێی ئەڵێن داڕشتنی پەیکەری کارەکە.

. قۆناغی دووەم: قۆناغی جووڵە (دینامیکی) کە بریتییە لە پڕکردنەوەی هەموو ئەو پەیکەرە بەکەسی گونجاوو دەسەڵاتی پێویست.

مەسەلەی (هاندان)یش بریتییە لە بەکارهێنانی هەندێ هۆکار کە کاریکاتە سەر کەسی ئیشکەرو بە دڵسۆزییەوە کارەکە ئەنجام بدات.. ئەویش دووبەشە: هاندان بە هۆکاری مەعنەوی، هاندان بە هۆکاری ماددی.

چاودێرییش کە هەندێ لە زانایان ناویشی ئەنێن "بەدواداچوون" کە بریتییە لە: چاودێری کردنی کارەکانو هەڵسوڕێنەرانی تا لەوە دڵنیا ئەبیت کە ئیشەکە وەك پێویست بەڕێوە ئەچێت .

جا ئەگەر ئەم هەنگاوانەی زانستیی بەڕێوەبردن جێبەجێ بکەین بەسەر پرۆسەی هیجرەت کردندا ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ لە لوتکەدا ئەم کارەی کردووە.

یەکەم: نەخشەی پێغەمبەر ﷺ بۆ کۆچکردن:

گرفتەکە بەجوانی دەست نیشان کرا ئەویش ئەوەیە "بانگەوازی ئیسلامەتی بە تەواوەتی ڕووی لە وەستان ولول بوون لە ناوخۆیدا کردووە و پێویستە ڕزگار بکرێت" .

٢. زۆرترینو وردترین زانیاری دەربارەی هەموو ئەو شوێنانە کۆکردەوە کە گومانی ئەبرد دەست بدەن بۆ ئەوەی هیجرەتی بۆ بکات.

٣. ڕێگە چارەکانی ڕیزبەندی کرد بەم شێوەیە:

. کۆچ بۆ تائیف .

. کۆچ بۆ حەبەشە.

. کۆچ بۆ مەدینە.

٤. باشترین ڕێگەچارەیان هەڵبژارد ئەویش کۆچکردن بوو بۆ مەدینە.

دووەم: ڕێکخستنی کاری کۆچکردن بۆ مەدینە:

١. ئەبوبەکری دانا کە ببکاتە هاوڕێی خۆی لەسەفەرەکەداو (عەلی)یشی دانا کە لە جێگەکەیدا بخەوێتو دوایی سپاردەو قەرزەکانی خەڵکی بداتەوەو لە هەلێکی تردا مالو منالو ئالو بەیتەکەی بێنێت بۆ مەدینە.

٢. مۆڵەتی دایە هاوەڵانی هەرکەسەو لە هەلومەرجی گونجاودا یەك یەك یان کۆمەل کۆمەڵ کۆچ بکەن.

٣. لەنیوەی شەوداو لە پشتی ماڵەکەی خۆیەوە هاتە دەرەوەو چوو بۆ لای ئەبوبەکرو کەوتنە ڕێ .

٤. ڕێگەی گشتی خەڵکی نەگرتە بەر بۆ کۆچکردن بەڵکو بە ڕێگەی قەراغ دەریادا کەوتە ڕێ.

٥. بەردەوام بە ڕێگەدا نە ئەڕۆیشت، بەڵکو لایانداو لە ئەشکەوتی (ثور)دا پشویەکیان بۆدا، تاوزەی تازەیان تێ بێتەوەو قورەیش چەواشە بکات، ئەگەر هاتن بەشوێنیاندا.

٦. هەڵبژاردنی ئەو ڕێگە سەختو ناهەموارە ئەنجامی نەخشەیەکی ورد بووە .

سێیەم: چاودێری کردنی پرۆسەی هیجرەت کردن.

١. هەڵبژاردنی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر تا ڕۆڵی پیاوێکی ئاسایش ببینێو کاری ئەوەبوو کە بەڕۆژ لە مەککەداو لە شوێنە گشتیو تایبەتییەکانی قورەیشدا گوێ قوڵاخ بێتو بزانێ بەرنامەیان چییەو شەویش بە نهێنی ئەهاتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکرو هەموو هەواڵێکی بۆ ئەگێڕانەوەو لە بەرنامەی قورەیش ئاگاداری ئەکردن.

٢. عامری کوڕی فوهەیرە کە شوانی مەڕومالاَتەکەی ئەبوبەکر بوو کاری ئەوەی پیَ سپێردرابوو هەموو ڕۆژێك پێش خۆرکەوتن ئاژەڵەکەی بە جێگە پێیەکانی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکردا ئەبرد تا شوێنەواری قاچی نەمێنێ، نەك ببێتە نیشانەیەك بۆ ئەوەی کە هاتووچۆ لەسەر ئەشکەوتەکە هەیەو پێیان بزانن!

٣. ئەسمای کچی ئەبوبەکر خواردنی بۆ ئەهێنان بۆ ئەشکەوتەکە.

٤. هاوکاتکردنی هاتنی عەبدوڵلاو ئەسماو عامر تا کارەکانیان پێکەوە گرێ بدرێو تەنسیق ببێت لە نێوانیاندا.

چوارەم: هۆکارەکانی هاندانی پێغەمبەر ﷺ لە پرۆسەی هیجرەتکردندا:

١. مژدەدان بە (سوراقە) لە کاتێکدا کە شوێنیان کەوتبوو ئەیویست زمانیان لیَ بدا.

٢. مژدەدان بە ئەسما بەوەی دوو پشتوێنی ئاڵتوونی لە بەهەشتدا پیَ ئەدرێ، چونکە پشتوێنەکەی خۆی دڕی و دەمی خواردنەکەی پیَ بەست.

٣. مژدەدانی بە ئەبوبەکر کە هاوڕێو هاودەمی ئەبێت(*) لە ئەشکەوتەکەدا[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچیکرد بۆ مەدینەو لەوێدا بناغەی بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامییو قانونی دامەزراندو هەر لە سەرەتای دانانی دەوڵەتەکەوە سیَ شتی گەورەی کرد:

یەکەم: نوسینی دەستوورێك بۆ مەدینە تا هەموو کەس، موسڵمانو ناموسڵمان، دانیشتوانی بنەڕەتی و هاتووەکان، پێوەی گەردن گیر بنو یاسا سەروەربێت.

دووەم: دانانی برایەتییەکی کۆمەلاَیەتی لە نێوان موسڵمانەکاندا.

سێیەم: دروستکردنی مزگەوت وەك خاڵێکی بەیەکگەیشتنی بەردەوامی موسڵمانان، ئیتر لەم مزگەوتەوە نەخشە بۆ بلاَوکردنەوەی کۆتا ئاینی ئاسمانی دانراو لە ماوەی (١٣) ساڵدا تەواوی دوورگەی عەرەب ملکەچ بوون بۆ دەسەلاَتی ئیسلامیی[2].

من ئەوەندەم لە "سیرە" بە پێویست زانی بنوسم، چونکە ئەمەی نوسیومانە خۆی بۆ خۆی وەلاَمی زۆرێك لەو گومانو بوختانەی (میر فطروس) ئەداتەوە کە ئەیخاتە پاڵ پێغەمبەر ﷺو یارانی.

بۆیە دوای ئەمە ڕاستەوخۆ ئەمەوێ بچمە سەر گومانەکانی ئەوو وەلاَمەکانی ئێمە:

. عەلی (میر فیطروس) لە باسی "دەرکەوتنی موحەممەدو سەرهەڵدانی ئیسلام"دا ئەیەوێ بڵێ کە پاڵنەری ئابووری ئەوسای نیوەدورگەی عەرەب بوویە هۆی سەرهەڵدانی ئیسلامو دەرکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەتا ئەڵێ: گۆڕانو گەشەی خاوەندارێتی تایبەتیو ئەرستۆکراتی گەورەو پەرەی بازرگانیو فراوانبوونیو پەلهاویشتنی

---

* مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس (بەرەحمەت بێت) ئەفەرموێ ئایەتی (ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا) چوار پلەی بەرزی تێدایە بۆ ئەبوبەکر:

١. لەگەڵ بوونی تایبەت (المعية الخاصة) بۆ ئەبوبەکر کە مانای پشتیوانیو ڕازی بوون لە ئەبوبەکری تێدایە.

٢. ڕیزبەندی کردنی بەدوای پێغەمبەردا ﷺ ئەو یەکەمو ئەم دووەم، کە واتای ئەوە ئەگەیەنیَ ئەبوبەکر بەرزترین کەسە لەناو ئوممەتی ئیسلامدا دوای پێغەمبەر ﷺ.

٣. وشەی (صاحبە) کە مەدالیای شەرەف بوو بۆی (هاوڕێکەی خۆی).

٤. بونی لە ئەشکەوتدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کە مانای (لەخۆبوردنو خۆیەکلاکردنەوەی) تێدایە بۆ دینو بۆ پێغەمبەر ﷺ.

[1] شەرحی عەقیدەی (مرضية)، ل ٤٧٠. (کورتکراوەتەوە).

[2] هەندێ لە زانایان ئەڵێن یەکێکی تر لە کارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا، دانانی بازاڕێکی تایبەت بوو بە موسڵمانەکان (السيرة النبوية/ الصلابي).

موڵکدارێتیی و سەرهەڵدانی موڵکانەو سستەمی شەریکە بەشی ئارەزووی بۆ ئاڵوگۆڕی سیاسیی و کۆمەلایەتی گرنگی کۆمەڵگەی عەرەبستان خۆشکرد"[1].

ناحاڵیتر لەمە ئەڵێ: ".. گەشەی پەیوەندییە ئابوورییەکانیش شانبەشانی پەرەسەندنی پەیوەندییە بازرگانییەکان و حەزو ئارەزووی بازرگانەکانی عەرەب.. بوونە هۆی ئەوەی کە کەڵکەڵەی بیری یەکگرتن و یەکێتیی سیاسیی ئاینیی عەرەبەکان بکەوێتە مێشکە تێگەیشتووەکانی کۆمەڵگەی عەرەبستانەوە"[2].

"میر فطروس" لەم دەقەدا ویستوویەتی دوو بنەمای ئێکسپاریەری دینی مارکسیزمی بسەلمێنێ:

یەکەمیان: مێژوو تەنیاو بە تەنیا بە پاڵنەری ئابووری دروست ئەبێت.

دووهەمیان: دین تەنیاو بەتەنیا دیاردەیەکی دەستکردی کۆمەڵایەتییە.

بەڵام لە هەردووکیاندا بە هەڵەدا چووەو (زانستی ئەمڕۆ)و (عەقڵ)و (ڕاستییە ئاینییەکانیش) ئەو نەزانینە ڕەت ئەکەنەوە..

زانستی ئەمڕۆ چ وەك (دەروونناس)و چ وەك (شوێنەوارناس)و چ وەك (زانستی مێژوو).. هەموویان لەسەر ئەوە ڕێکن کە مێژوو بە پاڵنەری ئابووری و پاڵنەری تریش دروست ئەبێت، بۆ نموونە:

پاڵنەری بڵاوکردنەوەی ئایین و مژدەدان بە ڕزگاری لە دونیاو لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا گەورەترین پاڵنەرە بۆ دروستکردنی مێژوو.. تەنانەت وەك زانای بەرزی کورد نەژاد "ئیبن تەیمیەی حەررانی" ئەڵێت: "مێژوو بریتییە لە تۆمارێك کە کارو کردەوەی پێغەمبەرانی تێدا نووسراوەتەوەو شارستانییەتەکان بە دەستی ئەوان و ڕێنماییەکانی ئەوان دروست بوون، گەشەی شارستانییەتە مرۆییەکانیش ڕاستەوانە ئەوەستێ لەگەڵ ڕادەی پێڕەوی کردن لە ڕێنماییەکانی ئەواندا"، لەسەر ئەمە ئەڕوات و ئەیسەلمێنێت و پاشان ئەڵێ: "ڕێڕەوی مێژوو بەردەوام بەشوێن پێی پێغەمبەراندا ئەڕوات.. ئەم مرۆڤایەتییەش ڕۆژێك لە ڕۆژان بێ پەیوەندی نەبووە بە پێغەمبەرانەوە لە درێژایی مێژوودا، ئەوەتا هەموو مێژووەکانیش کە دانراون و کراونەتە سەرەتا بۆ ساڵ و سەردەمەکان پەیوەندن بە پێغەمبەرانەوە[3]، چونکە دیارە کارو کاریگەری ئەوان لای خەڵکی تایبەت و عەوامیش ڕوون و ئاشکرابووە.. چونکە دیارییە شتی زۆر گرنگ کراوەتە سەرەتای مێژووی هەر میللەتێك تا خەڵکی بزانن پێش ئەو ڕووداوەو پاش ئەو ڕووداوە چەند ساڵ بووە"[4].

هەروەها مێژوو بەخۆشەویستی و خزمەتی بێ بەرامبەر دروست ئەبێت وەك خۆشەویستی دایکێك بۆ منداڵەکەی یان ژنێك بۆ دڵخوازەکەی و بە پێچەوانەشەوە.

باشە پێم ناڵێن چ پاڵنەرێکی ئابووری هەیە لە پشت خۆشەویستی ئەو دایکەوە بۆ منداڵەکەی یان لە پشت کوڕێك بۆ دڵدارەکەی یان ئەمان بۆ ئەوان؟! ئیتر بۆچی هەر ئەبێ پاڵنەری ئابووری حزوری ببێت لەم هاوکێشەیەدا..

پاشان پاڵنەری ئابووری حزوری کوا لە خۆڕەنجاندنی زانایەکدا کە ڕۆژ ئەداتە دەمی شەو بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکی زانستی یان دۆزینەوەی دەرمانی نەخۆشییەك یان ڕیگەگرتن لە لێقەومانێك، ئایا ئەو پاڵنەرانە هەمووی هەر ئابوورین؟!

---

[1] ئیسلامناسی، (ل١٢).

[2] هەمان سەرچاوە، (ل١٣).

٣ وەك مێژووی زایینی (لە دایکبوونی حەزرەتی عیسا) مێژووی کۆچی (کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە).. هەروەها.

[4] نقض المنطق (ابن تيميه) ص ١٥.

دەی ئیتر یانی چی سەرهەڵدانی ئیسلامو دروستبوونی ئەو مێژووە ببەسترێتەوە بە ئابوورییەوەو بڵێ: "ئایذی ئیسلامیش وەك هەموو ئاینەکانی تر زادەی هەلومەرجێگی کۆمەلاَیەتیی و مێژووی دیاریکراوە"[1]، ئەمانە هەمووی (یەك).

(دوو) ئایا (میر فطروس) تووشی هەڵەی کوشندە نەبووەو ئەوەشی لەسەر مەزهەبی ئەوبێت بە هەڵەی گەورەدا ناچێت ئەگەر بڕوای وابێت "دین بە گشتی دەستکردی خەڵکەو پەیوەندی بەخواو بە ئاسمانو پێغەمبەرایەتییەوە نییە؟".

زانایانی بەراوردکاری ئاینەکان ئەڵێن: ئاینەکان دوو جۆرن: یەکەمیان، ئاینە ئاسمانییەکان. دووەمیان: ئاینە دەستکردەکان.. ئاینە ئاسمانییەکان ئەو ئاینە خواییانەن کە بە بەردەوامی لەلایەنی خواوە هاتوون بۆئەم مرۆڤە تا لەلایەك پەیوەندی ئەم مرۆڤە بە خواوە ڕێك بخەن، لەلایەکیشەوە پەیوەندی (کۆمەلاَیەتی) ئەم مرۆڤە ڕێك بخەنو دامەزراوی بکەن.

(شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ) الشورى (١٣).

واتە: ("هەر خوا" شەریعەتێکی لە ئایین بۆ دامەزراندوون کە نوحیشی ڕاسپارد بەو شەریعەتەو بەمەی کە ناردووشیە سەر تۆو هەموو ئەو شەریعەتانەش کە ناردی بۆ ئیبراهیمو موساو عیسا تێیدا فەرمانی بەوە کردووە کە ئایین بەرپا بکەنو گروپ گروپ لەم ئاینە مەوەستنەوە، ئەم داوایە زۆر قورسە بە نیسبەت کافرانەوە). ئەو ئایینانە بە بەردەوامی هاتووەنەتە سەر میللەتانی ئەم سیەرزەوییە، خوای گەورە ئەفەرموێ: (ولكل قوم هاد) هەموو میللەتێك ڕیگە پیشاندەرێکی بۆ نێردراوە.. کورد (ئیبراهیم)و عەرەب (ئیسماعیل)[2]و فارس (زەردەشت)و بەنی ئیسرائیل (موساو عیسا)و (مەدیەن شوعەیب)و (حەزرەتی موحەممەد)یش بۆ تەواوی میللەتان بە عەرەبو کوردو فارسو عیسایی و موسایییەوە.. هتد.

خوای گەورە ئەفەرموێ: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً) (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ) (الأنبياء: ١٠٧) (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً) (الفرقان: ١).

ئاینە دەستکردەکانیش بریتین لە هەموو ئەو ئاینە نائاسمانییانەی کە لە لایەن چەند کەسێکی حەکیمو زانا، یان چەند کەسێکی "فرسەت تەلەب"ەوە لە بێ ئاگاییەکدا لە خەڵك بووەتە ئاین، جا ئەوە لە بناغەدا ئاینێکی ئاسمانی بووبێتو بە دەستکاریی کردنی زۆر متمانەی خۆی لەدەست دابێت یان هەر بەرهەمی زانین یان نەزانینی چەند کەسێك بووبێت لەناو میللەتێکی دیارکراودا.. وەك ئاینی "بوزا" یان "صابیئەو ئەستێرە پەرستەکان" یان "هیندە گا پەرستەکان" یان چیو چی.. جا کەواتە سنووداردکردنی ئایین تەنیا لە ئاینە دەستکردەکاندا ئەوە هەڵەیەکی گەورەیەو نە "عەقڵ"و نە "مێژوو" نە "زانست" پشتیوانی لیێ ناکەن، نەخوازەلاَ ئیسلام بە ئاینێکی دەستکردی "وەرەقەی کوڕی نەوفەل"و "بوحەیرا"و "ئومییەی کوڕی ئەبی سەڵت"و موسیلەمەو کیێو کیێ بزانی!!".

سیێ: لەو دوو دەقە بۆمان دەردەکەوێت کە (عەلی میر فطروس و سیامەكو شوان. ع)یش بەنیازن ئیسلام بکەن بە مەکینە ژەنگاوییەکەی خۆیانداو هەموو تەفسیرە ماددیەکانی خۆیان بسەپێنن بەسەریدا.. ئەگەر وانییە یانی چی ئەڵێ: ئەم پاڵنەرە ئابوورییە ئیسلامی هێناوەتە ئاراوە.. یان ئیسلام زادەی هەلو مەرجی کۆمەڵگەی عەرەبستانە، بۆ ئیسلام هەروا بزانی زادەی بیری ئەبوجەهلو عاصی کوڕی وائیل و سەرانی قورەیش بوو یان کۆمەڵیك ئاراستە بوو دژ بە ئاراستەی ئەوان بە سەدو هەشت پلەی پێوانەیی، جا ئەگەر وایە بۆچی سەرانی قورەیش ئەو هەمووە

---

[1] ئیسلامناسی، ل ٦.

[2] پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (ان اولى الناس بعيسى بن مريم، انا، لأنه ليس بيني وبينه نبي) رواه البخاري (٣٤٤٢).

دژایەتییەیان کرد، شەڕی (بەدر)و (ئوحود) و (ئەحزاب)و هەموو ئەو شەڕانەی تر ئەبێ لە پای چیدا بووبێت، خۆ ئەو شەڕانە شەڕی سەروماڵی بوون!! ناشێ کاکە عەلیو شوانو بابەك بە سوبعەتو وەختو ڕابواردنیان بزانن!!

چوار: سەرهەڵدانو گەشەی بەردەوامی ئیسلام پەیوەندە بە چەند شتێکی ترەوە کە (میر فطروس)و پێڕەکەی ئەو نایانەوێ خۆیانی لێ بدەن، گەشەی بەردەوامو توندی ئیسلام لەگەڵ ئەو هەمووە پیلانەی بە بەردەوامی لێی ئەکرێت بۆ تێکشکاندنی پەیوەندە بە سێ شتەوە:

١. خودی خوا "جل جلاله".

٢. خودی ئیسلام.

٣. لێبڕاوی شوێنکەوتووەکانی..

خوا خۆی بڕیاری داوە ئەم دینە بپارێزێو سەری بخات (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩) (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) (التوبة: ٣٣) ئیسلامیش خۆی ئەوەندە هێزی زاتی خۆی هەیە کە هەرکەس بابەتیانە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکاتو دەم بخاتە ئەم کانیاوی قورئانە بەدڵنیاییەوە کەمەندکێشی ئەکاتو تاسەی ئەشکێنێ.. لێبڕاوی ئەهلی ئیسلامیش لە هەمو سەردەمێکداو بە تایبەتی سەردەمی (سەحابە)و (قوتابیانی ئەوان) بە هێزترین کاریگەری هەبوو لەسەر گەشەی خێرای ئەم دینە[1].

. عەلی میر فطروس ناونیشانێکی تازە دائەنێ لە لاپەڕە (١٤)دا بەناوی (بنەما کۆمەڵایەتیو فەرهەنگییەکان): تێیدا هەوڵی سەلماندنی ئەوە ئەدات گوایە چەند کەسی خوێندەوار هەبووە لە پێشو هاوچەرخو هاو زەمان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی دینێك کە دوور بێت لە بتپەرستی بۆ نەتەوەی عەرەبی دابمەزرێنن، لەوانە: (ئومەییەی کوڕی ئەبی سەلت)و (قس بن ساعدەی ئەیادی)و (خالدین سنانو عامر بن ظرب عدوانیو عبدالله قضاعي و حەنظلە.. هتد.

ئەڵێ: "امیەی ئەبی صەلت" کە خەڵکی (طائف) بوو لە خێڵی "بنی ثقیف" بوو پورزای پێغەمبەر بوو لە گەورە پیاوانی "حنفاش"[2]" بوو داوای خواناسیو یەزدانپەرستی لە خەلك دەکرد.. یەکتر بینینی ئەو دوانە (واتە: موحەممەدو امیە) {قسەکە هەر هی (میر فطروس)ە} مەسەلەیەکی گرنگە، بەلام ئومەییە نەبووە موسڵمانو چووەوە بۆ تائیف بە هاوڕێکانی گوت: من زیاتر لە موحەممەد سەرم لە کتێبو دەنگوباسی نەتەوەکان دەردەچێت و سەرەڕای ئەوەش شارەزایی دووزمانی ئارامیو عیبریم، کەواتە من بۆ پێغەمبەرایەتی لێهاتوو شیاوترم"[3].

(عەلی میر فطروس) ئەم زانیارییەی بە قسەی خۆی لە (تأریخ عرب) بەرگی یەك (ل١٣٦)و (بیستو سێ ساڵ نبووەت) (ل ٢٦و ٢٧). وەرگرتووە.. (تأریخ عرب) هی (فلیب حتی)و ئەوی تریشیان هی (عەلی دەشتی) ناوێکە..

ئەم دەقەی سەرەوە سێ چوار (نەزانین)و (بە ئارەزووی) (میر فطروس)ی تێدایە:

١. "فلیب حتی" و کتێبەکەی سەرچاوە نین بۆ وەرگرتنی ئیسلامو ڕێنماییەکانی ئیسلام.

٢. ئەو هەمووە ناوە ئەو هێناونی گشتی تەنیا (قس)و (امیە)یان تێدا بووە کە لە (حنفاء) بوونو لەسەر ئاسەواری دینی ئیبراهیم مابوونەوە.

٣. پێغەمبەرایەتی بریتی نییە لە لاف لێدان "ادعاء"و شتی کەسبکراو بەڵکو هەڵبژاردنی خودایییە.

٤. ئومەییەش شتی وای نەوتووەو پێغەمبەریشی نەدیوەو پێکەوە دانەنیشتوون.

---

[1] لە لاپەڕەکانی داهاتوودا گەڕانەوەمان بۆ ئەم حاڵە ئەبێت، چونکە زۆر ئەکرێت بەژێرەوە.

[2] ڕاستتر وابوو بینوسیایە (حنفاء)ش.

[3] ئیسلامناسی، (ل ١٥).

٥. ئومەییەش لە هەندێ "شعر" بەولاوە چی تری وتووە شایانی باس بێت، ئەو شیعرانەش هەندێ لەو ڕاستیانەبوون کە لە هەندێ نەصاری وەری گرتوون یان ئاسەواری ئاینی ئیبراهیم بوون لەناو خەڵکدا، (میر فطروس) کە (فلیپ حتی)ی کردووە بەسەرچاوەی ئەوە، یان نەزانینە یان هەر بە ئارەزووبازی ئەوی کردووە بە سەرچاوەی نووسینەکەی.. دکتۆر موستەفا سوباعی ئەڵێ: "(فلیب حتی) کابرایەکی گاور مەزهەبی لوبنانییە کە شوناسنامەی ئەمریکی هەیە، مامۆستای زانکۆی (برنستۆن)ە لە ئەمریکا پاشان هەر خۆشی سەرۆکایەتی ئەم بەشەی لە ئەستۆدایەو ئێستا خانەنشینە، یەکێکە لەسەر سەختترین دوژمنانی ئیسلام بە ڕووکەش بەرگری لە کێشە (عەرەبییەکان) ئەکات لە ئەمریکا، ڕاوێژکارێکی نارەسمی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکایە لە مەسەلەکانی پەیوەند بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە کەڕۆڵی ئیسلام کەمبکاتەوە لە دروستکردنی ڕۆشنبیری مرۆییدا، زۆر قەڵسە بەوەی هەر چاکەیەك بدرێتە پاڵ موسڵمانان، بۆ نموونە لە ستوونی (الادب والعربي"دا لە کتێبی (دائرة المعارف الامریکیة)دا (ل ١٢٩) کە ساڵی ١٩٤٨ چاپ کراوە ئەڵێ: "نیشانەی ژیانی تازەی ئەدەبی لە دوای سەدەی نۆزدەوە دروستبووە، زۆربەی ڕێبەرانی ئەم بزاڤە ڕۆشنبیرییە تازەیەش بریتین لە پیاوە نەصرانییەکانی لوبنان کە لەسەر دەستی مژدەدەرە ئەمریکییەکاندا پەروەردە بوون و ئیلهامیان وەرگرتووە"، ئەم بەکەم سەیرکردنی (فلیب حتی) بۆ موسڵمانان تەنیا ڕوو لە ئێستای موسڵمانان ناکات، بەڵکو هەمان کاری کردووە دەربارەی مێژووی ئیسلامیش کە ئەمە نموونەی هەندێ لە کتێبەکانیەتی:

١. تأریخ العرب، کە سەرەتا بە ئینگلیزی چاپی کردوو پاشان چەندجارێك چاپی دووبارە کردۆتەوە، ئەم کتێبە پڕە لە قسەوتن بە ئیسلامو گاڵتەکردن بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، هەموو کتێبەکە لێوان لێوە لە "ڕق" و "ژەهر"و "حەقد" لەسەر ئیسلام.

٢. تأریخ سوریا.

٣. أصل الدروز و دیانتهم[1].

بۆ ئەو هەمووە ناوەش ڕاستییەکەی وەك لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە ئەوە یەکە "قس"و "امیە" هەبوون و بە (عەقڵی خۆیان) نەك دوای پەیامێك بووبێت لێیان) خەڵکیان بانگ کردووە بۆ ڕەوشت بەرزی.. (ابن کثیر) لە (البدایة والنهایة)دا ئەڵێ ئەبو سوفیان ئەڵێت: جارێکیان منو (ئومەییەی کوڕی ئەبی سەلت)ی سەقەفی بۆ بازرگانی پێکەوە چووین بۆ شام.. لە هەر شوێنێکدالامان ئەدا، ئومەییە کتێبێکی دەردەهێناو شتی لێ دەخوێندەوە بۆمان، تا گەیبشتینە لادێیەك لە لادێکانی نەسارا، سەیرم کرد هاتن بەدەمیەوەو زۆر ڕێزیان لێ گرتو هەندێ دیاریو شتیشیان پێداو ئەویش لەگەڵیاندا چوویەوە بۆ ماڵ، دەوربەری نیوەڕۆ گەڕایەوەو جلەکانی داکەندو دەستێ جلی ڕەشی لەبەر کردوو بەمنی وت: ئەبوسوفیان حەز ئەکەی بچین بۆ لای زانایەکی (نصاری) کە زانیاری تەواوی لە کتێبدا هەیەو هەرچیت دێ بە خەیاڵدا لێی بپرسی؟ وتم: حەزم لە قسەیان نییە، وەڵلاهی ئەگەر باسی شتێکم بۆ بکەن کە پێم خۆشە متمانەیان پێ ناکەم ئەگەر باسی شتێکیشم بۆ بکەن کە حەزم لێی نییە ئەوە لێیان عاجز ئەبم..

ئەبو سوفیان ئەڵێ: ئومەییە ڕۆیشتو چوویە خزمەتی پیاوێکی پیری نەصرانیو گەڕایەوە بۆ لای منو وتی: باشە چی ڕێگەت لێ ئەگرێ بچیتە خزمەت ئەو زانایە؟ وتم: خۆ من لەسەر ئاینی ئەو نیم.. وتی: جا با واش بێت.. شتی سەیرو سەرسوڕهێنەری زۆری لێ ئەبیسی.. پاشان پێی وتم: ئەری تۆ (ثقفیت؟) وتم: نەخێر، من قورەیشیم، وتی: باشە دەی ڕێگر چییە نایەیت بۆ لای ئەم زانایە، خۆ ئەو ئێوەی خۆش ئەوێتو باش باستان ئەکات[2].

---

[1] الاستشراق والمستشرقون (مالهم وما علیهم) د. مصطفی السباعي/ دار السلام/ للطباعة والنشر والتوزیع والترجمة/ الطبعة الاولی/ ١٩٩٨ ـ ١٤١٨/ القاهرة. ص ٤١ ـ ٤٢.

[2] چ (یهود)و چ (نەصارا) زۆر لە هەوڵی ئەوەدابوون کە هەریەکەی بۆ خۆیان عەرەب بەرەو دینەکەی خۆیان کێش بکەن.

ئەبوسوفیان ئەڵێ: ئومەییە لای ئێمە هەستاو چوو بۆ لای ئەوان‌و شەوێکی درەنگ هاتەوە بۆ لامان‌و جلە ڕەشەکانی داکەندو خۆی دابەزویداو لێی پاڵ کەوت، وەڵڵاهی نەشەو نە کاتێکیش کە ڕۆژبوویەوە غەمباری بەری نەدابوو، تەنانەت نانی ئێوارەو بەیانی کەوتبوون بەسەر یەکداو حەواسی قسەکردنی نەبوو لەگەڵ کەسماندا، ماوەیەك دوای ئەوە ئەڵێ: ئەری نەڕۆین؟ وتم: تاقەتی ڕۆشتنت هەیە؟ وتی: بەڵێ، دەستمان کردە ڕۆیشتن‌و دوو شەو ڕێمان کردوو شەوی سێهەم پێی وتم: ئەری ئەبوسوفیان! تۆزێ قسە نەکەین پێکەوە؟ وتم: جا قسەت لا هەیە؟ وەڵڵاهی ئەوەتەی ئەو زانایەت بینیوە بێجگە خەفەت‌و غەمباری هیچی ترمان لێت نەبینیوە، وتی: ئەوە خەفەتی دوا ڕۆژم ئەخۆم نەك خەفەت بۆ ئێستام، وتم: باشە بۆچی دوا ڕۆژیشت هەیە؟ وتی: ئەرێ سوێند بەخوا ئەمرم‌و زیندووش ئەبمەوە، وتم: باشە گرەوێکم لەگەڵدا ئەکەی؟ وتی: لەسەر چی؟ وتم: لەسەر ئەوەی کە زیندوو بوونەوە نییەو لێپرسینەوەشت لەگەڵدا ناکرێت. ئومەییە پێکەنی‌و وتی: بەڵێ ئەبو سوفیان! سوێند بەخوا زیندوو ئەبینەوەو لێپرسینەوەشمان لەگەڵدا ئەکرێت‌و خەڵکیش ئەبنە دوو دەستە، دەستەیەکیان ئەچن بۆ بەهەشت‌و دەستەیەکیشیان ئەچن بۆ جەهەننەم‌و ئاگر، وتم: باشە هاوەڵەکەت پێی نەوتی تۆ لەکامیانی؟ وتی: هاوەڵەکەم ئەو هەواڵە نازانێ، نە هەواڵی من ئەزانێ نە هی خۆشی، ئەبووسفیان ئەڵێ: دوو شەو لەسەر ئەم بەزمە بەردەوام بوو، ئەو سەیری لە قسەکانی من ئەهات‌و منیش پێکەنینم بە قسەکانی ئەو ئەهات، تا گەیشتینە (دیمەشق)و چی کووتاڵ‌و کەلوپەلمان هەبوو فرۆشتمان‌و دوو مانگێك لەوی ماینەوەو پاشان کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە لادێیەك لە لادێکانی نەصارا، کە خەڵکەکە ئومەییەیان بینی هاتن بەدەمیەوەو دیارییان بۆ هێناو ئەمیش لەگەڵیاندا ڕۆیشت بۆ کڵیساکانی ئەوان‌و دەوروبەری نیوەڕۆ هاتەوەو جلە ڕەشەکانی کردەوە بەرو ڕۆیشت بۆ لایان شەوێکی درەنگ هاتەوە بۆ لامان، دیسان خۆی دایەوە بە زەویداو لە سەر جێگەکەی پاڵکەوت‌و غەمباری دایگرتەوە تا بەیانیش هەر ئەو خەفەت‌و غەمبارییە بەری نەدابوو نە ئەو قسەی لەگەڵمان ئەکردو نە ئێمەش قسەمان لەگەل ئەو ئەکرد، پاش ماوەیەك وتی: ئەرێ نەڕۆین؟ وتم: بەڵێ ئەگەر حەزبکەی، کەوتینە ڕێ‌و چەند شەو ئەو غەم‌و خەفەتە بەری نەدا، پاشماوەیەك وتی: ئەبوسفیان تۆزێ پێش خەڵکەکە نەکەوین؟ وتم: بۆ قسەیەکت پێیە؟ وتی: بەڵێ، دەستمان کردە ڕۆشتن کاتژمێرێك لە هاوڕێکانمان دوور کەوتینەوە، ئومەییە وتی: ئەی صەخر! وتم: چۆن حەز ئەکەی؟ وتی: باسێکی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەم بۆ ناکەی؟ ئایا خۆی لە (حەرام)و (ستەمکاری) ئەپارێزێ؟ وتم: ئەرێ وەڵڵاهی، وتی: لەگەڵ خزم‌و کەسوکارەکانیشدا با شەو فەرمان بەخەڵك ئەکات پەیوەندی خزمایەتی ڕابگرن‌و بە ڕەحم بن لەگەڵ یەکتری؟ وتم: بەڵێ، سوێند بەخوا. وتی: دەست کراوەیەو لە ناوەندی خزمەکانیدا پیاوێکی ناودارە؟ وتم: بەڵێ، وتی: کەسی تر هەیە لە قورەیشدا لەو ناودارتر بێت؟ وتم: نەوەڵا، کەس شك نابەم، وتی: پیاوێکی موحتاج و کەم دەستیشە؟ وتم: نەخێر، بەڵکو یەکێکە لە پیاوە پارەدارەکان، وتی: تەمەنی چەندە؟ وتم: لە سەد تێپەڕی کردووە، وتی: ئەفسوس ماڵ‌و ناوداری‌و بەساڵاچوویی عەیبداریی کردووە، وتم: جا بۆچی عەیبداری کردووە؟، وەڵڵاهی ئە وانە ئەوەندەی تر بەڕێزیان کردووە. وتی: چۆن ئەڵێم وایە. وتی: خەوت نایەت؟ وتم: با پێویستم پێیەتی، (ئەبوسفیان) ئەڵێ: تۆزێ ڕاکشاین تا ماندوویێتیمان دەرچوو، دەستما بەڕۆیشتن کردەوە تا گەیشتینەوە شوێنی مەبەست‌و پاشان کەوتینەوە ڕێ‌و کە شەوهات (ئومەییە) وتی: ئەبوسفیان! وتم: ها چیت ئەوێ؟ وتی: قسەکانی دوێنێمان تەواو بکەین؟ وتم: بۆ قسەت ماوە؟ وتی: بەڵێ. دەستمان بە ڕۆیشتن کردو هەردوکمان یەکی هوشترێکی یەمەنیمان لەژێردابوو تا لە هاوڕێکانمان دوور کەوتینەوەو پێی وتم: ئادەی صەخرا باسی عوتبەی کوڕی ڕبیعەم بۆ بکە، وتم: ئادەی تۆ فەرموو باسی چی عوتبەت بۆ بکەم؟ وتی: خۆی لە حەرام‌و لە ستەمکاری ئەپارێزێت‌و بە سۆزەوە بەرانبەر خەڵك‌و خزمان‌و فەرمان بەوە دەکات؟ وتم: ئەرێ سوێند بەخوا بەو شێوەیەیە.

وتی: پارە داریشە؟ وتم: پارەداریشە، وتی: لە ناو قورەیشدا لەو ناودارترو گەورەتری تێدایە؟ وتم: نەوەڵڵا شك نابەم، وتی: تەمەنی چەند ساڵە؟ وتم: زیاد لە سەد ساڵ ئەبێت.. وتی: (بەداخەوە)، تەمەن‌و ماڵ‌و ناوداری عەیبداری کردووەو کەڵکی نەهێڵاوە، وتم: سوێند بەخوا وانییە، ئەرێ تۆ قسەیەکت پێیە بۆ نایکەی؟ وتی: قسەیەك هەیە بۆتی ئەکەم بەڵام لای کەس مەیگێڕەوە تا دێتە دی‌و خەڵك ئەیبیستێ.. پاشان وتی: ئەو غەمباری‌و خەفەتەی هەمە ئەوەیە کە سەرم دالەو زانا نەصرانییەو هەندێ پرسیارم لێکرد، لەوانە وتم: ئادەی باسێکی ئەو پێغەمبەرە م بۆ بکە کە خەڵك چاوەڕوانێتیی[1].وتی: پیاوێك لە ناو عەرەبەکاندا پەیدا ئەبێ، وتم: ئەوە ئەزانم کە عەرەبە، بەڵام ئایا لەکام عەرەبە؟ وتی: خەڵکی شوێنێکە کە عەرەب بۆ حەجکردن ئەچن بۆ ئەوێ، وتم: دەی ئێمە خانەیەکمان هەیە عەرەب بۆ حەجکردن دێن بۆ ئەوێ، وتی: لە براقورەیشییەکانی ئێوەیە، کە ئەمەی وت وەڵڵاهی کارێکم بەسەردا هات هەرگیز شتی وام بەسەر نەهاتووە، دڵنیابووم کە خێری دونیاو ئاخیرەتم لەدەستچوو، چونکە من بەتەمای ئەوەبووم کە ئەو پێغەمبەرە من بم!!

ئەبوسوفیان ئەڵێ: منیش وتم: دەی مادامێك وایە، ئائەو پێغەمبەرەم بۆ وەسف بکە.. وتی: (پیاوێکی گەنج)ە لە کاتێکدا کە (ڕەبیعە چووەتە ساڵەوە) سەرەتای پێغەمبەرایەتییەکەی بەوە دێت کە لە حەرام خۆی ئەپارێزێ‌و لە ستەمکاری دوورەو زۆر بە سۆزە بەرانبەر خزمو خەڵك‌و فەرمانیش بەوانە دەکات، پیاوێکی دەست کورت‌و موحتاجیشە، لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی دەست کراوەو ناوداریشە لەناو عەشیرەتەکەیداو فریشتەکان زۆرترین سەربازو هەواداری ئەو پێك دێنن.. وتم: باشە بەڵگە چییە لەسەر ئەمە؟ وتی: شام لەوەتەی (عیسای کوڕی مەریەم) نەماوە (هەشتا جار) زەمین لەزەرە لێی داوەو کاولکاری تێدا دروست کردووەو زەمین لەرزەیەکی تری ماوە کە ئەمەیان لێقەومان‌و کاولکارییەکی زۆری پێوەیە.

(ئەبوسفیان) ئەڵێ: منیش وتم: وەڵڵاهی ئەم قسانە گشتی پڕو پوچەو ئەسڵ‌و ئەساسی نییە، ئەگەر پێغەمبەر پەیدا ببێ ئەبی پیاوێکی بەتەمەنی ناودار بکرێتە پێغەمبەر نەك گەنجێك.ئومەییە وتی: دەی بەو خوایەی تۆ سوێندی پێ ئەخۆی چۆنم وت هەر وایە، ئەبوسفیان! ڕۆژێکیش ئەبی ئەڵێی ئەری ئەزانی قسەی کابر نەصرانییەکە ڕاست دەرچوو، پاشان وتی: حەزت لە خەو نییە؟ وتم: پێویستم بە خەوە، ئەوشەوەش خەوتین‌و بەیانی کەوتینە ڕێ بەرەو مەککە، دوو قۆناغمان مابوو بۆ مەککە بە دوو شەو بیگەینێ، سوراێك پێمان گەیی ئێمەش هەواڵی (شام)مان لێ پرسی، وتی: ئاگاتان لێ نییە، دوای ئێوە زەمین لەرزەیەك دای لە شام لێقەومانێکی گەورەو زەرەرو زیانێکی زۆری داوە ئەبوسفیان ئەڵێ: ئومەییە ڕووی تێکردم‌و وتی: ئەبوسوفیان ئێستا بڕوات چۆنە بە قسەی کابرای نەصرانی؟ وتم: سوێند بەخوا دڵنیابووم کە هاوەڵەکەت ڕاست ئەکات.. ئەبوسفیان ئەڵێ: گەیشتینەوە مەککەو ئەوەی ماڵی خەڵك بوو لام گشتیم گەڕاندەوەو بەرەو (یەمەن) کەوتمە ڕێ بۆ بازرگانی‌و پێنج مانگ لەوێ مامەوەو پاشان گەڕامەوە بۆ مەککەو لە ماڵەوە بووم خەڵکی ئەهاتن بۆلامو سڵاویان لێ ئەکردم‌و هەواڵی کەل‌و پەلەکانی خۆیانیان ئەپرسی یەکێك لەوانە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا هاتە لام‌و "هیند"ش لەلام بوو یاری لەگەڵ منداڵەکانمدا ئەکرد، موحەممەد سەلامی کردو بەخێری هێنامەوەو پرسیاری زۆری کرد دەربارەی سەفەرەکەم‌و هیچ پرسیاری لە کەلوپەلەکانی خۆی نەکردو هەستاو ڕۆیی، وتم: هێند! وەڵڵاهی زۆرم لاسەیرە، کەس نییە لەناو قورەیشدا شتێکی لام بووبێ‌و نەهاتبی هەواڵی بپرسێ، ئەم کابرایە نەبێ، هیند وتی: باشە ئاگات لەوەزعی نییە؟ وتم: بۆچی هیچی وا هەیە لێی بترسین؟ وتی: بەحسابی خۆی بووە بە پێغەمبەری خوا، (ئەمەی وت) ڕاچڵەکیم‌و قسەی کابرا نەصرانییەکەم بیرکەوتەوەو موچورکەیەکی زۆرم پێدا هات‌و بەڕاددەیەك (هیند) وتی: ئەوە چیتە

[1] لە (تەورات)و لە (ئینجیل)دا باسی ئەوە کراوە کە لەناو عەرەبەکاندا پێغەمبەرێك پەیدا ئەبێ کە فەرمان بە چاکە ئەکات‌و بەرگری لە خراپە ئەکات‌و لە زۆر کۆت‌و زنجیر خەڵکی ڕزگار ئەکات.

باوکە؟! بێداربوومەوەو وتم: ئەمە قسەیەکی پووچ و بێ مانایەو موحەممەد لەوە عاقڵترە دوای قسەی وا بکەوێت و شتی وا بڵێ.

هیند وتی: بەڕێ وەڵڵا، نەك هەروا دەڵێ، بەڵکو خەڵکیش بۆلای خۆی بانگ دەکاتو ژنەکەشی بڕوای پێکردووەو چووەتە سەر دینەکەی. وتم: ئیتر ئەوە بەڵگەی پڕوپووچیەتی! (ئەبوسفیان) ئەڵێ: چوومە دەرەوەو لەکاتی تەوافدا لە کەعبەدا گەیشتم بە موحەممەدو پێم وت: ئەوە کەلوپەلەکەی تۆش ئەوەندەو ئەوەند خێری کردووەو یەکێ بنێرە با هەقەکەی خۆتت بۆ بنێرمو هیچیشت لێ وەرناگرم وەك خەڵکی! کەچی قەبووڵی نەکردو وتی: کەواتە من هیچم ناوێ، وتم: باشە یەکێکی بۆ بنێرە چەندە خێرم لە خەڵك سەندووە ئەوەندەش خێر لە تۆ ئەسەنم، ئەوبوو یەکێکی بۆ نارد و منیش پارەکەم بۆ ناردەوەو چۆن خێرم لە خەڵکی وەرگتبوو بۆ ئەویش هەروا م کرد.

زۆری نەبرد سەفەرێکی تری یەمەنم کرد سەرێکم لە تائیفیش داو چووم بۆ لای ئومەییەی کوڕی ئەبی سەڵت. یەکسەر وتی: کێ بوو؟ وتم: (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا)یە، وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب؟ وتم: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیب.. ئیتر قسەکانی هیندم گشتی بۆ گێڕایەوە، وتی: خوا باشتر ئەزانێ.. سەیرم کرد ئومەییە دەستی کردە عارەق کردنێکی سەیرو پاش ماوەیەك وتی: وەڵڵاهی ئەبوسفیان پێئەچێ ئەوبێ.. جا ئەگەر بۆمی وەسف بکەی.. ئەگەر دەرکەوتو هاتە مەیدان ئەوە داوا لە خوا ئەکەم عوزرم قبوڵ بکات، ئەگەر پشتیوانیم لێ نەکرد! ئەبوسوفیان ئەڵێ: دیسان چوومەوە بۆ یەمەنو زۆری نەبرد هێشتا هیچم نەکردبوو دەنگوباسی پێغەمبەرایەتی موحەممەد گەیشتە یەمەنیش، چوومەوە بۆ لای (ئومەییەی کوڕی ئەبی سەلت) لە تائیف، وتم: باوکی عوسمان، خۆ دەنگوباسی ئەو کابرایەت بەجوانی پێگەیشتووەو گوێت لە هەواڵی بووە؟ وتی: سوێند بە گیانی خۆم بەڵێ! وتم: ئەی باشە هەڵوێستت چییە لێی؟ وتی: وەڵڵاهی ڕاستییەکەی من پێغەمبەر لە (ثقیف) نەبێ بڕوای پێناکەم[1]!

(ئەبوسفیان) ئەڵێ: کە گەڕامەوە بۆ مەککە سەیر ئەکەم خەڵکی دەستیان داوەتە ئەشکەنجەدانی شوێنکەوتەو هاوڕێکانی پێغەمبەر ﷺ، جا منیش ئەمەم وت: باشە ئەی سەربازو هەوادارانی لە فریشتە کوان؟ ئەبوسفیان ئەڵێ: هەرزوو منیش هەمان سروشتی خەڵکی ترم گرت کە لوتبەرزیان ئەکردوو خۆیان هەڵدەکێشا بەسەر پێغەمبەردا[2].

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەمەییەی کوڕی ئەبی صەڵت ئەفەرموێ: (آمن شعره وكفر قلبه)[3]، واتە: شیعرەکانی ئیمانیان تێدایەو دڵی کوفری تێدایە.

ڕاستە ئومەییە پیاوێکی ژیرو خوێندەوارو بووە، شاعیرێکی بەتواناو خاوەن بەهرەش بووە، بەڵام خۆ پێغەبمەرایەتی نەخۆزگەو ئاواتە نە کارێکیشە کە بە هەوڵدانو خۆماندوو کردن بۆی بێتە دەستی مرۆڤ، پێغەمبەرایەتی هەڵبژاردنی خوایە بۆ کەسێك کە جێگەی قەبووڵی خوایە.. خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيراً لِّلْكَافِرِينَ) (القصص: ٨٦). تۆ ئومێدی ئەوەت لانەبووە کە کتێبێك بێتە سەرتو بیتە پێغەمبەر، ئەوە تەنیا سۆزی پەروەردگارتە (تۆی کردووە بە پێغەمبەر) لەبەر ئەوە هەرگیز مەبە بەپشتیوانی کافران.

---

[1] لە دواتریشدا (موسەیلەمە)و خێڵەکەشی کە لە (ثقیف) بوون هەر هەمان دەمارگیرییان هەبوو، بۆیە (موسەیلەمە)یان کردە پێغەمبەری درۆزنی خۆیان.

[2] البداية والنهاية (٦٠٧/٢ ـ ٦٠٨ ـ ٦٠٩) ابن كثير ئەڵێ: رواه الطبراني والبيهقي في الدلائل.

[3] رواه ابن الانباري في (المصاحف) وابن عساكر عن ابن عباس في كنز العمال (٧٩٨٠)، سەیری (البداية والنهاية: ٦١٤/٤) بکە.

پاشان بۆ ئەبێ بوترێ قورئان چاوی لە (ئومەییە) کردووەو نەوترێ ئومەییە ویستوویەتی چاو لە قورئان بکات‌و کێ بەرکێ لەگەڵ پێغەمبەردا بکات، چونکە خۆ (ئومەییە) هاوزەمانی پێغەمبەر بووەو تا دوای شەڕی (بدر)یش هەر لە ژیاندا بووە[1].

هەروەها (قس کوری ساعدەی ئەیادی)یش بە هەمان شێوە پیاوێکی ژیرو وریاو خوێندەوار بووە، بەڵام ئەوەیانی نا پێغەمبەر ﷺ بوبێتە قوتابی لای ئەوان‌و "بنەما" یان "درێژەی ئیسلامی" لێ وەرگرتبن، چونکە وەك وتمان پێغەمبەرایەتی نە هیواو ئاواتە نە پیشەو کارە بە هەوڵدان بۆی بێتە دەست.

. لە لاپەڕە (١٥)دا (میر فطروس) ئەڵێ: هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی موحەممەددا کەسێکی تریش بەناوی (مسیلمە) خۆی بە پێغەمبەر زانی، (موسلیمە) نامەیەکی بۆ حەزرەتی موحەممەد نووسی و تێیدا گوتی: منیش لە پێغەمبەریدا لەگەڵتدا هاوبەشم‌و دەبێت دەسەلاتو دەست ڕۆیشتنمان بەسەر عەرەبستاندا بەیەکەوە دابەش بکەن، موحەممەد لە وەڵامی ئەم نامەیەی (موسەیلەمە)دا کابرایەکی بەناوی (رحال)ەوە نارده لای، بەڵام ئەم نوێنەرەی موحەممەد کەوتە ژێر کاریگەری موسەیلەمەو شوێن ئەو کەوت‌و گوتی: موسەیلەمە لە کاری پێغەمبەریدا لەگەڵ موحەممەددا هاوبەشە، موحەممەد خۆشی دانی بەوەدا ناوە"[2].

ئەمەی سەرەوە یەکپارچە وڕێنەیەو قسەی هەلەق‌و مەلەقە، چونکە ئەو قسانە هیچ بناغەیەکی ڕاستییان نییە..

یەکەم: ئەوە ناوی (رحال) نییەو ناو (رجال)ە.

دووەم: نوێنەری پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بەڵکو نوێنەری موسەیلەمەی درۆزن بووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

سێیەم: ئەم (رجال)ە کەسێکی هەلپەرست بووەو زانیویەتی موسەیلەمە درۆزنەو پێغەمبەر ﷺ ڕاست ئەکات، بەڵام نان‌و پلەو پایەی لەو کوفرو بێ دینیو شایەتیدانی ناهەقەدا دەست کەوتووە.

(ابن کثیر) ئەڵێ: "(رجال) ئەو هاوڕێیەی موسەیلەمە بوو کە شایەتی ئەوەی ئەدا لەناو خەڵکداو ئەیوت: من شایەتم موحەممەد (موسەیلەمەی کوڕی حەبیب)ی کردووە بە شەریکی خۆی لە پێغەمبەرایەتیدا، ئەم نەفرین لێکراوە قسەکە هی (ابن کثیر)ە، لە هەموو کەس زیاتر ڕۆڵی هەبووە لە کافرکردنی خەڵکی یەمامەدا تا هەمووی شوێنی موسەیلەمە کەوتن (نەفرەت لە هەردووکیان) بێت، ئەم (رجال)ە بە نوێنەرایەتی موسەیلەمە هاتە لای پێغەمبەر ﷺو ماوەیەك لەوی مایەوەو سورەتی (البقرة)ی خوێند کە سەردەمی ئەبوبەکریش هات جارێکی تر بە نوێنەرایەتی هاتەوە بۆ لای ئەبوبەکریش‌و ئەویش ناردیەوە بۆ یەمامە تا خەڵك بۆلای خوا بانگ بکات، بەڵام هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد پاشگەز بوونەوەی خۆیانیان ڕاگەیاندو دەستی کردە شایەتیدان بۆ موسەیلەمە، گوایە ئەویش پێغەمبەرە"[3].

دەمارگیری ئەوکاتە ئەوەندە کوێرانە بووە لە ڕادەیەکدا بووە کە کابرا درۆزنەکەی ناو عەشیرەتی خۆی بە چاکتر زانیوە لە ڕاستگۆکەی عەشیرەتی بەرانبەر، (ابن کثیر) ئەڵێ: تەلحە ناوێك کە لە عەشیرەتی موسەیلەمە بوو هاتە لای

---

[1] موحەممەد عەبدوڵڵا دراز لە (المدخل الى القران الکریم)دا موناقەشەیەکی زانستی جوانی ئەم ڕایە ئەکات.

[2] (میر فطروس)و مەزدەکیو پێڕەکەی زۆر باسی (نامەگۆڕینەوە)یو موسەیلەمەو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، بە حسابی خۆیان بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە پێغەمبەریش هەر وەك موسەیلەمە بووە یان سوودی (عەقڵی)و (فەرهەنگی) لە موسەیلەمە بردووە، نووسەرانی (سیرة)، لەوانە (طبری) تەنیا باسی ئەو نامە بێتامەی موسەیلەمە ئەکەن بۆ پێغەمبەر ﷺ کە داوای ئەوە ئەکات ئەبێ شەریك بێت لەگەڵیدا لە پێغەمبەرایەتیدا، پێغەمبەریش ﷺ بە توندی وەڵامی ئەداتەوەو بۆی ئەنووسێ لە موحەممەدی عەبدی خواوە بۆ موسەیلەمەی درۆزن، سەلام لەو کەسەی شوێن هیدایەتی خوا ئەکەوێ لە پاشاندا: زەوی هی خوایە بە میراتی ئەیداتە هەر عەبدێکی کە ئەیەوێت‌و عاقیبەتیش تەنیا بۆ خواناسانە.تەبەری ئەڵێ: چ موسەیلەمەو چ ئەوانەی تریش لاف پێغەمبەرایەتییان لێ ئەدا، لاف لێدانەکەیان دوای (حجە الوداع)و نەخۆشکەوتنی پێغەمبەر بوو ﷺ. تأریخ الطبري (٣/٢٢).

[3] البدایة والنهایة (٦/١٧٥ . ١٧٦).

موسەیلەمەو پرسی موسەیلەمە لەوێیە؟ وتیان دەنگ بەرز مەکەرەوە، بڵێ پێغەمبەری خوان وتی: نەخێر تا خۆم ئەیبینم، کە بردیانە لای وتی: تۆ موسەیلەمەی؟ وتی: بەڵێ. وتی: کێ دێتە لات؟[1] وتی: (رجس) دێتە لام، وتی: لە تاریکیدا دێتە لات یان لە ڕووناکیدا؟ وتی: لە تاریکیدا. کابرا وتی: شەهادەت ئەدەم کە تۆ زۆر درۆزنی و موحەممەدیش ڕاستگۆیە، بەڵام درۆزنەکەی ڕبیعەم لا زۆر خۆشەویستترە لە ڕاستگۆکەی (مضر)، ئەم کابرا دەشتەکییە بێعەقڵە کەوتە شوێن موسەیلەمەو لە ڕۆژی (عقربا)دا لەگەڵ موسەیلەمەدا کوژرا[2]. لە سەروو هەموو ئەمانەوە (موسەیلەمە) چ کەلتورو کەلەپورێکی لێ جێماوە کە سەرنجی (میر فطروس)و (سیامەك)و (شوان. ع)ی ڕاکێشاوە، وا بە ئاماژەوە دان بە پێغەمبەرایەتیو ڕۆشنبیرێتیی موسەیلەمەدا ئەنێنو باسی نامە گۆڕینەوەی پێغەمبەر ﷺو موسەیلەمە ئەکەن!! هەموو کەلتوری موسەیلەمە چەند خورافاتو بێ عەقڵییەکە کە نووسەرانی (سیرة) باسی هەندێکیو (ئەوبوبەکری باقەلانی) لە (اعجاز القران)ەکەیدا بە درێژی باسیان کردووە، کە مرۆڤ ناتوانێ پێنەکەنێ کە ئەوانە ئەبیستێ.. یەکێك لەو شتانەی کە لەلای شوێنکەوتووتەکانی ئەیوت ئەمە قورئانە بۆم هاتووە ئەڵێ: "الفيل وماأدراك مالفيل له زلوم طويل" یان ئەڵێ: (ياضفدع بنت الضفدعين، نعي لكم نقيين لا ماء تكدرين ولا الشارب تمنعين، راسك في الماء وذنبك في الطين)[3].

ئەم موسەیلەمەیە ئەیویست لاسایی پێغەمبەر ﷺ بکاتەوەو وەك قورئان بڵێو وەك ئەو موعجیزە بنوێنێ، بەڵام بێ عەقڵە نەیئەزانی خۆ قورئان هی پێغەمبەر ﷺ خۆی نییەو ئەو موعجیزانەش لە دەسەڵاتی ئەودا نینو خوای گەورە بۆی ئەکات تا خەڵکی بڕوا بکەن کە ئەمە نێردراوی خوایە.

زانایانی مێژوو ئەڵێن: "موسەیلەمە ئەیویست خۆی وەك پێغەمبەر ﷺ لێ بکات، ئەوەی بیستبوو کە پێغەمبەر ﷺ تفی کردبوویە ناو بیرێك ئاوەکەی هاتبووە سەر (وەك موعجیزەیەك)، ئەمیش هاتبوو تفی کردبووە ناو بیرێك سەیر ئەکەن بیرەکە وشك ئەکات، تف ئەکاتە بیرێکی تر ئاوەکەی سوێر ئەبێت، دەستنوێژ ئەگرێو ئاوی دەستنوێژەکەی (وەك تەبەرك) ئەکاتە بنی دارخورمایەك بۆ ئەوەی بەرەکەت بیگرێ، دارخورماکە وشك ئەبێتو تیائەچێت! دوو منداڵی بۆ دێنن بەرەکەتی خۆی برژێنێ بەسەریاندا یەکێکیان گەڕە ئەبێو توکی سەری (با) ئەیبات و ئەوی تریان زمانی لاڵ ئەبێتو ناچەرخێ لە دەمیدا.. دوعا بۆ کابرایەك ئەکات، چاوئێشەیەتی بۆ ئەوەی چاك بێتەوە، تەواو کوێر ئەبێت"[4].

(میر فطروس)و (سیامەك)و (شوان. ع)و (مەزدەکیش) زۆر ئەوە دووبارە ئەکەنەوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێکی خوێندەوارو پیاوێکی فەیلەسوفو هۆشیارو بەئاگا بووەو سوودی لە خوێندەوارو ئاینزانەکانی سەردەمی خۆی وەرگرتووەو هەستاوە ئەم (قورئانە)ی داناوە[5].

---

[1] مەبەستی فریشتەو (سروش)ە.

[2] هەمان سەرچاوە (٦/٧١٩).

[3] هەمان سەرچاوە (٦/٧١٨).

[4] البدايه والنهايه (٦/٧١٩).

[5] مەزدەکی نووسەری کتێبی (عەرەبو ئیسلام)ە، لە چاپی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٦)دا باسێکی ئەم کتێبی (ئیسلامناسی)یەی کردووەو جوانکارییەکی – بە حسابی خۆی – کردووە لەم کتێبەدا، باسێکی ناوی کتێبەکە بە ناوی (گوزارشێك لەمەڕ پەڕاوی ئیسلامناسی)ەوە کە بریتییە لە جووینەوەیەکی تری کتێبی (ئیسلامناسی)، بەڵام تێبینی ئەوەی لێدەکرێت ئەم (مەزدەکی)یە دەرسی وەرگرتووە لە کتێبە ڕەخنەییەکانی پرۆژەی تیشك کە ئەیسەلمێنێت ئەم بەناو نووسەرانە کە ئامانجیان تەنیا برەودانە بەبێدینیو بەدڕەوشتی، نەزانو تەزویرچیو ناپاکن لە گواستنەوەی زانیاریدا بە ئارەزووی خۆیان گەزو پێوانە ئەکەن، جا ئەم مەزدەکییە ئەم جارەیان سەرچاوەی نەنووسیوە بۆ قسەکانی زۆر بەدەگمەن نەبێ، تا ئەگەر ڕەخنەشی لێ گیرا باسی ناپاکیو تەزوویرکردنەکانی نەکرێ بەڵام خوایاربێت تا

ئەم بیرۆکەیە لە زۆربەی کتێبەکانی ئەو زاتە گوماناویانەدا دووبارەو چەندبارە ئەبێتەوە ئەیانەوێت لەسەرمەزهەبی (درۆ بکە.. درۆ بکە.. تا خەڵکی ئەو درۆیانەیان لێ ئەبێ بە ڕاست)، تا بە خەیاڵی خۆیان ئەو مەسەلانە بکەنە ڕاستی لای گەنجانی ئەم میللەتە لەکاتێکدا ئەو بیروڕایە لە چەند لاوە ناڕێك‌و ناڕاستە:

١. پێغەمبەر ﷺ ڕاستە پیاوێکی گەورەو عاقڵ‌و داناو هۆشیاربووە (سەڵات‌و سەلامی خوای لەسەر بێت) بەڵام خوێندەوار نەبووەو نووسین‌و خوێندنەوەی نەزانیوە بە زۆر بەڵگەی زمانەوانی‌و مێژوویی.

٢. پێغەمبەر ﷺ بە شایەتی مێژوو دەرس‌و دەوری لای کەس نەبووە، نە (جولەکە)و نە (نەصارا) نە (مەجوسی)و نە کەسی تر، هەروەك موحەممەد عەبدوڵڵا دراز لە کتێبی (مدخل الی القران الکریم، ص١٤١)، و محمد الغزالي لە (فقه السیرة ص(٦٨و ٧٣)دا بە درێژی باسی دەکەن.

٣. قورئانیش (معجزە)یەکە نە لەتوانای پێغەمبەردا هەیە دایبنێ، نە لە توانای (یهود)و (نەصارا)و تەواوی فەیلەسوفەکانی دنیادا هەیە بتوانن وەك ئەم قورئانە بڵێن [1].

(میر فطروس) لە لاپەڕە (١٥)دا ئەڵێ: "دیارە داواکردنی پێغەمبەرایەتی‌و باسی (نبوة) لەو بارودۆخە تایبەتییەی ئەوسای کۆمەڵگەی عەرەبستاندا، پێویستی بە کەسێکی هۆشیارو بەئاگاترو لێهاتوو بوو کە ئەم تایبەتمەنییانەش تەنیا لە کەسایەتی (محمد بن عبدالله)دا بەرجەستە بوو بوو"، هەروەها لە لاپەڕە (٢٠)دا ئەڵێ: "سەلمان کابرایەکی خاوەن فەرهەنگ‌و زانا بووەو زانیارییەکی تەواوی لەسەر ئاینی زەردەست هەبووە.. پێغەمبەر ئەیکاتە کۆیلەی خۆی پاشان ئازادی ئەکات‌و ئەیکاتە ڕاوێژکاری خۆی".

جا سەیر ئەوەیە (مەزدەکی) کە زۆر لەوە ئەچێ هەر هەمان کەسی ئیسلامناسی بێت، ڕستەیەکی زیادە لە (عەرەب‌و ئیسلام)دا ئەخاتە سەر ئەم پەڕەگرافەی ئیسلامناسی بۆ ئەوەی خەڵکی وا تێبگەن گوایە پێغەمبەر ﷺ سوودی ئایینی‌و عەقڵی زۆری لە فەیلەسووفێکی وەك "سەلمان" وەرگرتووەو ئەم قورئانەی داناوە!! ئەوەتا مەزدەکی ئەڵێ: ".. خەڵکی دەیانگوت قسەکانی موحەممەد قسەی سەلمانەو ئەو فێری دەکات.. هەروەها سەلمان تەنیا کەسێك نییە کە خەڵکی ئاماژەیان پێ کردبێت کە یارمەتی موحەممەدی دابێت‌و شتی فێر کردبێت.. موحەممەد لە دوای ئەوەی دەبێتە پێغەمبەر سەلمانی فارسی بە بەردەوامی دەبێتە هاوڕێی"[2]. هەروەها (میر فطروس) لە لاپەڕە (١٩)دا ئەڵێ: "موحەممەد لە ڕێگای (وەرەقە)ەو زانیارییەکی فراوانی لەسەر ئاینەکانی دیکە پەیدا کرد، زۆر کتێبی مێژوویی‌و ئاینیی هەن کە نەخشی (وەرەقە)یان لە هاندان‌و دنەدانی موحەممەد بۆ پێغەمبەر

---

دەست لەو (نەزانین)و (بە ئارەزوو)ەی خۆیان هەڵنەگرن ئێمەش دەستیان لە کۆڵ ناکەینەوەو نایەڵین ببنە دەڵاڵی (بیروباوەڕە ئێکسپاریەرەکانی دنیاو کەش‌و هەوای لاوانی ئەم میللەتەی پێ ئالودە بکەن):

[1] زۆرکەوس هەوڵی داوە خەڵك وا حاڵی بکات، ئەمیش وەك خوا (جل جلاله) ئەتوانی قورئان دابنێ کەچی کەسیان نەیانتوانی.. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ چەندی وەکو موسەیلەمەو (ئومەییە)و لە سەردەمی خەلیفەکانیشدا چەندینی وەکو (حەللاج)و (ڕازی)..و لەم سەردەمەشدا چەندی وەکو (مەهدی پشدەر)و زۆر لە خەڵکانی تری ترسنۆك کە لە پشت جۆرەها ناوی خوازراوەوە خۆیان شاردۆتەوەو ئەم هەوڵەیان داوە بەڵام دیارە خوا ڕاست ئەفەرموێ: (ولن تفعلوا) هەرگیز ناتوانن شتی وەك قورئان بهێنن.. لە ساڵی (١٩٨١)دا لەگەڵ کەسێکی لەخۆبایدا لەسەر ئەم باسە کەوتینە موناقەشە ئەو وتی: برادەرێکم هەیە دەفتەرێکی (سەد پەڕەیی) ڕەخنەی لە قورئان گرتووەو بەتەماشە چاپی بکات‌و ئەیسەلمێنێ کە هەموو خوێندەوارێك ئەتوانێت وەك قورئان‌و جوانتر لە قورئان بهێنێ، منیش وتم: ئەکرێ ئەو دەفتەرە ببینم‌و پێکەوە موناقەشەی بکەین؟ وتی: نەخێر.. کوڕێك کە نوێژیشی نەئەکرد لە مەجلیسەکەدا هاتە قسەو وتی: وەڵڵاهی فلانەکەس ئەگەر قورئان ڕەخنە هەڵبگرێ (یەکێتیی سۆڤیەت) هەر زوو ئەو کارەی ئەکردو چاوەڕێی نەئەکرد کابرایەك لەناو کورداو لە هەڵەبجەدا ئەو کارە بکات، ئەو زاتە کە ئەو داهێنانە گەورەیەی لە (دەفتەرێکی سەد پەڕەییدا) کردبوو، دوایی سەری لە فاڵچێتی‌و سیحربازییەوە دەرچوو خۆشی کردە (شێخ..) لە خەڵکی‌و بە پارە جنۆکەی لە خەڵك دوور ئەخستەوە (بە حسابی خۆی)و ئێستا نیوە شێتێکە لەناو خەڵکدا!.

[2] عەرەب‌و ئیسلام/ مەزدەکی/ ل١٥٥.

پیشان داوه".. جا مەزدەکی هەندێ ڕستە لە (عەرەبو ئیسلام)دا بۆ ئەم پەڕەگرافە زیاد ئەکاتو ئەڵێ: "وەرەقە هەندێك لە ئینجیلی وەرگێڕابووە سەر زمانی عەرەبیو زۆر هانی موحەممەدی دەدا کە خۆی بکات بە پێغەمبەر (جا لە کەوانەشدا ئەڵێ): واتە خۆی بۆ سەر عەرەب بنێرێت . نوسەر."[1].. (میر فطروس) دیسان ئەڵێ: ".. پێغەمبەریش ﷺو دوای بوونی بە پێغەمبەریش سەردانی ئومەییەی کوڕی سەڵتی پورزای کردووە، کە لەگەورە پیاوانی (حنفا) بوو"[2]. ئەم زانیارییانە جگە لەوەی سەرچاوەکانیان یان نین یان سەرچاوەی بێ متمانەن لە ناوزانایانی ئیسلامدا.. بۆ نمونە:

(میر فطروس) ئەوەی (وەرەقە)ی بە حسابی خۆی لە (زندگانی محمد/ حسین هیکل ل١٩٧)و (تمدن اسلام/ جرجی زیدان (ب١/ل٢١)) وەرگرتووە، بەڵام وەك کاری بەردەوامی بە تەزوریرو پینەکردنەوە.. من نوسخەی فارسی (حیاة محمد/ حسین هیکل)م دەست نەکەوت، بەڵام دەقە عەرەبییەکەی شتی وای تێدا نییە.. حسین هیکل ئەڵێ: "خەدیجە چوو بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفلی ئامۆزای، کە پێشتر باسمان کرد، وەرەقە بوو بوویە نەصرانیو فێری ئینجیل بوو بوو، هەندێکیشی گۆڕیبووە سەرزمانی عەرەبی، کاتێك خەدیجە هەواڵی ئەوەی موحەممەد بینیبوویی و بیستبووی بۆی گێڕایەوەو ڕاوبۆچوونو ترسی خۆشی لەو قسانە بۆ باسکرد"، وەرەقە تۆزێك وەستاو وتی: "قدوس قدوس والذي نفس ورقة بيده لئن كذت صدقتني ياخديجة لقد جاءه الناموس الا كبر الذي كان يأتي موسى، وانه نبي هذه الامة فقولي له فليثبت، خەدیجە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە سەیر ئەکات موحەممەد هێشتا هەر لە ناو جێگەیەکدایەو خەوتووە"[3].

با ئیتر خوێنەر ڕێژەی ئەو تەزویرو زیادە پێنانە بزانێت کە ئەمانە ئەیننێن بە نووسینی نووسەرە کۆنو تازەکانەوە بەبی ئەوەی شەرم بیانگرێتو لە ئابڕووچوونو ڕیسوابوون بترسن.. کوا لە کوێی ئەو نووسینەدا هەیە کە (وەرەقە) دنەی پێغەمبەری ﷺ دابێ یان لە کوێدا هەیە زۆر هانی موحەممەدی دابێ کە خۆی بکاتە پێغەمبەر بە سەر عەرەبەکانەوە..! خۆ ئەوەی (محمد حسین هیکل) هێناویەتی تەنانەت ئەڵێ: خەدیجە چووە بۆ لای (وەرەقە) نەك پێغەمبەر ﷺ خۆی.. زیاد لەمانەش باشە (وەرەقە) ئەوەندە شارەزاو بلیمەت بوو بۆچی بەناوی خۆیەوە تەبلیغاتی دینی نەئەکرد، یان بۆچی نەیئەوت من مامۆستای موحەممەدمو ئەبێ ئەو شوێن من بکەوێو من پێغەمبەرم نەك ئەو، پاشان هەموو مێژوو باسی یەك دووجار بینینی پێغەمبەر ﷺ بۆ "بوحەیرا" یان "وەرەقە" ئەکات، کام عەقڵ ئەوە ئەبڕێت بە چەند سەعاتێك موحەممەد ﷺ ئەو هەمووە (زانستو زانیارییە وردو هەمەلایەنە)ی وەربگرێتو لەبەری بکات لە کاتێکدا کە (بوحەیرا)ی لە تەمەنی (٩) ساڵاندا بینیوە[4]، لەسەرو ئەمانەشەوە باشە یانی چی قورەیش تەنیا دژایەتی موحەممەدیان ئەکرد کەچی دژایەتی نە (وەرەقە)و نە (یهود)و نە (نەصارا)و نە (ئومەییە).. هتدیان نەئەکردو نەیانئەوت: هەمووی خەتای ئێوەیە ئەم دینەتان فێری موحەممە کردووە؟!

جا با ئەوەی وتمان:

١. پێغەمبەر ﷺ بەڵێ گەورەوبووە، بەڵام نەخوێندەوار بووە .

٢. قوتابی کەس نەبووە .

٣. قورئانیش لە ئاستی (مرۆڤ) زۆر بەرزترەو بە مرۆڤ ناوترێ، بسەلمێنین ئەگەر بەکورتیش بێت.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ل ١٥٤.

[2] ئیسلامناسی/ ل ١٢٩.

[3] حیاة محمد/ حسين هيكل، ط (١٣) مكتبة النهضة المصرية/ ١٩٦٨.

[4] دراسة في السيرة، عمادالدين خليل، ص ٢٧٢.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو عەزەمەت و گەورەیێتییەی کە هەیبوو پیاوێکی نەخوێندەواریش بوو و ئەوەش نەکەمییە بۆ پێغەمبەر ﷺ و نە زیانیش بە دینەکەی ئەگەیەنێ، لە دوو ئایەتەدا وشەی (امي) لە قورئاندا هاتووە:

خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاء مِنَّا إِنْ هِيَ إِلاَّ فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَاء وَتَهْدِي مَن تَشَاء أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ* وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَـذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَـا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَـاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ* الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ* قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (الأعراف: ١٥٥ ـ ١٥٨).

واتە: موسا هەفتا کەسی لە گەلەکەی خۆی هەڵبژارد، تا بچن بۆ ئەو شوێنەی ئێمە بۆمان دیاریکردبوو، (کێوی طور)، کە کاتێکیش زەمین لەرزەکە هات و گرتنی (موسا) وتی: پەروەردگاری من ئەگەر تۆ بتویستایە منیش و ئەوانیشت بە هیلاکدا ئەبرد، ئایا لە بەر کاری نەزان و گێلەکانی ناومان ئێمە لە ناو ئەبەی . پەروەدگارا . ئەوە ئاقیکردنەوەی خۆتە ئەیکەیتە مایەی گومڕاهی بۆ هەرکەسێك بتەوێ و ئەیکەیتە مایەی هیدایەتیش بۆ هەرکەسێك بتەوێ، هەر تۆ پشتیوانی هەمووماني، لێمان خۆش ببەو سۆزت بێتەوە پێماندا کە هەر تۆ باشترین لێخۆشبوی* شتی چاکمان لەم دونیایەدا بۆ بنووسەو لە ئاخیرەتیشدا هەروەها ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆلای تۆ، خواش فەرمووی: سزام تووشی هەموو ئەوانە ئەکەم کە ئەمەوێت و سۆزو ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی ئاخنیوەو بۆ ئەو کەسانەشی ئەنووسم کە تەقوایان هەیەو زەکات ئەدەن و هەروەها ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتەکان (بەڵگەکان)ی من هەیە* ئەوانەی کە شوێن ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ئەکەون کە (ناوو سیفەتەکانی) لە تەوراتەکەی لای خۆیاندا ئەبینن، هەروەها لە ئینجیلدا، ئەو پێغەمبەرەی کە فەرمانیان پێ ئەکات چاکە بکەن و بەرگرییان ئەکات لە خراپەکردن و شتە پاك و بەسوودەکانیان بۆ حەلاڵ ئەکات و شتە پیس و زیانبەخشەکانیشیان لێ حەرام ئەکات و ئەرکە قورسەکانیان لەسەر لائەبات و ئەو کۆت و زنجیرەش لەگەردنیاندایە ئەیشکێنێ و هەموو ئەو کەسانەش کە بڕوای پێ دێنن و بەرز ڕایئەگرن و سەری ئەخەن و بەشوێن ئەو (نور)ەدا ئەچن کە لەگەڵیدا دابەزێنراوە، ئەوانەو تەنیا ئەوانە سەرکەتوو ئەبن* ئەی پێغەمبەر تۆش بڵێ: خەڵکینە، من پێغەمبەری خوام بۆلای هەمووتان هاتووم ئەو خوایەی کە خاوەنی موڵکی ئاسمانەوکان و زەوییە کە هیچ خوایەکی تر نییە ئەو نەبێ کاری زیندووکردنەوەو کاری مراندن هەر بەدەست ئەوە بڕوا بەخواو بەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکەن، کە ئەوپەڕی بڕوای بەخواو قسەی خوا هەیەو بە شوێنیدا بڕۆن بەڵکو هیدایەت وەربگرن.

لەم چەند ئایەتەدا دووجار وشەی (الأمي) بەکار هاتووە کە هەموو زانایانی زمانەوانی ئەڵێن: "الأمي: من لايعرف الكتابة ولا القراءة، والامية جهل الكتابة والقراءة، نقول مكافحة الامية"[1]، واتە: (امي) کەسێکە نەنووسین نە خوێندنەوە نەزانێت، (امیە)ش (نەخوێندەواری) بریتییە لە نەزانینی نووسین و خوێندنەوە، ئەوتری قەلاچۆکردنی (امیة) واتە نەخوێندەواری پێغەمبەریش ﷺ خۆی ئەفەرموێت (انا امة امية) یان ئەفەرموێت (ما أنا بقاريء) (ئێمە میللەتێکی نەخوێندەوارین)، (من نازانم بخوێنمەوە) زانایانی مێژووش بە درێژی باسی هەموو ژیانی پێغەمبەریان کردووە، کە هیچ کەسێکی تر نییە لە هەموو دنیادا بەو درێژیە ژیانی نووسرابێتەوە ئەو نەبێت، کەچی هیچ

[1] المنجد في الغة والاعلام/ ماددەی "ام".

مێژوونووسێك باسی ئەوەی نەکردووە کە فلاّنە ساڵ چووبێتە بەر خوێندن یان لای فلاّنەکەس خوێندوویەتی، یان فلاّنە کتێبی نووسیبێت، هەروەها ئەوە قورئان باسی نەخوێندەواری (امي) پێغەمبەر ﷺ دەکاتو ئەوەش زمان (اللغة) کەشتێکی (بێلایەن)ەو (امي) بە نەخوێندەوار مانا ئەکاتو ئەوەش پێغەمبەر ﷺ خۆی دانی پێدا ئەنێ وەك ئەشلێن: (الاقرار سيد الادلة) ئەوەش مێژوو.. ئیتر نازانم بۆچی هەندێ کەس هەر سواری سەریان ئەبن و نکولی لە (نەخوێندەواری) پێغەمبەر ﷺ ئەکەن و گوێ بە ئەم هەموو سەلماندنەی نادەن.. هۆکەی، خوا زاناترە. ئەوەیە ئەیانەوێ بە بەردێ دوو نیشانە بشکێنن:

یەکەم: سیفەتی پێغەمبەرایەتی لە (محمد) بکەنەوەو وەك فەیلەسوفێكو پیاوێکی عەبقەری دەریخەن، تا خۆیان لەوە بدزنەوە کە باس لە شوێنکەوتنی خۆیو دینەکەی بکرێو باسی یاساو ڕێنماییەکانی وەك حەلاڵو حەرام بکرێ تا ئەوو ئەفلاتونو ئەرستۆو کێو کێ یەکسان بکرێت..

دووەم: بەم سەلماندنە ڕەتی هەموو ئەو ئایەتو فەرموودانە بکەنەوەو کە باس لە نەخوێندەواری پێغەمبەر ﷺ ئەکاتو بەوەش ڕێگەیان بۆ خۆش ئەبێت گومانو دوو دڵی لەسەر هەموو برگەکانی ئیسلام دروست بکەنو ڕەخنە لە تەواوی ڕێنماییو یاساکانی بگرنو وەك دیاردەیەکی کۆمەلاّیەتی نەك ئاینێکی خوایی خەڵك سەیری بکات.

شتێکی سەیرتر ئەوەیە هەندێ لەم تەزوویرچیانە کە (مير فطروس) یەکێکیانە بە فێڵەوە ئەڵێن: "بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە سەرچاوە ئاینییەکان دەیڵێن: حەزرەتی موحەممەد نەك هەر کابرایەکی نەخوێندەوار نەبووە بگرە زۆریش خاوەن هۆشو بە فەرهەنگ بووە، هەر بە پشتبەستن بەو زانیاریو فەرهەنگانەوە بوو کە ئاینی ئیسلامی دامەزراند"[1].

بە زمانێکی تری ساختەکارانەوە فێڵ لە خوێنەری ئەکاتو ئەڵێ: "بێگومان سەرپەرشتی کردنی دامەزراوە گەورە بازرگانییەکەی خەدیجە پێویستی بە زانینو شارەزاییەکی زۆر بووە، ئەم مەسەلەیە دەبێت بەتایبەتی بە گوێی ئەو مێژوو نووسانەدا بدریتەوە کە پێغەمبەر بە کەسایەتییەکی بێ ئاگاو نەخوێندەوار دەناسێنن"[2].

فێڵەکەی لەوەدایە دوو وشەی (بێئاگا)و (نەخوێندەوار) پێکەوە گرێ ئەدات وەك ئەوەی گوایە موسڵمانان کە ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوارە ئەوە وەك ئەوە وایە بڵێن بێئاگایە!! یان وەك ئەوەی هەموو نەخوێندەوارێك هەر ئەبێ بێ ئاگابێت یان هەموو خوێندەوارێ حەتمەن بەئاگایە، لە کاتێکدا ئەو دوو شتە کەسیان (لازم)و (مەلزوم)ی یەکتر نین، ئەگونجێ کەسێك نەخوێندەوار بێتو زۆر عاقڵو هۆشیارو لێوەشاوەش بێت هەروەك ئەبینرێ خوێندەواری وا هەیە هەژارە (قل) لە (فل) جیا ناکاتەوە، بەڕاستی ئەم نووسەرانەی ئێستا کە پەلاماری ئیسلام ئەدەنو نەشتەری ڕەخنەی نەزانانەی لێ هەڵئەگرن! زۆرجار ئەکەونە هەڵەی واوە کە هیچ منالێکی سەرەتایشی تێ ناکەوێ[3]، سەیرو سەمەرەی تر ئەوەیە (مير فطروس)و (مەزدەکی)و (بابەکی)و (زەردەشتیانە) خۆیان ئەپێچنە باسو زانیاری ئالۆزی وا کە خوێنەرەکانیان دوایی ئەگەر خنکان لە ناو دەریای جەهالەتیاندا بواری هیچ نامێنێتەوە بیڵێن پێیان ئەوە نەبێت: تفی خۆت بکەو بڕۆ! ئاخر تۆ زیندەگی منت لەبەین برد، تووشی وەهمو نەزانینو ئارەزوو

---

[1] علی مير فطروس (ئیسلامناسی) (ل٢٣).

[2] هەمان سەرچاوە (ل٩٩).

[3] بۆ نموونەو تەنیا بۆ نموونە (مەزدەکی) لە کیتبی (عەرەبو ئیسلام)دا لاپەڕە (١٨٢) ئەڵێ: هەرچەندە عومەر بە دادپەروەری ناسراوە کەچی خۆی لە کوشتنەوەی بکوژانی عوسمانی کوڕی عەفان لاداوە بە بیانووی ئەوەی کە ئیمامی عەلی گوتوویەتی نابێ چەند کەسێك لەبری یەك کەس بکوژرێ.. جا توخوا خوێنەری بەڕێز! هیچ نەخوێندەوارێك نەزانینی وا ئەکات، (عومەر) کە پێش (عوسمان) مردبێتو عوسمان دوای ئەو بووبێتە خەلیفە ئیتر چۆن عومەر هاتە ژیانو دادگای بۆ بکوژانی عوسمان دانا؟ ئەگەر نەیوتایە (عومەر کە بەدادپەروەر ناسراوە) من گومانی هەڵەی چاپم ئەبردو ئەموت: لەوەئەچێت ناوێکی تر بێت جگە لە عومەری کوڕی خەتتاب، بەلاّم دیارە کابرا هەر بە ڕاستیی مەبەستی عومەری کوڕی خەتتابە.

بازیت کردووم‌و له (دین)و (عه‌قڵ) (عاقڵان‌و به‌ره‌و شتانت) کردم چۆن به‌ تفێك بیكه‌مه‌ ناوچاوی تۆ قه‌ره‌بووم بۆ ئه‌كه‌یته‌وه‌؟!

یه‌كێك له‌و باسه‌ ئاڵۆزانه‌ ئه‌وه‌یه‌ (میر فطروس) له‌ لاپه‌ڕه‌ (٢٤)دا ئه‌ڵێ: "مه‌سه‌له‌ی خوێنده‌وارنه‌بوونی پێغه‌مبه‌ر درۆیه‌كی مێژووییه‌، ویستیان كه‌ڵك له‌م ئامرازه‌ وه‌ربگرن‌و (محمد) وه‌ك كه‌سایه‌تییه‌كی ئه‌فسوناوی‌و سه‌رو سروشت بنوێنن‌و بۆ به‌ره‌و پێش بردنی باوه‌ڕه‌ ئه‌ندێشه‌كانی (به‌ناوی قسه‌ی خواوه‌) كه‌ڵك له‌م په‌رجووه‌ (معجزه‌) وه‌ربگرن، له‌كاتێكدا ده‌زانین وشه‌ی (امی) ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ (ام القراء= مه‌ككه‌)ی زێدی پێغه‌مبه‌ر"ت.

دوای ئه‌مانه‌ په‌راوێزێكی دوورو درێژی هێناوه‌ كه‌ گوایه‌ (ام القری) ئه‌گه‌ر (ی) نیسبه‌تی بچێته‌ سه‌ر ئه‌بێته‌ (امي) له‌ وه‌ڵامی ئه‌م (سواری سه‌ری خۆی بوونه‌ی (میر فطروس))دا ئه‌ڵێین:

١. تۆ له‌وه‌دا به‌هه‌ڵه‌داچووی كه‌ هه‌رچی (أم القرى) هه‌یه‌ كردووته‌ به‌ (ام القراء)، چونكه‌ (القرى) كۆی (القرية)یه‌و (القراء) كۆی (قارئ)ه‌، وه‌ك كابرای كورد ئه‌ڵێ: "ئه‌و دوانه‌ ته‌نیا خوایان یه‌كه‌"[١] و زۆر له‌یه‌كتر جیاوازن.

٢. له‌ زمانی عه‌ره‌بیدا وشه‌كان دوو جۆرن: وشه‌ی ساده‌و وشه‌ی لێكدراو، وشه‌ی لێكدراویش سێ جۆره‌: (مركب مزجي)و (مركب اضافي)و (مركب أسنادي)، وشه‌ی (مركب مزجي) وه‌ك بعلبك، معدی كرب.. وشه‌ی (مركب اضافي) وه‌ك (أم القرى، صلاح الدين)، (مركب اسنادي) وه‌ك (تأبط شرا، ذرحيا، حيص بيص)..

جا زانایانی زمانه‌وانی (علماء اللغة) ئه‌ڵێن:

. وشه‌ی لێكدراوی (مزجي) كاتێك (ياء)ی نیسبه‌تی بچێته‌ سه‌ر ئه‌وه‌ پاشكۆكه‌ی لائه‌برێت‌و (ياء)ه‌كه‌ ئه‌چێته‌ سه‌ر پێشه‌كه‌ی، وه‌ك: (بعلبكی) بۆ وشه‌ی (بعلبك) هه‌ندێكیش ئه‌ڵێن ئه‌چێته‌ سه‌ر هه‌ردووكیان واته‌: ئه‌بێته‌ (بعلی بكی).

. وشه‌ی لێكدراوی (اضافي) كاتێك (ياء)ی نیسبه‌تی بچێته‌ سه‌ر ئه‌وه‌ سه‌ره‌تاكه‌ی لائه‌برێ‌و (ياء)ه‌كه‌ ئه‌چێته‌ سه‌ر پاشكۆكه‌ی وه‌ك (ام القروی) (صلاح الديني) هه‌ندێكیش ئه‌ڵێن: ئه‌چێته‌ سه‌ر هه‌ردووكی له‌ هه‌ندێ وشه‌دا وه‌ك وشه‌ی لێكدراوی (مزجي) نیسبه‌ت ئه‌درێت.

. وشه‌ی لێكدراوی (اسنادي)یش (ياء)ه‌كه‌ ئه‌خرێته‌ سه‌ر سه‌ره‌تاكه‌ی، وه‌ك: (تأبطي).

٣. هه‌موو ئه‌و وشانه‌ی كه‌ له‌ عه‌ره‌بیدا پێیان ئه‌وترێ (كونيه) واته‌ (أب) یان (ام) یان (ابن)ی پێوه‌ بێت (ياء)ی نیسبه‌ته‌كه‌ی ئه‌چێته‌ سه‌ر به‌شی دووه‌می وشه‌كه‌، وه‌ك:

أبو حنيفة – حنفي

ابن حنبل – حنبلي

ام القرا – قروي

ام غيلان – غيلاني

ابن سبأ – سبأي

ئیتر ئه‌وه‌ بنه‌ما (قاعده‌)یه‌ له‌ زمانی عه‌ره‌بیدا ناكرێ یه‌كێ له‌و لاوه‌ ڕاست بێته‌وه‌و عه‌ره‌بی نه‌زانێ‌و پێچه‌وانه‌ی (قاعده‌) قسه‌ بكات[٢].

---

[١] شایانی باسه‌ له‌ هه‌موو كتێبه‌كه‌دا هه‌ر به‌ (القراء) (ام القراء) ئه‌ینوێ، چونكه‌ دیاره‌ هه‌ر نازانێ جیاوازییان چییه‌، ناشكرێ بوترێ ئه‌مانه‌ هه‌ڵه‌ی چاپن، چونكه‌ ئه‌ی هه‌ڵه‌ی چاپ له‌ وشه‌ كوردییه‌كاندا بۆ نییه‌ یان ده‌گمه‌نه‌!.

[٢] چۆن ئێمه‌ی كورد ئه‌گه‌ر یه‌كێ بڵێ فلانه‌كه‌س خه‌ڵكی (دوانزه‌ییه‌) له‌ جیاتی نیسبه‌تدانانی به‌لای (دوانزه‌ ئیمامی)ی لای هه‌ڵه‌بجه‌دا، ئه‌چین به‌گژیا ئه‌مه‌ی (میر فطروس)یش هه‌ر شتێكی وایه‌..

هەوڵێکی نەزۆکانەی (میر فطروس) بۆ سەلماندنی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کابرایەکی خوێندەوار بووە بە پێچەوانەی ڕاستییە مێژووییەکانو زەمانەوانیو سەلماندنی خوا لە قورئانداو پێغەمبەر ﷺ خۆی لە فەرمودەدا . ئەوەیە گوایە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێکەوتننامەی (حودەیبییەدا کە قورەیش داوا دەکەن وشەی (رسول الله) بکوژێننەوە، عەلی نکولی لێ ئەکاتو پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەیکوژێنێتەوەو لە جیاتی (محمد رسول الله) ئەنووسێ (محمد بن عبدالله) جا ئەم بەڵگەیەش لەوانەی پێشووتری بێماناترە:

١. چونکە ئەوە دژی ڕیوایەتە ڕاستەکانی مێژووە.

٢. ئەوە دژی هەموو ئەو ڕاستیانەی ترە کە ئێمە لە پێشەوە باسمان کرد (قورئان . فەرمووده . زامانەوانی . ڕاستییە مێژووییەکان).

٣. دژی خوێندنەوەی لۆژیکانەی ئەو دەقەیە کە باسی سڕینەوەو نووسینەوە ئەکات لەو ڕیوایەتەدا..

سەرەتا ڕیوایەتی ڕاستەقینەی مێژوو بۆ ڕووداوەکەی حودەیبییە ئەمەیە کە هەموو نووسەرانی (سیره) باسی دەکەن..

ئیمامی بوخاری لە (صحيح)ەکەیدا ئەڵێ: "بە ڕائی کوڕی عازب (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاشتی ڕاگەیاند لەگەل خەڵکی حودەیبییەدا، عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێبێ) ئاشتینامەکەی لە نێوانیاندا ئەنووسی، نووسی (محمد رسول الله) موشریکەکان وتیان: مەنووسن (محمد رسول الله)، چونکە ئێمە ئەگەر بمانزانیایە پێغەمبەری خوایت شەڕمان لەگەڵ نەئەکردی، پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو: بیسڕەوە، (عەلی)یش وتی: من ئەو کەسە نابم ناوی تۆ ئەسڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ خۆی سڕییەوە"[1]، ئیمامی (موسلیم)یش هەمان فەرمووده ئەهێنێو تەنیا لەفزی (بە دەستی خۆی سڕیەوە)ی زیادە لە بوخاری[2].

هیچ یەکێك لەو دوو کتێبە (صحيح)ە باسی ئەوە ناکەن کە پێغەمبەر ﷺ خۆی نووسیبێتی، هەموو ئەو کتێبانەش لە (سیره)دا نوسراون بەم شێوەیە باسی نووسینی ئەو ئاشتینامەیە ئەکەن.. بۆنمونە (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیداو لە (البداية والنهاية)کەشیدا ئەڵێ: ".. کە سوهەیلی کوڕی عەمر هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: بێنە با ئاشتینامەیەك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بنووسین، پێغەمبەر ﷺ (عەلی) بانگ کردوو فەرمووی: (اكتب بسم الله الرحمن الرحيم)، سوهەیلی کوڕی عەمر وتی: بەڵام وەڵڵاهی من نازانم (الرحمن) چییە، نا، بنوسە (باسمك اللهم) وەك چۆن لەمەو پێش ئەتنوسی، موسڵمانەکان وتیان: سوێند بەخوا هەر ئەبێ بنوسێ (بسم الله الرحمن الرحيم)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (قەیناکا) بنوسە (بسمك اللهم) پاشان پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە ئەو ئاشتینامەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خوا نووسیویەتی.. سوهەیل هەڵیدایەوەو وتی: وەڵڵاهی ئەگەر بمانزانیبا تۆ پێغەمبەری خوای نە شەڕمان لەگەڵ ئەکردیو نە بەرگری ماڵی خواشمان لێ دەکردی، بەڵکو بنووسە (محمد بن عبدالله) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (والله اني لرسول الله وان كذبتموني، أكتب محمد بن عبدالله)، لە ڕیوایەتێکی تردا ئیمامی ئەحمەد ئەفەرمووێ: سوهەیل وتی: (لو نعلم انك رسول الله لأتبعناك، ولكن أكتب اسمك واسم ابيك)"[3](*).

(محمد حسين هيكل)یش لە (حياة محمد)دا ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوتالبی بانگ کردوو پێی وت: "اكتب بسم الله الرحمن الرحيم، سوهەیل وتی: امسك لااعرف الرحمن الرحيم، بل اكتب: بسمك اللهم"، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: اكتب بسمك اللهم، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هذا ما صالح عليه محمد رسول الله سهيل بن

[1] ارشاد الساری (٤/٤٢٢).

[2] ارشاد الساری (٧/٤١٤).

[3] مختصر تفسير ابن كثير/ علي الصابوني ج٢/ص٣٥٢/ط (٥)/١٩٨٦/ دار التعليم/ بيروت/ لبنان.

* لە هەموو دنیادا هەروایە (ئاشتینامە) ئەبێت بە ڕەزامەندی هەردوولایەنی شەڕەکەر بنووسرێ نەك یەك لایەنە.

عمرو..، سوهەیك وتی: امسك، لو شهدت انك رسول الله لم اقاتلك، ولكن اكتب اسمك واسم ابيك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: اكتب هذا ما صالح عليه محمد بن عبدالله". پاشان تەواوی بڕگەكانی ئاشتینامەكەیان نووسی[1]، (مباركفوری)یش لە (الرحيق المختوم: ص ٣٢٩)و موحەممەد ئەلغەزالی لە (فقه السيرة: ص ٣٦٠)و موحەممەد عەلی ئەلصەلابیش لە (السيرة النبوية ٢/ص٢٥٤ . ٢٥٥).دا هەر بەهەمان شێوە باسی ئەو ڕێككەوتننامەیە ئەكەنو كەسیان باس لەوە ناكەن پێغەمبەر ﷺ خۆی ئاشتینامەكەی لە عەلی وەرگرتبێتو لە جیاتی (محمد رسول الله) (محمد بن عبدالله)ی نووسیبێ.

(ابن كثير) لە (البداية والنهاية)دا ئەڵێ: لە ڕیوایەتێكی صەحیحدا هاتووە كە عەلی وتی: (والله لاأمحوك ابدا) پێغەمبەر ئاشتینامەكەی لەدەست وەرئەگرێتو ئەنووسێ: (هذا ما قاضي عليه محمد بن عبدالله) بەلاّم ئەم ڕیوایەتە زانایان قسەیەكی زۆریان لەسەر كردووەو ئێمەش لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا كە ئەفەرموێ: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨)[2]، هەندێكمان باس كردووە[3]، جا (ابن كثير) لە تەفسیرەكەیدا دەربارەی ئەم ئایەتە ئەڵێ: واتە ئەی پێغەمبەر تۆ ماوەیەكی زۆر لەناو ئەم گەلەدا بووی‌و تەمەنێكت لەناویاندا سەرف كردووە پێش ئەوەی ئەم قورئانەت بۆ بێت، كە نەخوێندنەوەو نە نووسینت نەزانیوە، هەر بەو شێوەیەش وەسفكراوی لە كتێبە پێشووەكاندا وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الأعراف: ١٥٧).

بە پێی ئایەكە پێغەمبەر ﷺ بە هەر بەو شێوەیەش تا قیامەت ئەمێنێتەوە نە ئەتوانێ دێڕێ یان پیتێ بنووسێ‌و نە ئەتوانێ شتی بخوێنێتەوە، بەڵكو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو شتێ نووسەری تایبەتی هەبووە، چ بۆ (سروش) نووسینەوە چ بۆ نامە ناردن بە هەرێمەكاندان هەندێ كەسیش فەرموودەیەك باس ئەكەن گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی بمرێ خۆی فێری نوسین كردووە ئەوە فەرمودەیەكی (ضعیف)ەو هیچ بناغەیەكی نییە[4].

ئەمە بۆ ڕاڤەی حاڵی یەكەم كە وتمان ئەوەی (میر فطروس) ئەیڵێ دژی ڕیوایەتە ڕاستەكانی مێژووە..

هەروەها ئەوەی (میر فطروس) دژی هەموو ڕاستییەكانی ترە كە باسمان كرد قورئان بە (امی) ناوبردووەو هەروەها قورئان ئەفەرموێ: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨)، واتە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا پێش هاتنی ئەم قورئانە بۆ سەرت، نەت ئەزانی هیچ كتیبێك بخوێنیتەوە یان بەدەست شت بنووسی، ئەگەر وانەبوایە كەواتە، (خەڵكی ناهەق) ئەكەوتنە ناو گومانەوە.

(سبحان الله)! وەك ئەوەی ئەم ئایەتە بۆ ئەمڕۆو دەربارەی كەسانی وەك (میر فطروس و مەزدەكی‌و زەردەشتی و بابەك..)و پیڕەكەیان دابەزیبێ! ئایەتەكە ئەفەرموێ (بە مەعنا) ئەگەر خوێندەواربویتایە "خەڵكێكی ناهەق"ی وا هەبوو گومانی ئەبرد كە ئەم قوئانە زادەی بیرو بیركردنەوەی خۆت بێت‌و سودت لە سەرچاوەو خەڵكی ترەوە وەرگرتبێت، ئەمە بنەمایەكی لۆژیكی وردە كە لە دوو سەرەتاو ئەنجامێك پێكهاتووە، وەك لە زانستی (منطق)دا باس ئەكرێ.

---

[1] حياة محمد/ هيكل/ ص٣٧٤.

[2] مەبەستی (ابن كثير) ئەوەیە لە تەفسیرەكەی خۆیدا واتە: (تفسير القرآن العظيم: ابن كثير) ئەو مەسەلەیەی باس كردووە.

[3] البداية والنهاية (٥٣٣/٤).

[4] مختصر تفسير ابن كثير (٤٠/٣).

تۆ نە خوێندنەوەو نە نووسینت نەزانیوە لەوەو پێش

قورئانیش کتێبێکە نووسینو خوێندنەوەی تێدایە.

کەواتە قورئان زادەی بیرو بیرکردنەوەی تۆ نییەو با هەموو کەس دڵنیابن لەم ڕاستییە، ئەگەر تۆ خوێندەواربویتایە جێگەی خۆی بوو گومانێکی وەها ببرێت پێت لەلایەن خەڵکەوە، مادامێك ئەوەیان وانییە کەواتە ئەمیشیان وانییە، بە نیسبەت خوێندنەوەی لۆژیکیانەش بۆ ئەومەسەلەیە کە ئەڵێ:

پێغەمبەر ﷺ ئاشتینامەکەی لە عەلی وەرگرتو بە دەستی خۆی سڕییەوەو پاشان نووسی (محمد بن عبدالله) خوێندنەوەکەی ئەوەیە کە (عەلی) ڕەزای خوای لێبێ، پێی ناخۆشبووە وشەی (رسول الله) بکوژێنێتەوەو بەبێ ئەدەبی زانیوەو نەیویستووە خەڵکی وابزانن سڕینەوەی وشەی (رسول الله) لای شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ﷺ مەسەلەیەك نییەو زۆر شتێکی سروشتییە بۆیە حەزی کردووە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەو کارە بکات..

کە پێغەمبەر خۆی سڕیویەتییەوە دیارە یەکێکی تر نووسیویەتییەوە، ئیتر عەلی بوبێت یان جگە لە عەلی بووبێت.. ئەوە خوێندنەوەیەکی لۆژیکیانەو هەر لە خوێندنەوەی پیاوی عاقڵە کە کاتێك کەسێك ئەڵێ: سەرۆك فلان نامەی نووسی بۆ فلانە سەرۆکی تر واتێ ئەگات کە مەرج نییە بە دەستو پەنجەی خۆی نووسیبێتی، چونکە هەڵئەگرێ . ئەنجومەنی شوراکەی یان ئۆفیسی تایبەتی خۆی نامەکەیان نووسیبێو ئەویش مۆری کردبێ، ئەوە شتێکی سروشتییە ئەوەتا ئەوترێ "بنی الامیر المدینة" واتە: بە بڕیارو ئاگاداری ئەو، نەك وەك (میر فطروس) حاڵی بووە گوایە "ئەمیرەکە خۆی پاچو بێڵی هەڵگرتبێتو بەرد بەبەرد خەریکی دروستکردنی شارەکە بووبێت"[1].

ئەمانە هەمووی لە لایەك، لەلایەکی ترەوە قورئان ئەوەندە شتێکی بچووكو سادە نییە پێغەمبەر ﷺ بتوانێ دایبنێ . هەرچەندە زۆر خوێندەوارو لیوەشاوەش بێت نەك پێغەمبەر ﷺ بەڵکو تەواوی زاناو فەیلەسوفو خوێندەوارەکانی دونیا تا قیامەت ناتوانن شتێکی وەکو قورئان دابنێن.. کێش بڕوا ناکات فەرموو ئەوە عەرزو ئەوەش گەز.. (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ* فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٣ . ٢٤)[2].

. (عەلی میر فطروس) ئەیەوێ تەفسیری ئەو ئایەتەی دینی مارکسیزم بکات کە ئەڵێ: "مێژوو جگە لە ململانێی چینایەتی شتێکی تر نییە"، بۆیە ملی ڕووداوە مێژووییەکانی مێژووی ئیسلامیی ئەگرێتو لاری ئەکاتەوە تا لاگیری لەم بیروڕا ئیکسپایەرە بکات، ئەوەتا ئەڵێ: "ئەستۆکراتو دەوڵەمەندەکان وای بۆدەچوون کە ئاینی موحەممەد کۆتایی بە دەسەڵاتی ئابووریو ژیانی سیاسییو سەروەری چینایەتییان دێنێت، ئەرستۆکراتو دەوڵەمەندەکانی قورەیش بەپێی لێکدانەوەیان بەجۆرێك دەستیان دایە دژایەتی کردنو ئازاردانی موحەممەد تەنانەت حەزرەتی موحەممەدیان بۆ ماوەیەکیش تووشی نائومێدی کردو درێژەی کێشا، بەڵام لە درێژەی ئەو نائومێدییەدا بۆ ئەوەی ئەرستۆکراتەکانی قورەیش بکاتە لایەنگری خۆیو ڕایانکێشێت بەلای خۆیدا دەستی کرد بە ستایشو پێدا هەڵگوتنی بتە گرنگەکانی قورەیش"[3]، جا دوای ئەوە باسی ڕووداوی هەڵبەستراوی (غەرانیق) ئەکات[4]، گوایە پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا ڕۆژێك لە کەعبەدا ئەبێ سورەتی (النجم) ئەخوێنێ تا ئەگاتە ئەو ئایەتەی ئەفەرموێ (أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى* وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى) (النجم: ١٩ . ٢٠)، پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو سێ ڕستەیە زیاد ئەکاتو ئەڵێ: (تلك الغرانيق الاولى وان شفاعتهن لترتجى!)، دوای ئەوە بەردەوام ئەبێت لەسەر ئایەتەکان تا ئەگاتە

---

[1] بۆ زیاتر بەڵگە لەسەر ئەم خاڵە بڕوانە (مدخل الى القران الكريم) عرض تأريخ وتحليل مقارن، د. محمد عبدالله دراز، ص ١٤٠.

[2] بۆ بەرزی قورئانو هەمەڕەنگی بابەتەکانیو ئیعجازی قورئان سەیر کتێبی (مناهل العرفان/ الزرقاني) بکە، بەتایبەتی بەرگی دووەمی.

[3] ئیسلامناسی، ل ٢٦.

[4] ئیسلامناسی، ل ٢٧.

کۆتایی کە ئەفەرموێت (فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا) خۆی کڕنوش ئەباتو هەرچی موسڵمانو کافریش هەیە کڕنوش ئەبەنو ئەو هەواڵە ئەگاتە هەموو دنیاو کۆچەرانی حەبەشەش ئەمە ئەبیستن و ئەگەڕێنەوە بۆ مەککە..

ئەم چیرۆکە درۆینە لە دێر زەمانەوە دەم بەدەم گێڕراوەتەوەو هەندێ لەموفەسیرو نووسەرانی (سیرە) کە گوێ بە (سند)ی فەرمووده نادەن ئەم چیرۆکە پووچەیان باسکردووە بێ ئەوەی موناقەشەی بکەنو لەوانیشەوە زۆربەی زۆری (ڕۆژهەڵاتناسان)[1] وەك دوو هەنگیان لە دارێکدا دۆزیبێتەوە بەردەوام باسی دەکەن، ئەم درۆو بوختانە لە زۆر ڕووەوە پووچیو بێ مانانیی ئاشکرایە، بەڵام ئێمە زۆر بە کورتی ئەو وەڵامانە ئەنووسینەوە کە بە ڕێز "محمد حسین هیکل" لە (حیاة محمد)دا هێناونی بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم چیرۆکی (غەرانیقە).

"هیکل" لەژێر ناونیشانی "فشۆڵی (تهافت) چیرۆکی غەرانیق"دا ئەڵێ: "ئەم چیرۆکی (غەرانیق)ە زیاد لە یەکێك لە نووسەرانی سیرە باسیان کردووە، زیاد لە موفەسیرێکیش ئاماژەیان بۆ کردووە، زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسانیش لەسەری ڕاوەستاون، ئەم هەواڵەش هەواڵێکی فشۆڵو پووچەو بە کەمترین لێکۆڵینەوە لەبەریەك هەڵدەوەشێت، سەیرم دێ هەندێ موفەسیرو نووسەری (سیرە) باسیان کردووە، هەر لەبەر پووچیو بێ مانایی ئەم چیرۆکەیە کە لە "ئیبن ئیسحاق"[2] یان پرسی ڕات چییە بەرامبەری: بێ دودڵی وتی: زەندیقەکان[*] دایان ناوە! هەرچەند هەندێ لەوانە ئەم چیرۆکەیان هێناوە ئەیانەوێ پشت بە هەندێ ئایەت ببەستن بۆ ڕاستکردنەوەی چیرۆکەکە وەك ئایەتی: (وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ..)، هەروەها ئایەتی: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيم* لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ) (الحج: ٥٢ . ٥٣). جا هەندێ وشەی (تمنى) بە خوێندنەوە مانا ئەکەن! هەندی تریش هەر بە (هیواو حەزە) زانراوەکە تەفسیری ئەکەن[3].

ئەمانە بە دواشیاندا ڕۆژهەڵاتناسان ئەڵێن.. موحەممەد بۆ ڕزگارکردنی خۆیو شوێنکەوتەکانی لە دەست ئەشکەنجەی قورەیش خۆی بردە پێشەوە لە قورەیش و ئەو پیاهەڵدانەی کرد بەناو ئایەتەکانی سورەتی (النجم)دا لەوانە ڕۆژهەڵاتناس (سیر ولیم مویر)[4]، کە ئەمەیان ئەڵێ: بەڵگە لەسەر ئەوەی چیرۆکی غەرانیق ڕاستە ئەوەیە کۆچکەرانی حەبەشە دوای ئەم هەواڵە گەڕانەوە بۆ مەککە، جا (محمد حسین هیکل) یەك یەك ئەو بەڵگە لاوازانە ڕەت ئەکاتەوەو بە گومانەکەی (مویر) دەست پێدەکات.

١. هاتنەوەی کۆچکەرانی حەبەشە لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەمیان: (موسڵمانبوونی عومەری کوڕی خەتتاب دوای کۆچی ئەوان بە کەمێك)، موسڵمانبوونی عومەریش بە نهێنی نەبوو بەڵکو بە ئاشکرا چووە ناو موشریکەکانو (تحدى)شی کردنو لەگەڵ موسڵماناندا چووە ناو کەعبەو بە کۆمەڵ نوێژیان کردو قورەیش ترسی ئەوەیان لێ نیشت ئەگەر دەستیان بۆ ببەن، دوور نییە شەڕی ناوخۆیی (حرب

---

[1] لەوانە (کارل برۆکلمان) کە هەڵدەگرێ (میر فطروس) لەمی وەرگرتبێ، لە (تأريخ الشعوب الاسلامية)دا، ل٣٤دا ئەڵێ: "محمد بتەکانی قورەیشی لاپوچ بوو، بەڵام هەر لەسەرەتای بانگەوازەکەیەوە دانی نا بە گەورەیی ئەو بتانەدا!!".

[2] کۆنترین مێژوونووسەکە ژیانی پێغەمبەری ﷺ نووسیبێتەوە بە سەنەدی خۆی ناوی (سيرة النبي ﷺ: بن اسحاق)ەو بەناوی (السيرة والمغازي)ەوە چاپ کراوە.

[*] (زەندیق) بە کەسێك ئەوترێ کە هەوڵی تێکدانی دین بداتو ڕووکەش باوەڕداربێتو لە ژێرەوە کەنە لەدین بکات، (المنجد: تزندق).

[3] حياة محمد/ ص١٦٢.

[4] هەمان سەرچاوە، (ل١٦٢).

الأهلية) ڕوویدات[1]، ئیبن مەسعود ئەڵێ: (ان اسلام عمر كان فتحا وان هجرته كان نصرا، وان امارته كانت رحمة)[2]. واتە/ موسڵمانبوونی عومەر دەرگای خستە سەر پشت بۆ موسڵمانبوونی خەڵكی ترو كۆچكردنەكەشی سەركەوتنێكی گەورەو بوو، خەلیفایەتییەكەشی سۆزو ڕەحمەت بوو بۆ خەڵك.

دووەمیان: لە حەبەشەدا كودەتایەك كرا بەسەر نەجاشیدا موسڵمانانی كۆچكردوو گەڕانەوەیان بە چاكترزانی لە مانەوەیان لە حەبەشەدا..

٢. ئەوانەش پشت بەو ئایەتانە ئەبەستن بەڵگەكانیان لە بەڵگەی (موێر) پووچ و سوكترە.. ئەوەندە بەسە مانا ی ئایەتەكان خۆی بكەینە بەڵگە.. خوای گەورە بەدوای ئەو ئایەتەدا ئەفەرمووێ: (وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً) (الإسراء: ٧٤). واتە: ئەگەر ڕامان نەگرتایەی خەریك بوو شتێكی كەم مەیل بدەی بە كافران

واتە: خوای گەورە پێغەمبەری پاراستووەو مەیلی نەداوە بە كافران، كەواتە هێنانی چیرۆكی (غەرانیق) بە تەواوەتی ئاوەژوو كردنەوەی ئایەتەكەیە (خوا ئەفەرموێ: خەریكبوو ببنە فیتنە بۆت و لەوەی بۆ تۆمان دابەزاندووە دوورت بخەنەوە، تا بوختانت پێ بكەن، بەدەم ئێمەوەو جگە لە قورئان شتی تر بڵێی بە ناوی ئێمەوە، ئەگە وات بكردایە ئەوە موشریكەكان ئەیانكردی بە هاوڕێ و دۆستی خۆیان، خۆ ئەگەر ئێمە ڕاوەستاوو دامەزراومان نەكردایەی ئەوە زۆری نەمابوو شتێكی كەم مەیلیان بدەیتێ، ئەگەر وات بكردایە كەواتە حەقی ئەوەبوو ئێمەش تووشی لاوازیو داماوی دونیاو ئاخیرەتمان بكردایەی ئەوكاتەش كەس نەبوو پشتیوانی لێ بكردایەی دژ بە ئێمە)[3]، ئایەتەكان ماناكەی ئەوەیە كە پێغەمبەر ئەو كارەی نەكردووە بۆیە ئەمە نەك بەڵگە نییە بۆ ئەو مەسەلەیە بەڵكو بەڵگەیەكی فشۆڵ و نەخۆشە[4].

٣. ئەم چیرۆكە لە ڕووی (زانست)یشەوە ناڕاستە، چونكە بە جیاوازییەكی زۆرەوە گێڕاوەتەوە، هەیە ئەڵێ وتی: "تلك الغرانيق العلا وان شفاعتهن لتربجي"، هەیە ئەڵێ: "الغرانقة العلا ان شفاعتهن ترتجي"، هەیە ئەڵێ وتوویەتی: "ان شفاعتهن ترتجى"، بێ باسی (تلك الغرانيق) یان (الغرانقة) یەكێ تر ئەڵێ: "وانها لهي الغرانيق العلا" ڕیوایەتێكی پێنجەم ئەڵێ: "وانهن لهن الغرانيق العلا وان شفاعتهن لهي التي تربحى".

هەندێ كتێبی فەرموودە جگە لەم پێنج ڕیوایەتە هی تریش ئەهێنێ، ئەم هەمووە جیاوازییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (چیرۆكی غەرانیق) شتێكی (موضوع)و داهێنراوەو (ابن اسحاق) واتەنی داهێنراوی زەندیقەكانە[5].

٤. بەڵگەیەكی تر كە لەوان بەهێزترە.. سیاقی سورەتی (النجم)ە كە هەڵناگرێ چیرۆكی (غەرانیق) ڕووی دابێ ئایەتەكان ئەفەرموون: (لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى* أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى* وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى* أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى* تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى* إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَى) (النجم: ١٨ ـ ٢٣).

واتە: "پێغەمبەر هەندێ لە بەڵگە گەورەكانی خوای دیوە بە دڵنیاییەوە ئێوەش (لات)و (عزی)تان نەدیوە، هەروەها (مەنات)ی سێیەمین[6]، ئایا شتی نێرینە بۆ خۆتان بڕیار ئەدەن و شتی مێینەش بۆ خوا* كەواتە ئەوە

---

[1] زانایانی (سیرە) ئەڵێن: موسڵمانبوونی (حەمزەو عومەر) بە دوای یەكدا هۆی گەورەی گەڕانەوەیانبوو (السيرة النبوية) الصلابي (٣٧٩/١).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[3] ئەوەی ناو كەوانەكە لە (حياة محمد)ە كە دانی بەو تەفسیری ئایەتەكەیەو من بۆ ڕوونكردنەوەی زیاتر هێناومە.

[4] حياة محمد/ ص١٦٤.

[5] هەمان سەرچاوە/ ل١٦٥.

[6] عەرەبەكان (لات)و (عززا)و (مەنات)یان بەكچی خوا ئەزانی (العياذ بالله) بێ ئەوەی ئەو شتانەیان بینیبێ (مختصر تفسير ابن كثير/ الصابوني) (٤٠٠/٣).

بەشکردنێکی بێ ویژدانانەیە* ئەمانە هیچ نین ئەوە نەبێت هەندێ ناوە خۆتانو باوو باپیرانتان داتان هێناون، هیچ پیرۆزیو دەسەڵاتێکیان لە خواوە پێ نەدراوە، ئەو موشریکانە دوای وەهمو گومانو دوای هەواو ئارەزووی نەفسیان نەبێت دوای هیچ نەکەوتوون، بە دڵنیاییەوە لە خوای پەروەردگاریانەوە ئەم هیدایەتەیان بۆ هاتووە، (واتە با شوێنی بکەون)..."، کەواتە عەقڵ ناپیرێ دوو ڕستە مەدحی لاتو عوززا بکاتو چوار ئایەت بەدوایدا زەمیان بکات، ئەمە دەری ئەخات چیرۆکی (غەرانیق) خورافەیەو زەندیقەکان دایان هێناوە[1].

٥. بەڵگەیەکی تریش کە (خوا لێخۆشبوو) شێخ موحەممەد عەبدە، هێناویێتیی ئەویش بەڵگەی زمانەوانییە، شێخ موحەممەد عەبدە ئەڵێ: "عەرەب لە هیچ کاتو شوێنێکدا وەسفی خواکانیان بە تەیرو تیور نەکردووەو (غرانیق) کە کۆی (غرنق)ە بریتییە لە باڵندەیەکی ئاوی ڕەش یان سپیی یان گەنجێکی سپیکەلەی جوان".

٦. بەڵگەیەکی تر کە لە هەموویان یەکلاکەرەوەترە ئەویش ژیانی پێغەمبەر ﷺ خۆیەتی: موحەممەد هەر لەمناڵیشەوە بە (محمد الامین) ناسرابووەو تەمەنی هێشتا نەگەیشتبووە بیستو پێنج ساڵی، ڕۆژێك پرسیاری لە قورەیش کردو وتی: ئەگەر بڵێم لە پشت ئەشکەوتێکەوە سوپایەك بۆتان دامەزراوە بڕوا دەکەن.. قورەیش وتیان: (نعم ماجر بنا علیك كذبا قط)، ئێمە نەمان دیوە تۆ درۆت کردبێ، بیستووتانە کەسێك درۆ بەدەم خۆیو خەڵکەوە نەکات درۆ بەدەم خواوە بکات؟! لە خەڵك بترسێ لەخوا ناترسێ؟! ئەوە کارێکی دەگمەنەو ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کەسایەتییە بەهێزەکان هەیە زوو لەمە تێئەگەن.. لە هەمووی سەیرتر نەترسی ئەم درۆزنانەیە کە ئەو درۆیانەیان ئاخنیبووەتە ناو هەستیارترین باسەکانی ئیسلام کە باسی (توحید)و یەکتاپەرستییە کە موحەممەد تەنیا بۆ ئەو پرسە هاتووە، لە یەکەم ساتەوەختی هاتنیەوە هیچ موساوەمەیەکی لەسەر ئەو مەسەلەیە نەکردووە لە کاتێکدا قورەیش ئامادەبوون هەرچی داوابکات بیدەنێ بەو مەرجەی وازبێنێ لە یەکتاپەرستی.. کەواتە مەسەلەی (غەرانیق) بەرەهایی هیچ بناغەیەکی نییە[2].

زیاد لەمانەش بەرێز (موحەممەد حەسین هیکل) هێناونی زانایانی تری ئیسلام لە چەند ڕووی ترەوە ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوەیان ڕەت کردووەتەوە..

- ابن حجر (رحمه الله) ئەڵێ: ئەوەی ئەوترێ هۆی سوجدەبردنی موشریکەکان لەکاتی خوێندنی سورەتی (النجم)دا ئەوە بووە گوایە شەیتان شتی خستووەتە دەمی پێغەمبەر لەو کاتەدا نە لە ڕووی (نقڵ)و نە لە ڕووی (عقڵ)ەوە ڕاست نییە[3].

- (ابن كثير) (رحمه الله) ئەڵێ: "زۆر لە موفەسیرەکان لێرەدا چیرۆکی غەرانیق باس ئەکەن.. هەموو ئەو ڕیوایەتانەی ئەم چیرۆکەی پێ گێڕراوەتەوە (مرسل)نو کەسیان (اسناد)یان نییە، لە هیچ ڕوویەکەوە، خوازاناترە"[4].

لەمانەش زیاتر ئەوەیە، پێغەمبەران وەك زانایانی (زانستی کەلام) باسی دەکەن چوارشت لە هەقیاندا دروستەو دژەکانیان لە هەقیاندا (مەحاڵ)ە..

ڕاستگۆیی (الصدق)، ژیری، وریایی (الفطنة)، گەیاندنی دین (التبليغ)، بە پێچەوانەشەوە (درۆ)و (گێلی)و (شاردنەوەی دین)و (خیانەتو دەسپیسی) لە هەقیاندا مەحاڵە.. جا زانایان ئەڵێن: هۆکەشی ئەوەیە، ئەو پێغەمبەرانە ئەگەر تەنانەت لەگەنجێتیشیاندا (درۆ) یان لێ دەربکەوێ لەوەودوا خەڵك بڕوایان پێناکات کە بڵێن (لە

---

[1] حیاة محمد/ ص ١٦٥.

[2] حیاة محمد/ ص ١٦٧.

[3] فتح الباری (٨/٦١٤).

[4] السیره النبویه/ الصلابی: ٣٧٧/١

خواوه سروشمان بۆ هاتووه)، یان ئەگەر گێل بن کێ شوێنیان ئەکەوێ، یان ئەگەر (خیانەت)یان لێ دەردەکەوێ، یان ترسنۆك بن و نەوێرن دین بگەیەنن بە خەڵکی.. جا چیرۆکی هەڵبەستراوی (غەرانیق) هەموو ئەو بنەمایانە هەڵدەوەشێنێتەوەو (درۆ)و (ترسنۆکی)و (خیانەت)و (نائەمینی) ئەداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺو ڕێگە خۆشئەکات بۆ ئەوەی چی خوا پێی ناخۆشە بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ بوترێت[1].

(مبارکفوریش) ئەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی پڕ کاریگەری خۆی سورەتی (النجم)ی ئەخوێند لە کەعبەدا موشریکەکانیش کەمەندکێش بوون و لەگەڵ مۆسیقای ئایەتەکاندا ئەڕۆشتن، ئاگایان لە شیرکەکەیان نەماو کە گەیشتنە کۆتایی ئایەتەکان (بێ ویستی خۆیان) دوای ئایەتی (فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا)، ئەمانیش کڕنوشیان برد.. بەڵام کە لە ژێر کاریگەری ئایەتەکان و دەنگە خۆشەکەی پێغەمبەردا نەمان و هاتنە سەر خۆیان بۆ ئەوەی خەڵك گاڵتەیان پێ نەکات و ڕیسوا نەبن، لەبەردەم جەماوەرەکەیاندا هاتن و وتیان: موحەممەد بە (لات)و (عززا)و (مناة)دا هەڵیداوەو بە ڕێزەوە باسی کردوون و سەلماندوویەتی شەفاعەتیان وەرگیراوە[2].

"عمر فروخ" لە پەراوێزەکانیدا لەسەر (تأريخ الشعوب الاسلامية)ەکەی (کارل بروکلمان)، لەم باسی (غرائیق)ەدا ئەڵێ: "باشترین وەڵام بۆ ئەم بوختانە ئەو وەڵامەیە کە زانای بەناوبانگی هیندی (مولانا محمد علی) نووسیویەتی کە ئەڵێ: ئەم ڕیوایەتە تەنیا لای (واقیدی)و (تەبەری) هەیە لەگەڵ ئەوەدا هیچ سێبەرێکی ڕاستییان بەسەرەوە نییە، چونکە هەموو کارەکانی پێغەمبەر ﷺ دژ بەم ئاڕاستەیەیەو (واقیدی)ش بەوە بەناوبانگە کە کتێبەکەی پڕە لە (ئیسرائیلیات)و (خورافیات)و (طبری)یش بەوە بەناوبانگە کە هەرچی ڕیوایات هەیە کۆی کردۆتەوە.. بەڵام ئیبن ئیسحاق کە هەموو ژیانی پێغەمبەری هێناوە هیچ باسێکی ئەم (غرانیق)ەی نەکردووە کە ئیبن ئیسحاق (٤٠) ساڵ پێش (واقیدی) ژیارەو (١٥٠) ساڵ زیاتریش پێش (تەبەری) بووە (واقیدی)ش لەناو زانایانی فەرموودەدا بەوە بەناوبانگە کە فەرموودەی هەڵبەستووەو ئەوتری (یضع الاحادیث) و (غیر ثقة)"[3]، دەی ئیتر شوورەیی نییە (میر فطروس)و تاقمەکەی بنیشن بە شتی لەم جۆرەوە؟!

. (عەلی میر فطروس) لە ژێر ناونیشانی (کۆچ بەرەو مەدینەو بنجداکوتانی دەسەڵاتی سیاسیی ئایینی)دا باس لەوە ئەکات پێغەمبەر بۆیە مەدینەی هەڵبژاردووە، چونکە (شوێنی مۆڵکدارو سەودا کەرە سوو خۆرەکانی عەرەبسات بوون)!!. (یەهودی و مەسیحییەکانی خەڵکی مەدینە باوەڕیان بەخوای تاکو تەنیا هەبوو..).. (سەرەتا بە هەڵکردنی ئاڵای (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) لەگەل یەهودی و مەسیحییەکاندا بە شێوەیەکی نەرم جوڵایەوە، بەڵام ئەوەی بەسەر (بني قريظه)دا هات ڕاستی ئەم دروشمانەی سەلماند) .. (لەم شەڕانەدا عەرەبە موسڵمانەکان تەنانەت خۆشیان لەهاوپێخەفی کردن لەگەڵ ژنە مێرددارەکانیش نەدەپاراست و دیارە ئەوەش فەرمانی قورئان بووە)[4].

جا لە پەراوێزدا ئەڵێ: "دەبێت ئەوەش لەبیر نەکەن کە دژایەتی لە ڕادە بەدەری موحەممەد لەگەڵ یەهوددا بەر لەهەموو شتێك دەگەڕایەوە بۆ لایەنی ئابووری نەك لایەنی دینی"[5].

لەم چەند دەقەی سەرەوەدا زۆرێك لە (نەزانین)و (بەئارەزووەکانی) (میر فطروس) دەردەکەوێت:

---

[1] هەندێ لە زانایان کتێبی تایبەتی داناوەو بە دریژی موناقەشەی هەموو ڕووەکانی ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوەی کردووەو لە هەموو ڕووەکانەوە ڕەتی دەداتەوە لەوانە کتێبی (نصب المجانيق لنسف قصة الغرانيق).

[2] الرحيق المختوم/ المباركفوري، ص٩١.

[3] تأريخ الشعوب الاسلامية، (ص٣٥)، (یضع الحدیث) واتە/ فەرمووده هەڵدەبەستێ (فەرمووده ئەکات)، (غیر ثقة) متمانه نییه به هەر فەرموودەیەك ئەو بیگێڕێتەوە..

[4] ئیسلامناسی، ل٢٩.

[5] هەمان سەرچاوە ل ١٠٥.

**١. نازانێ ئەوە پێغەمبەر نەبوو ﷺ مەدینەی هەڵبژاردووە بەڵکو ئەوە خوای گەورەبوو کە مەدینەی بۆ هەڵبژارد تا بیکاتە (دار الهجرة).**

**٢. یەهودیو مەسیحی مەدینە کوا یەکتاپەرست بوون، مەگەر (یەهود) عوزەیر بە کوڕی خوا نازانن و مەسیحیش هەروەها (عیسا) بە کوڕی خوا ئەزانن دەی ئیتر خوای تاکو تەنیا یانی چی؟ خوایەك ژن و کوڕو کوڕەزاو خاڵۆو خاڵۆزای ببێ چ خوایەکە؟!**

**٣. گاڵتە بە شیعاری (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين) ئەکات و ئەڵێ: کارەساتی (بەنی قریظة) ناڕاستی ئەو شیعارەی دەرخست.**

**٤. باسی هاوپێخەفی ئەکات کە هەردوو توخمی (نەزانی)و (بە ئارەزوو)ی تێدایە دیسان.**

**٥. شەڕی جوولەکە لەگەڵ ئیسلامدا لەسەر ئابووری بووە (دەقە پیرۆزو ئیکسپایەرەکەی دینی مارکسییەت).**

**سەرەتا ئەوە ڕاست بکەینەوە کە خوا (جل جلاله) مەدینەی هەڵبژاردوە نەك پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەکاری زۆرکرد لەسەر مەدینەو ڕێگەشی دا بە هاوەڵانی بەرەو مەدینە کۆچ بکەن، چونکە لایەنگرو دۆستی زۆری تێدا دروستبووە بەڵام پێغەمبەر ﷺ ناردنی هاوەڵانی بۆ حەبەشە یان بۆ مەدینە زیاتر خۆ پەنادان بووەو بەردەوامیش گەڕاوە بۆ ئەوەی شوێنێکی مەحکەم و ئەمینیان بۆ بدۆزێتەوە..**

**نووسەرانی سیرە ئەڵێن: هەڵبژاردنی مەدینە لەلایەن خواوە بووە، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێ: "کاتێك کە حەفتا کەس بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لە ئەهلی مەدینە، پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵخۆش بوو کە پشت و پەنایەکی بۆ دروست بووە لە کەسانێك کە خەڵکی جەنگ و پیاوی تەنگانەن، دوای ئەوە بەردەوام ئەشکەنجە زیادی ئەکرد، چونکە قورەیش ئەوەیان زانیبوو کە خەڵکی دەستیان کردووە بە دەرچوون لە شار، بۆیە دەستیان دایە تەنگ هەڵچنین بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺو گاڵتەکردن و سوکایەتی کردن پێیان، هاوەڵان سکاڵای حاڵی خۆیان لای پێغەمبەر ﷺ کردو داوای کۆچکردنیان لێ ئەکرد، ئەویش فەرمووی (قد أ ريت دار هجرتكم، اريت سبخة ذات نخل بين لابتين وهما الحرتان، ولوكان السراة ارض نخل وسباخ لقلت هي هي) چەند ڕۆژێکی پێچوو پێغەمبەر ﷺ بە دڵخۆشییەکەوە هاتە ناو هاوەڵانی و فەرمووی: (قد اخبرت بدار هجرتكم وهي يثرب، فمن أراد الخروج فيخرج اليها)"[1].**

**(ابن كثير)یش لە (البداية والنهاية)دا ئەڵێ: پێغەمبەر فەرمووی: (اريت دار هجرتكم سبخة[2] بين ظهران حرتين، فاما أن تكون هجر أو تكون يثرب)[3].**

**واتە: (دار الهجرة)کەتانم پیشاندرا، زەوییەکی سەوزاییە ئەکەوێتە نێوان دوو شوێنی بەردین کەڕەش ئەکاتەوە، جا ئەو شوێنە یان (هەجەرە) یان (یثرب)ە، جا کەواتە هەڵبژاردنی مەدینە تا بکرێتە (دار الهجره) لە لایەن خواوە بووە نەك لە لایەن پێغەمبەرەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی (مير فطروس) بیری لێدەکاتەوە.**

**بۆ ئەوەش گوایە پێغەمبەر ﷺ بە ڕاستی نەبوو کە شیعاری (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين)ی بەرز کردەوە، چونکە قەتڵ و عامی (بەنی قریظة)ی کرد ئەوەش بوختان و نەزانینە لەبەر زۆر هۆ:**

---

[1] السيرة النبوية، الصلابي، (٤٧٦/١).

[2] لە (المنجد)دا ئەڵێ: سبخة: أرض ذات نزو وملح، (نَزو) (نز) و(نزازة) زەوییەکی زۆنگو شێدارە کە سەوز بکاتەوە لە دوورەوە، بە کوردی خۆمان زەوی (نزار) ئەکات.

[3] البدايه والنهايه (١٧٢/٤).

. لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەر کە چوویە مەدینە زۆری نەبرد دەستورێکی بۆ مەدینە نووسی تێیدا مافەکانی بۆ هەمووان (موسڵمانان، جوولەکەکان، موشریکەکان) دیاری کردو هەموولایەك پەیمانیان دا کە ئەو دەستوورە بپارێزن‌و هەرکەسیش (غەدر)و (ناپاکی) بکات ئەبێت هەر بە (دەستوور) و(یاسا) سزای خۆی وەربگرێ.

نووسەرانی (سیرە) ئەڵێن: دەستووری مەدینە لە (٤٧) خاڵ پێکهاتووە، تەواوی مەسەلەکانی ئەو سەردەمەی تێدا باس کراوەو پێناسەی (امة)و دیاریکردنی (مەرجەعیەتی باڵا)و (سنووری هەرێمەکان)و (ئازادییەکان‌و مافەکانی مرۆڤ)و (هەڵوێست لە یەهودەکانی مەدینە)و (دیاریکردنی سزاکان).. هتدی لەخۆ گرتووە[1].

لە ماددەی (٢٤)دا هاتووە (وان الیهود یتفقون مع المؤمنین مادامو‌ا محاربین) بە هەمان شێوە لە ماددەی (٢٥)یشدا ئەڵێ: (.. ولليهود دينهم وللمسلمين دينهم ومواليهم وأنفسهم الا من ظلم نفسه واثم فأنه لا يوتغ الا نفسه وأهل بيته)، لە ماددەی (٣٧)یشدا ئەڵێ: (وان على اليهود نفقتهم، وعلى المسلمين نفقتهم، وان بينهم النصر على من حارب أهل هذه الصحيفة وان بينهم النصح والنصيحة و البر دون الاثم)، لە ماددەی (٤٠)یشدا ئەڵێ: (وان لا تجار حرمة الا باذن أهلها)، لە ماددەی (٤٣)شدا هاتووە ئەڵێ: (وان بينهم النصر من دهم يثرب)[2]. (ابن كثير) دەربارەی ئەم ماددە ئەڵێ: (وان لا تجار قريش ولا من نصرها وان بينهم النصر على من دهم يثرب)[3].

کەچی زۆری نەبرد یەهود وەك پیشەی هەمیشەییان کەوتنە فیتنە گێڕان‌و ناپاکی کردن، بە ڕاددەیەك هەموو شتێکیان لەبیر چوویەوە، تەنانەت ئەوەشیان لەبیرچوویەوە کە ئەمانە (پەنابەرن)و لەتاو تەنگ پێهەڵچنین‌و ئەشکەنجەی خاچپەرستان هەڵهاتبوون‌و هاتبووە (نیوە دوورگەی عەرەب)، چونکە هەڵوێستیان بەرانبەر بە (عیسا پێغەمبەرو مەریەمی دایکی) زۆر خراپ‌و نالەبار‌بوو خاچپەرستەکان لە سێدارەدانی عیسایان بە کەتنی یەهود ئەزانی[4].

نووسەرانی (سیرە) لەوانە دکتۆر (عەلی موحەممەد ئەلصەلابی) بە درێژی باسی ئەو ناپاکی‌و فیتنەگێڕانەی یەهودیان کردووە کەوای کرد خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ بکات تا سنووریان بۆ دابنێت‌و شەوکەتیان بشکێنێ.. لەو ناپاکی‌و غەدرو فیتنانەیان ئەم چەند خاڵە باس دەکەین بە کورتی، بۆ ئەوەی نە (میر فطروس)و نە پێڕەکەی لە خۆڕایی شین نەگێڕن بۆ (جوولەکە)و تەنیا کۆتا دیمانەی فیلمەکەیان لەبەرچاوبێ کە ستەمکارەکە ئەکەن بە داردا ئەوەیان لە بیر بچێت کە ئەو ستەمکارە چەند جینایەتی گەورە گەورەی کرد، کە بوونە هۆی ئەوەی میللەت ئاوەها ملی بکەن بە پەتدا، ئەمەی (میر فطروس)و پێڕو تاقمەکەی وەك هەڵوێستی ئەو بەعسی‌و خەڵکە ناحاڵییە وایە کە سۆزیان بۆ (سەددام) ئەجوڵا کاتێك ملیان کرد بە پەتی سێدارەدا، لەبیریان چووبوویەوە کە ئەم (سەددام)ە چەند جینایەتی کرد، تا خەڵك وا بکەن لە گەڵیدا"

١. هەوڵیاندا کە ڕیزەکانی گەلی مەدینە درز تێ بکەن، ئەوەبوو (شاسی کوڕی قەیس) کە یەکێك لە دەمڕاست‌و ڕیش سپییەکانی یەهود بوو گەنجێکی ڕاسپارد بۆ ئەوەی شیعری هەجوی کۆنی نێوان ئەوس‌و خەزرەج بخوێنێتەوەو برینی کۆنیان بکولێنێتەوەو بەڵکو سەرلەنوێ دەست بدەنەوە شەڕە عەشیرەتایەتی‌و پێغەمبەر ﷺ گەورەترین جەماوەرو پشتیوانی خۆی لە دەست بدات‌و لە هەوڵەکەشیاندا سەرکەوتوو بوون، ئەگەر لوتفی خوداو پاشان خێرا فریاکەوتنی پێغەمبەر ﷺ نەبووایە، لەوەدا بوو ئەوس‌و خەزرەج بکەنەوە بە شمشێردا بۆ یەکتری، تا پێغەمبەر ﷺ بە پەلە هات بۆ ناویان‌و فەرمووی: (یامعشر المسلمين، الله الله، ابدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم بعد

[1] السیره النبویه/ الصلابی (١/٦١٤ . ٦٦٤).

[2] السيرة النبوية/ الصلابي (٦١٤ . ٦٦٤).

[3] البداية والنهاية (٢٢٢/٣).

[4] فقه السيرة/ الغزالي (ص١٥٣).

أن هداكم الله للاسلام وأكرمكم به، وقطع به عنكم أمر الجاهلية واستنقذكم به من الكفر، والف بين قلوبكم)[1]. ئەوەبوو (ئەوس‌و خەزرەج) هاتنەوە بە خۆیانداو هەندێکیان دەستیان کردە گریان‌و دەستیان کردە ملی یەکتری‌و تێگەیشتن ناحەزان چ پیلانێکیان بۆ تەنیبوون بە فەزڵی خواو پێغەمبەر ﷺ نەکەوتنە ناوی.

٢. بێحورمەتی کردن بەرانبەر خواو پێغەمبەر ﷺ.. زیاد لە یەکێك لە نووسەرانی (سیرة) ئەگێڕێتەوە کە (ئەبوبەکر ئەچێتە یەکێك لە قوتابخانەکانی یەهود لە مەدینە سەیر ئەکات هەموویان کۆمەڵیان کردووە لە یەکێکیان پێیان ئەوت: "فەنحاص" کە زاناو(حەبر)ی ناویان بوو.. ئەبوبەکر کەوتە قسەکردن لەگەڵیداو پێی وت: کابرا لە خوابترسەو موسڵمان ببە، وەڵڵاهی چاك ئەزانی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو پەیامی (هەق)ی لای ئەوەوە بۆ هێناون، لە تەورات‌و لە ئینجیلەکانی بەردەستیشتاندا ئەمە نووسراوە، (فەنحاص) بە ئەبوبەکری وت: وەڵڵاهی ئەبوبەکر ئێمە هیچ پێویستییەکمان بەخوا نییەو ئەو پێویستی بە ئێمەیە! ئێمە لێی ناکوڕوزێینەوە وەك ئەو ئەکڕوزێتەوە لە ئێمە، ئێمە دەوڵەمەندو ئەو هەژار، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە داوای قەرزی لێ نەئەکردین وەك ڕێبەرەکەتان باسی ئەکات، (سوو) لە ئێمە حەرام ئەکات‌و کەچی خۆی بە (سوو) شتەکانمان ئەداتەوە، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە شتی بە (سوو) لێ وەرنەئەگرتین، ئەبوبەکر زۆر تووڕە ئەبێت تا ئەتوانێت مشتەکۆڵەیەك ئەماڵێ بە دەم‌و چاوی (فەنحاص)داو ئەڵێ: سوێند بەخوا لەبەر حورمەتی (هاوپەیمانی نێوانمان نەبوایە) سەرم لە لاشەت ئەکردەوە! ئەی دوژمنی خوا! (فەنحاص) ئەچێت بۆلای پێغەمبەر ﷺو ئەڵێ: موحەممەد! سەیرکە هاوەڵەکەت چی پێ کردووم! پێغەمبەریش ﷺ بە ئەبوبەکری فەرموو: ئەوە لەبەر چی وات لێکردووە؟ ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم دوژمنەی خوا قسەیەکی زۆر گەورەی کرد وتی: ئێمە دەوڵەمەندین‌و خوا هەژارە، کە ئەمەی وت، خۆم پێ نەگیراو لەبەر خوا تووڕە بووم، ماڵیم بە دەمو چاویدا، (فەخاص) نکوڵی لەمە کردو وتی: شتی وام نەوتووە! زۆری نەبرد خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (لَّقَدْ سَمِعَ اللّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ) (آل عمران: ١٨١)[2].

٣. دەستیان دایە قسەوتن بە پێغەمبەری ﷺو سوکایەتی کردن بە قورئان‌و پێغەمبەرانی پێشوو، بۆ نمونە کە ئەگەیشتن پێی لە جیاتی ئەوەی بڵێن (السلام عليك) ئەیانوت (السام عليك)، واتە مردن بێتە سەرت، عائیشە جارێ گوێی لێبوو هەندێ یەهودی بەو شێوەیە سەلامیان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی (وعليكم) عائیشە وتی: (السام عليكم وفعل الله بكم)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مه يا عائيشة! فان الله لايجب الفحش ولا التفحش)، واتە: نا! نەکەی عائیشە! خوای گەورە وەك چۆن قسەی خراپی پێ خۆش نییە وەڵامی خراپیشی چێ خۆش نییە؟ عائیشە ئەڵێ وتم: ئاخر باشە قوربان ئەبینی چی ئەڵێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی باشە تۆش گوێت لێنەبوو منیش وتم: وعليكم"[3].

جارێکیان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: تۆ بڕوات بە چی هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (أؤمن بالله وما أنزل الينا وما أنزل الى ابراهيم واسماعيل واسحاق ويعقوب والآسباط وما اتي موسى وعيسى وما اتي النبيون من ربهم لانفرق بين أحد منهم ونحن له مسلمون)، کە باسی عیسای کرد (سەلامی خوای لێبێت) خێرا هەڵیاندایەو وتیان: (لا نؤمن بعيسى ولا نؤمن بمن آمن به)[4].

٤. پشتگیری دووڕووەکان‌و دنە دانیان، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت (إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُم * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ) (محمد : ٢٥ ـ ٢٦).

---

[1] السيرة النبوية/ الصلابي (٦٣٤/١ ـ ٦٣٥).

[2] لباب النقول في اسباب النزول/ السيوطي/ هامش مفردات القران، (ص ١١١).

[3] زاد المنير/ ابن القيم، ١٨٩/٨.

[4] السيرة النبوية/ ابن هشام، ٥٦٧/١.

**٥. گاڵتەکردن بەو زاناو یەهودانەی کە موسڵمان ئەبون، لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام.**

**٦. بڵاوکردنەوەی چەواشەکاری‌و گاڵتەکردن بە ئیش‌و قسەکانی پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکداو هەر زوو لەناو خەڵکدا بڵاویان کردەوە گوایە دوعایان کردووەو سیحریان خستۆتە کار لەمەو دوا موسڵمانەکان کەسیان کوڕیان نابێت[1] و هەر کچیان ئەبێ، بۆیە کە یەکەم منالێکی کوڕ لە مەدینەدا لەدایکبوو هاوەلانی پێغەمبەر کردیانە ئاهەنگ‌و خۆشی کە (عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر) بوو[2].. ئەسمای کچی ئەبوبەکر (دایکی ئەم عەبدوڵڵا)یە، ئەڵێ: (کان أول مولود ولد في الاسلام، ففرحوا به فرحا شديدا لأنهم قيل لهم: ان اليهود قد سحرتكم فلا يولد لكم)[3].**

**٧. کە قیبلەش گۆڕا بە ئایەتی (وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (البقرة: ١٤٩). هاتو هاواری دنیایان لێ بەرز بوویەوەو کردیانە ڕۆژی خۆیان، دەمێ ئەیانوت نوێژی تا ئێستایان دروست نەبووە، دەمێ ئەیانوت لەمەولا نوێژتان دروست نییە، ئەم پڕوپاگەندانە بوویە پرسیار بۆ صەحابەو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژی ئەوانەمان لەمەوبەر مردوون قەبوڵ بووە یان نا؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (.. وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (البقرة: ١٤٣)[4].**

**ئەوە بە گشتی هەڵوێستی یەهودبوو لەو دەستوورو پەیماننامەیەی کە خۆیان ئیمزایان کردبوو، کەچی هەر ئەوەندەی موسڵمانان کەوتنە چالاکی‌و لەیەك دووشەڕدا بە سەرکەوتوویی هاتنەوە، ئارامیان لێ هەڵگیراو دەستیان دایە کلکگرێدان لەگەڵ قورەیش‌و دوژمنانی مەدینەو دەستووری مەدینەیان فەرامۆش کرد کە خۆیان نووسیبوویان (انه لايجار قريش ولا من نصرها وان بينهم النصر على من دهم المدينة) (پەنای قورەیش نادرێ‌و پەنای ئەوەش نادرێ پشتیوانی قورەیش بکات‌و هەرکاتێکیش پەلاماری مەدینە بدرێت هەموو ئەبێ پشتی یەکتر بگرن)، جا با هۆی شەڕی (بەنی قريظه) باس بکەین تا (میر فطروس)و میر مەزدەکی‌و میر زەردەشتی‌و میرەکانی تری هاوڕاو هاو مەبەستیان حاڵی بن پاداشتی ناپاکی چییە لە دونیاو لە ئاخیرەتداو با بەخۆشیاندا بچینەوەو لە خۆڕایی فرمێسك بۆ جینایەتکار نەڕژێن‌و تەنیا ئەو کاتەی نەبینن کە ملی ئەکرێ بە پەتی سێدارەدا!.**

**مەدینە سێ تایفەی گەورەی جولەکەی تێدابوو بە ناوەکانی (بەنو قەینوقاع)و (بەنو نضير)و (بەنو قوريظة)، پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی (یەهود) نەکەونە پیلان گێڕان لێی هات ئەم دەستوورەی لە گەڵدا ئیمزا کردن بەڵام هەرزوو یەك یەك کەوتنە ناپاکی.**

**"بەنو قەینوقاع" یەکەمین تایفەی یەهودی بوون کە زۆر زوو دەستیان دایە ناپاکی، چونکە بە خۆیاندا زۆر ئەنازین‌و خاوەنی چەك‌و تفاقی تەواوبوون‌و نزیکەی (حەوت سەد) کەسی شەڕەکەریان هەبووە لەناو هەموو یەهودیشدا ئەمان ئازاترین‌و بە جەرگترین کەس بوون[5]، بۆیە هەرزوو دەستیان دایە قسەی (ئیستفزازی) بەرانبەر موسڵمانان لە بازاڕەکانی خۆیاندا.**

**ئیبن هیشام ئەڵێ: ئافرەتێکی عەرەب چوو بۆ شت کڕین لە بازاڕەکانی (بەنوقەینوقاع)، چوویە دوکانی ئاڵتون فرۆشێك داوایان لی ئەکرد کە پەچەکەی لابدات، ئەویش بە گوێی نەکردن، کابرای ئاڵتون چی لە ناخافڵدا لە دواوە کراسەکەی لەدواوە بەستەوە بە کورسییەکەی ژێریەوە، کە ئافرەتەکە هەستا بچێتە دەرەوە کراسەکەی لەبەر داکەنراو گیانی دەرکەوت‌و ئەوانیش دەستیان کردە پێکەنین پێی، ئافرەتەکە هاواری لی بەرز بوویەوەو هانای برد**

---

[1] **رواه الحاكم في مسند، (السيرة النبوية) الصلابي: (٦٤٥/١).**

[2] **اليهود في السنة المطهره (ج١/ ص٢٦٥)، د. عبدالله الشقارى/ دار الطيبه/ الرياض/ ط (١) ١٩٩٦.**

[3] **صحيح البخاري/ كتاب.**

[4] **اسباب النزول، السيوطي (المفردات) ص ٤١ . ٤٢.**

[5] **الرحيق المختوم، ص٢٢٨.**

بۆ پیاوێکی موسڵمان‌و ئەویش چوو بەهانایەوەو دەستەو یەخە بوویەوە لەگەڵ ئاڵتون چییەکەداو کوشتی، یەهودەکانی ئەو بازاڕەش پەلاماری پیاوە موسڵمانەکەیان داو کوشتیان، کەسوکاری پیاوە موسڵمانەکە هاتنە ناو شەڕەکەو شەڕەکە گەرم بوو کە ئەمە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ ئابڵوقەی خستنە سەر (ڕۆژی شەممە/ شوال ۲ ی کۆچی) ئابڵوقەکە (۱۵) ڕۆژی خایاندو خوای گەورە ترسو بیمی خستە دڵیانەوەو ناچار تەسلیم بوون[1]. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، کە ڕێبەری دووڕووەکانی مەدینە بوو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ تکاکردن، بۆ بەنوقەینوقاع، چونکە لە سەردەمی جەهالەتدا هاوپەیمانی ئەم بوون، وتی: ئەی موحەممەد لەگەڵ هاوپەیمانەکانی مندا چاك بە، پێغەمبەر ﷺ هەندێ وەستا، عەبدوڵڵا چەندجارێ قسەکەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخاند، عەبدوڵڵا دەستی برد بۆیەخەی کراسەکەی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەرمدە! خوا بتگرێ[2].. عەبدوڵڵا وتی: وەڵڵاهی بەرت نادەم تا پەیمانی ئەوەم نەدەیتێ باش بکەی لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانەمدا، ئەوانە هەمیشە چوارسەد سواری بێ عەمامەو سێ سەد سواری قەڵغان بەدەستیان وەك پەرژین بوون بۆ من‌و لە ڕەش‌و سوور پاراستوومیان، کەچی تۆ ئەتەوێ بە ڕۆژێك دروێنەیان بکەی؟ لە ڕاستیدا من کەسێکم ئەترسم لە دواڕۆژو ڕۆژان ڕۆژیان لەدوایە، پێغەمبەر ﷺ خاتری ئەم کابرا دووڕووەی گرت، کە هێشتا یەك مانگ بەسەر ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونیدا ڕۆیشتبوو[3]. بەنوقەینوقاعی بەخشی بە ئەو، بەلام فەرمووی، با لێرە نەمێنن‌و ڕەو بکەن.. ئەوەبوو چوون بۆ (اذرعات) لە شام[4].

شەڕی (ئوحود) لە (شەممە (۱۱)ی شەوالی ۳ی کۆچی)دا[5] ڕوویدا کە دروست ساڵێك دوای ڕووداوی (بەنوقەینوقاع) ئەکات‌و جولەکەکان جارێکی تر کەوتنەوە وتی وتی‌و فیتنە گێڕان‌و ئەو شکستەی موسڵمانانیان لە ئوحوددا بە هەلزانی بۆ چالاکی ناپاکانە، ئەوەبوو هەستان بە پەیوەندیکردن بە (دووڕووەکان)و (موشریکەکان)ی مەککە، لە ژێرەوەو دەستیاندایە کارکردن دژ بە موسڵمانان[6].

پیغەمبەر ﷺ بەمەی زانین، بەلام لێیان بێدەنگبوو.. ڕوداوێك ڕوویدا ئەویش ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ (۷۰) کەسی لە هاوەڵە قورئان خوێنەکانی نارد بۆ لادێکانی لای (نجد)، لە سەرداوای خۆیان تا فێری ئیسلامیان بکەن، کەچی لەڕێگەدا (غەدر)یان لێکردن‌و هەموویان شەهید کردن، (عەمری کوڕی ئومەییەی حضرمي) نەبێ ئەویش کە ئەمەی بینی لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ مەدینە دوو کەس لە عەشیرەتی (بەنی عامر)ی پێی گەیی‌و فرسەتی لێهێنان‌و کوشتنی[7].

ئاگای لەوە نەبوو کە پێغەمبەر ﷺ (ئەمان)ی پێدابوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا کە خوێنی هەردووکیان بدات، جا بۆ کۆکردنەوەی خوێنەکەیان سەرێکی دا لە تایفەی (بەنو نضیر)و بەپێی (دەستووری مەدینە) ئەبوو

---

[1] نوسەرانی (سیرة) ئەڵێن: (بەنوقەینوقاع) لەوەو پێش لە ناو خەڵکیدا ئەیانوت: موحەممەد لە خۆی بایی نەبێ لە قورەیشی بردۆتەوە لە (بەدر)دا! ئەگەر ئەکەوێتە شەڕ لەگەڵ ئێمەدا ئەوکاتە ئەزانی شەڕ چییەو پیاوی شەڕکێیە، ئەم هەڵوێستەشیان لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ پیغەمبەردا ﷺ وت، (الرحيق المختوم/ ص۲۲٦).

[2] دەقە عەرەبییەکەی ئەڵێ: ويحك ارسلني، بەلام من ئەوەم بەشیاو زانی بۆ بەرانبەرەکەی.

[3] الرحيق المختوم، المباركفوري، ص ۲۲۹.

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەردەوام لە هەموو ولاتێکدا هەر خەریکی (فیتنەگێڕان) بوون‌و ڕەویان پێ کراوە تا شەڕیان دوور بخەنەوە لە خەڵك!! (ئەورووپا) قەتڵوعامێکی زۆریان کردن ڕەویان پێکردن بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست‌و ئەوەتا بوونەتە فیتنەی هەموو ناوچەکەو گەلانی ئەم ناوچەیەش بیر لەوە دەکەنەوە جارێکی تر ڕەویان پێ بکەنەوە.

[5] البداية والنهاية (۳۵۳/٥).

[6] عون المعبود (۱۱٦/۳).

[7] حياة محمد: هيكل ص۳۰۷.

ئەوانیش بەشداری بکەن لە دانی خوێنەکەدا، پێغەمبەریش ﷺ بە دڵێکی پاکەوە چوو بۆ ناویان، ئەوانیش بەڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنیان کردو فەرموویان لێکردو لە شوێنێکدا دایان نیشاند، وتیان: ئێستە پارەی خوێنەکە ئەیهێنینە خزمەتت.. "مبارکفوری" ئەڵێ: "جوولەکەکان سەریان کرد بەیەکداو شەیتان ئیلهامی بۆ کردن کە پیلانێکی لێ بکەن‌و خۆیان بخەنە ئەو زەلیلی‌و داوامییە کە هەمیشە هەر بەشیان بووە لە ژیاندا، هەندێکیان وتیان: (هەل لەمە باشتر هەڵناکەوێ بۆ کوشتنی)[1] کێ ئەتوانێ ئەم (دەستهارە)[2] لە سەرەوە بخات بەسەری موحەممەدداو پانی بکاتەوەو گشتمان بخاتە ئیسراحەت؟![3] عەمری کوڕی جەحاش کە نەگبەتی ناویان بوو، وتی: من.. سەلامی کوڕی میشکەم وتی: شتی وانەکەن، سوێند بەخوا لەم نیازەی ئێوە ئاگادار ئەکرێت‌و ئەمەش ئەکاتە شکاندنی ئەو پەیمانەی کە لە نێوانماندا هەیەو داهاتووی باش نابێت.. بەڵام ئەوان بڕیاریاندا نەخشەکەیان جێبەجێ بکەن.. زۆری نەبرد حەزرەتی جوبرەئیل هاتە لای پێغەمبەری خواو ﷺ ئاگاداری کرد لە پیلانەکەو پێغەمبەری هەستان لەو شوێنەداو ڕۆیشتەوە بۆ مەدینەو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی بانگ کردو پێی فەرموو: بچۆ بۆلای یەهودی (بەنو نەزیر)و پێیان بڵێ: (ان رسول الله ارسلني اليكم ان اخرجوا من بلادي، لقد نقضتم العهد الذي جعلت لكم بماهممتم به من الغدربي، لقد اجلتكم عشرا، فمن رئي بعد ذلك ضرب عنقه)"[4]. یەهودەکان گلەییان لە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کرد کە کاتی خۆی هاوپەیمانییان بووەو وتیان: ئەبوایە هەمووکەس ئەم پەیامەی بهێنایە تۆ نەتهێنایە، ئەویش وتی: ئاخر دڵگۆڕین هاتۆتە ناو[5].

(بەنو نەزیر) لە بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ حاڵی بوون‌و کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ (ڕەو)، چونکە زانییان پاداشتی ناپاکی هەر ئەوەیە هێشتا خاتریشیان گیراوە، چونکە هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەر ﷺ یانی هەوڵی لەناوبردنی ئوممەتێک‌و دەوڵەتێک نەک لەناوبردنی تاکە نەفەرێک.

ئەوان لە خۆپێچانەوەدابوون (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) دوو نوێنەری نارد بۆ لایان وتی: ڕەو مەکەن‌و بەگوێی موحەممەد مەکەن، خۆم‌و دوو هەزار شمشێر بەدەست دێینە قەلاکەتان‌و خۆمانتان لەسەر دائەنێین[6]. یەهود بەم پەیمانەی عەبدوڵڵا فریویان خواردو وەڵامیان ناردەوە بۆ پێغەمبەر کە ڕەو ناکەین‌و چی ئەکەی بیکە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەی پێ گەیی فەرمووی (الله أكبر، حاربت يهود)[7]، واتە: خوا لە هەمووشت گەورەترە، ئەوە یەهود شەڕیان ڕاگەیاند[8]، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەش وەستا تا (١٠) ڕۆژە کە تەواو بوون کە (ڕەو)یان نەکرد، پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی نارده سەریان‌و ئابڵوقەی قەڵاکانیانی داو (١٥) ڕۆژ دەوامی کێشا، کە کەس نەهات بەدەمیانەوە نە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی)و نە جولەکەکانی (بنو قوريظة) چۆکیان شکاو داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە ڕازین بە

---

[1] ئەم زیادەیە لە (الرحيق)ەکەدا نییە لە (البداية والنهاية): ٢٣/٥ ٤دا هەیە.

[2] ئەم زیادەیەش لە (فقه السيره)ی موحەممەد الغزالی ص ٣٠٢دا هەیە.

[3] دەستهاڕ: دوو بەردی پانی گەورەیە کە گەنمی پێ ئەهاڕێت‌و ئاردی پێ ئەکرێت.

[4] حياة محمد، ص٣٠٩، هەروەها (طبقات ابن سعد الكبرى) (٥٧/٢).

[5] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6] تأريخ الطبري (٥٥٣/٢).

[7] السيرة النبوية/ الصلابى (٢٥٤/٢).

[8] سبحان الله! پێغەمبەر ﷺ چەند حساباتی وردبووە، ئەم شەڕی ڕانەگەیاندووە تا ئەوان شەڕیان ڕاگەیاندووە، هەرچەند ئەو غەدرو ناپاکییەشیان کردبوو.

(ڕەو)و با ئەمانیان بداتێ تا ڕەو دەکەن.. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (اخرجوا منها ولكم دماؤكم وما حملت الا بل الا الحلقة.. فرضوا بذلك)[1].

واتە: دەرچن لە قەڵاکانتان‌و خوێنی خۆتان‌و ئەوەندەی هوشترێك هەڵی ئەگرێ بۆ خۆتان، چەك‌و تفاقی شەڕ نەبێتن ئەوانیش ڕازی بوون.

ئەوەندەش پیس‌و نەفس نزم بوون دەستیان کرد بەڕوخانی خانووەکانیان، بۆ ئەوەی موسڵمانەکان سوودی لێ نەبینن، نوسەرانی (سیرە) ئەڵێن: سەلامی کوڕی ئەبی حەقیق پڕی (پێستی گایەك) زیوو ئاڵتونی نابوو لە هوشترێك‌و ئەیوت: ئا ئەمەم بۆ بەرزی‌و نشێوی ڕۆژگار داناوە، ئەگەر ئەو هەمووە دارخوماش بەجێ بهێڵم ئەوە خەیبەر پڕە لە دارخوما[2]، کاتێك کە موسڵمانان چوون بۆ کۆکردنەوەی چەك‌و تفاقی تایفەی (بەنو نضیر) سەیر ئەکەن چەك‌و تفاقێکی زۆریان ناوە بە یەکەوەو لە خۆسازداندان! سێ سەدو چل شمشێری شەڕکردن، پەنجا خودەی شەرو پەنجا قەڵغانی دەستی.. ئەم ڕووداوەی (بەنو نضیر) بە درێژی خوای گەورە لە قورئانداو لە سورەتی (الحشر)دا باسی کردووەو لە سۆنگەی ئەم ڕووداوەوە خوای گەورە ئامۆژگاری هەموو یەهود ئەکات‌و ئەفەرموێ: (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ* هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ) (الحشر: ١ ـ ٢).

چی لە زەوی‌و ئاسمانەکاندایە باسی بێگەردی خوای گەورە ئەکەن، خوای بە دەسەڵات‌و دانا* ئەو خوایەی ڕەوی کرد بە ئەو کافرانەی کە بەشێك بوون لە ئەهلی کیتاب، لە ماڵەکانیان وەدەری نان بۆ یەکەمین گلێربوونەوەیان* ئێوە گومانتان نەئەبرد کە ڕەو بکەن‌و خۆشیان وایان گومان ئەبرد کە قولەو قەڵاکانیان بەری خوایان لێ ئەگرن، کەچی خوای گەورە لە شوێنێکەوە بۆیان هات کە بەخەیاڵیاندا نەهاتبوو ترس‌و بیمی خستە دڵیانەوەو بە دەستی خۆیان‌و بە دەستی ئیمانداران خانووبەرەکانیان تێك ئەدا، ئەی ئەوانەی خاوەنی وردبینین پەند وەربگرن لەم ڕووداوە.

زانایان ئەفەرمون (فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ) مەبەست پێی یەهودی (بەنی قریظە)یە، کە لە "خەیبەر"دا بوون‌و ئەمانەی بەنوو نەزیریشیان چوونە پاڵ، ئەمە ڕووداوی بەنو نەزیرە، لە ساڵی (٤)ی کۆچی مانگی ڕەبیعی یەکەمدا ڕوویدا[3]، پێغەمبەر ﷺ‌و موسڵمانان مێشکیان هەندێ پشووی داو ترسی پیلان‌و فیتنەگێڕانیان نەما، بۆیە خۆیان یەکلا کردەوە بۆ ڕەقیبە سەرسەختەکەیان کە قورەیش بوو، بەڵام زۆری نەبرد یەهود دیسان دەستیان دایەوە فرت‌و فێڵ و کاری ژێر بەژێری، بەڵام ئەمجارەیان نەخشەو پیلانێکیان دانا کە موسڵمانان لە ڕەگ‌و ڕیشەوە بێننە دەر، هەوڵیاندا کەچی تاقم‌و گروپ‌و عەشیرەت هەیە لە مەدینە کۆی بکەنەوەو کۆتایی بەو دەوڵەتە بهێنن، کە دەسەڵاتی (ئاینی)و (سیاسیی) لێی سەندوونەتەوەو خەریکە دەسەڵاتی ئابووریشیان لێ ئەسەنێتەوە، ئیتر بێ ئەوە گوێ بدەنە ئەو هەموو پەیمان‌و وادانەی هەیانە لەگەڵ موسڵماناندا.. یان گوێ بدەنە ئەو هەمووە پەندەی لە ڕۆژگاردا بەسەریاندا هاتووە، نووسەرانی "سیرە" ئەڵێن: "ئاشتی‌و ئاسایش گەڕایەوە بۆ مەدینەو دوورگەی عەرەب ئارام بوویەوە پاش ئەو شەرو مەفرەزە ناردنانەی بەمەولاولادا کە نزیکەی یەك ساڵی خایاند، تەنیا "یەهود" نەبێ کە جۆرەها تاڵی و زەلیلییان بەسەردا هات ئەویش هەمووی ئەنجامی ئەو غەدرو ناپاکییانەبوو کە خەریکی بوون‌و گوێیان بە ئەنجامەکانی نەئەدا، تەنیا ئەوان بە خۆیاندا نەچوونەوە.. بەردەوام خۆیان ئەخواردەوە.

---

[1] البداية والنهاية (٤٢٣/٥).

[2] السيرة النبوية، الصلابى (٢٥٥/٢).

[3] الرحيق المغتوم، ص٢٨٥.

ئەمجارەیان دەستیان دایە پیلانێکی تازە دژ بە موسڵمانەکان، کەوتنە خۆسازدان بۆ پیلانێکی وا کە بکوژ بێت بۆ موسڵمانانو دوای ئەوە ئیتر نەژین، بەڵام کە خۆیان ڕاوستەوخۆ غیرەتی شەڕکردنیان نەبوو لەگەڵ موسڵماناندا هاتن خەڵکی تریان توند ئەکردەوە.. (٢٠) نەفەر لە سەرۆکو دەمڕاستەکانی (بەنو نضیر) هەستانو چوون بۆ مەککە بۆ لای قورەیشو دەستیان دایە دنەدانی قورەیش تا بێنە سەرمەدینەو ئەمانیش ئامادەیی هەموو هاوکارییەکیان دەربڕیو قورەیشیش هاتن بە قەولداو وادەیان دانێ، چونکە قورەیش بەنیازبوون ئەو شورەیی و عارەی هاتبوو بە سەریاندا بیسڕنەوە[1] و ڕێزی خۆیان لە ناو خەڵکدا بگێڕنەوە، وەفدەکەی یەهود بەرەو (غطفان)یش کەوتنە ڕێ، هەمان هاوپەیمانێتییان لەگەڵ ئەوانیشدا بەست، وەك لەگەڵ قورەیشدا بەستیانو پاشان گەڕان بە ناو هەرچی گروپ و تایفەی عەرەبی تردایەو زۆرێك هاتن بە دەمیانەوەو لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتنیان بە دەستهێناو ڕۆژی گەلەکۆمەکردنیان لە مەدینە دیاری کرد، ئەوەبوو لە باشووری دوورگەی عەرەبییەوە (قورەیش)و (کەنانە)و هەموو هاوپەیمانەکانی تریان بەسەرکردایەتی (ئەبوسوفیان) بە چوار هەزار شمشێر بە دەستەوە کەوتنە ڕێو لە (مر الظهران)دا خێڵی (بەنو سلیم)یشیان هاتە سەر لە ڕۆژهەڵاتیشەوە خێڵەکانی (غطفان)و (بەنو فزارە) بە سەرکردایەتی (عویینە ینەی کوڕی حصین)و (بەنی مورە) بە سەرکردایەتی (حارسی کوڕی عەوف)و (بەنی شجاع) بە سەرکردایەتی (موسعەری کوڕی ڕەخیلە)و زۆرێکی تری وەکو (بەنی ئەسەد) بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێو لەو (ژوان)ەی دانرابوو بۆ هەموویان یەکانگیربوونو کۆبوونەوەو سوپایەکی بێ شومار نزیك مەدینە بوویەوە کە ژمارەیان (دە هەزار) شەڕکەر بوو کە بەژمارە زۆر زیاتر بوون لە هەموو دانیشتوانی مەدینە بە منداڵو ژنو پیاویەوە! خۆ ئەگەر لە ناخافڵدا ئەم سوپایە بیدایە بەسەر مەدینەدا بەبێگومان تەڕوو وشکی پێکەوە ئەسوتاندو مەدینە ئەبوویە هەواڵێك لە هەواڵەکانی ڕابردوودوو.

بەڵام سەرکردایەتی لە مەدینەدا بەردەوام دەستیان لەسەر دڵیان بوو، بۆیە زۆری نەبرد هەواڵگری مەدینە بە پەلە هەواڵی ئەم سوپا بێشومارەی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ خێرا داوای کۆبوونەیەوەکی کردو زانیارییەکانی بە دڵنیاییەوە دایە ئامادەبووانو نەخشەی بەرگری کردنی لە مەدینە لێ داوا کردن، هەریەکەو پێشنیاریکی کردو پاش موناقەشەیەکی زۆر لە نێوان فەرماندەی هێزەکانو ئەندامانی شورادا ڕوویدا بە کۆی دەنگ پێشنیارێکی سەلمانی فارسی وەرگیراو دەستکرایە جێبەجێکردنی[2].

پێشنیارەکەی سەلمان ئەوەبوو کە ئەوان لە ناو فارسدا لەو جۆرە کاتانەدا کە ئابلۆقە بدرانایە (خەندەق)یان هەڵئەکەند، لە پشت خەندەقەکەوە بەرگرییان ئەکرد لە شارەکەیان..

پێغەمبەر ﷺ خێرا هەر دە نەفەری دانا بۆ هەڵکەندنی (چل) مەتر زەویو سوپا بێشومارەکە پیش ئەوەی بگاتە مەدینە هەڵکەندنی (خەندەق)ەکە تەواو بوو، سوپای مەدینەش بەسەر درێژایی خەندەقەکەدا دابەش بوو، بۆ بەرگریی کردن لە مەدینە[3].

نەخشەی جوگرافیای مەدینە بەمشێوەیەبوو:

---

[1] کە لە (ئوحود)دا موسڵمانەکان تێك شکان، لەبەر ئەو هەڵەیەی کە کردیان، قورەیش وتیان ساڵێکی تر ئەمڕۆ با ژوانمان بێت لە (بەدر)داو وەرنەوە بۆ شەڕ، پێغەمبەر ﷺو موسڵمانان لە وادەی خۆیدا پاش ساڵەکە چونەوە بۆ بەدرو هەشت ڕۆژ چاوەڕوانییان کرد کەچی قورەیش نەیانوێرا بێنەوە (الرحیق المختوم: ص٢٨٧).

[2] لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ وردترین بنەماو ڕێساکانی بەڕێوەبردنی ڕەچاو کردووە لە (کۆچ بۆ مەدینە)داو ئەوەی لێرەشدا هەر لە ڕووی زانستیی بەڕێوەبەردنەوە بە نەخشەی بەرگری کردن لە مەدینە دائەنرێ.

[3] سیرە ابن هشام (٣/٣٣٠).

ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو باشوور هەمووی دارو درەختو شاخو بەردەڵان بوو، ڕێگەی هاتنی سوپای نەبوو تەنیا کەلێنێك نەبێت کە ئەویش ناوچەکانی (بني قوريظة) بوو، بەرەمیشیان کە باکوری مەدینەی ئەکرد، سوپای (ئەحزاب) لەوێوە هاتن، پێغەمبەر ﷺ خەندەقەکەی لەوێدا هەڵکەند.

کە سوپا بێ شومارەکەی ئەحزاب گەیشتە مەدینە سەیر ئەکەن چواردەورەی مەدینە تەنراوەو خەندە لێدراوە، تووشی شتێکی کتوپڕ بوون لەوەوپێش شتی وایان نەدیبوو لەناو عەرەبدا، موسڵمانەکانیش کە هەموو (سێ هەزار) کەس بوون، بەم شێوەیە دامەزران، پشتیان کردە شاخی (سلع)و لێی دامەزرانو خەندەقەکە کەوتە نێوان ئەمانو سوپای ئەحزابەوە[1]، کە قورەیش بە دەورەی خەندەکەدا چەند جارێ سوڕانەوەو سەیریان کرد چار نییە ئابڵوقە خستنە سەر (مەدینە) نەبێت، بۆیە ئابڵوقەیان خستە سەر مەدینە.. ئەم ئابڵوقەو شەڕە تیرو نەخەوتنی بەردەوامە وای کرد ئەوەندە سەرقاڵیو ماندوو بوونی بۆ پێغەمبەر ﷺو موسڵمانان دروست کرد چەند نوێژێکیا ن لە دەستچوو[2]، حاڵەکە وای لێهات گریمانی لەناوچوون زۆر بوو بەڕادەیەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا* هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالاً شَدِيداً) (الأحزاب: ١٠ ـ ١١).

واتە: لە سەرەوە بۆتان هاتنو لە خوارەوەش بۆتان هاتنو گەیشتنە ئەوەی کە چاوەکان لاربووبوون، دڵەکان گەیشتبوونە قورگ[3]و ئێوەش هەزار گومانتان بە خوا ئەبرد* ئا لەوێدا موسڵمانان (ی ڕاستەقینە) کەوتنە تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەو زۆر توند ڕاتەکێنران لە ناخەوە..

ئا لەم کاتە هەستیارو ناسکەدا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەوەی پێگەیشتن کە (بنی قریظة)ش لە ژێرەوەو لەگەڵ سوپای ئەحزابدا ڕێککەوتوونو بڕیاریان وایە ئەوان لە پێشەوەو ئەمانیش لە پشتەوە بدەن لە موسڵمانان.. ئەم هەواڵە هەواڵێکی زۆر ترسناکو قورس بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ شاردیەوە لە ئەصحابەکانی تا خەڵکی (مەدینە) (ورە) بەر نەدەن، ڕاستی هەواڵەکەش بەم شێوەیەیە: "کە (حیی) بینی (ئەحزاب) خەریکە ماندوو ئەبن لە درێژەکێشانی ئابڵوقەکەدا، بە قورەیشو غەتەفانی وت: من ئەتوانم (بني قريظة) قەناعەت پێ بکەم پەیماننامەکەیان لەگەڵ موحەممەد هەڵبوەشێننەوە، ئەوکاتە بە تیرێ دوو نیشانە ئەشکێنین، یەکەمیان: کۆمەکی (بنی قریظة) بۆ موحەممەد ناهێڵین، دووەمیان: ڕێگەیەکیش ئەکەینەوە بۆ چوونە ناو (مەدینە)[4]، (حيي)و وەفدێکی خەتاکارچوون بۆ لای کەعبی کوڕی ئەسەد کە گەورەی (بني قريظة) بوو، (کەعب سەرەتا دەرگای لێ نەکردنەوەو (حویەی) قیڕاندی وتی: خوا بتگرێ دەرگاکەم لێ بکەرەوە، کەعب وتی: دەرگا ناکەمەوە تۆ کابرایەکی شوومی! منیش پەیمانم لەگەڵ موحەممەددا مۆر کردووە، نایشکێنمو لە ڕاستگۆیی و وەفاداری بەولاوە هیچی ترم لێ نەدیوە، (حویەی) وتی: کورە خوابتگرێ دەرگاکەم لێ بکەوە با قسەیەکت لەگەڵدا بکەم، کەعب وتی: هەرگیز نایکەمەوە. (حویەی) وتی: سوێند بەخوا لە ترسی ئەوە دەرگاکەم لێ ناکەیتەوە تا لەگەڵتدا نان نەخۆم، کابرا غیرەت گرتیو ناچار دەرگاکەی بۆ کردەوە"[5].

---

[1] نووسەرانی "سیرە" ئەڵێن: موسڵمانەکان بە شێوەیەك دامەزران تا: ١. ڕێگە لە دزەکردنی دوژمن بگرن، ٢. بواری تیربارانکردنیان ببێت، ٣. ڕێگە نەدەن ئەحزاب لە شوێنێکەوە خەندەقەکە پڕ بکەنەوەو پردێك بۆ پەڕینەوە دروست بکەن. (الرحيق المختوم، ص٢٩٤).

[2] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

[3] بە کوردی خۆمان ئەوترێ (گیان گەیشتبووە کونە لووتی).

[4] حياة محمد/ هيكل، ص٣٣٢..

[5] فقه السيرة/ الغزالي، ص ٣٢٣ ـ ٣٢٤.

(حویەی) چوویە ژوورەوەو وتی: (کەعب!) خوا بتگریٚ سەربەرزی ڕۆژگارو دەریایەکی لیٚوان لیٚو ئاوم هیٚناوەتە خزمەتت! کەعب وتی: چۆن؟ (حویەی) وتی: هەرچی پیاوی شەریف و ئازاو ناوداری قورەیشم بۆ هیٚناویو لە (کۆمەڵگای ئەسیال) مۆڵم داونو هەموو شەریفو ئازاکانی (غطفان)یشم بۆ هیٚناوی لە پاڵ (ئوحد)دا مۆڵم داون بۆتو پەیمانی ئەوەیان داومەتیٚ تا موحەممەد لە ڕەگو ڕیشەوە دەرنەهیٚنن نەگەڕیٚنەوە، کەعب وتی: وەڵلاهی سەرکزی ڕۆژگارو جامیٚکی خاڵی ئاوت هیٚناوە کە بریقە ئەداتەوەو ئەگرمیٚنیٚو هیچیشی تیٚدا نییە، (بابە) لیٚم گەڕیٚو لیٚم تیٚك مەدە من لە ڕاستگۆییو وەفاداری بەولاوە هیچم لە موحەممەد نەبینیوە.. هەندیٚ لە ئەندامانی وەفدەکە هەوڵیاندا کە (بنی قریظة) بیٚلایەن بکەن، نە پشتی ئەمان بگریٚو نە پشتی موسڵمانەکانیش بگریٚو لیٚ بگەڕیٚن با ئەم سوپای هاتووە لەبنو بیٚخ دەریان بهیٚنن، بەڵام (حویەی) لە کۆتاییدا هەر قەناعەتی بە (کەعب) کردوو لەوکاتو ساتە زۆر ترسناکەدا (بنی قریظة) تووشی ئەو (غەدر)ە بکات.. تا ئەوەبوو (بنی قریظة) نوسخەی پەیماننامەکەی خۆیانو پیٚغەمبەریان ﷺ هیٚناو لە بەرچاوی ئەم وەفدەدا دڕاندیانو کاتیٚکیش پیٚغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی مەعازی نارد بۆ لایان تا لە هەواڵەکە دڵنیا ببن ئەوەبوو وتیان: پیٚغەمبەر ﷺ داوای کۆمەکیتان ئەکات، وتیان: پیٚغەمبەر کیٚیە؟ ئیٚمە هیچ پەیمانیٚك نییە لە نیٚوانماندا.

سەعد هەوڵیدا پەیمانەکەیان بیر بخاتەوە کە لەگەڵ پیٚغەمبەر ﷺ مۆریان کرد، ئەوان فزەیان لیوە نەهات.. سەعد لە داهاتووی ئەم ناپاکییە ئاگاداری کردنەوەو وتی: ئاخر وەك (بنی نضیر)تان بەسەردیٚ، ئەوان وتیان (اكلت أير ابيك)[1]، سەعد وتی: (جوان قسە بکەن)[2].پیٚغەمبەر ﷺ وا ڕیٚککەوتبوو لەگەڵ (سەعدی کوڕی مەعاز)و ئەواندا کە ئەگەر هەواڵەکە ڕاست بوو ئەوە بە (جفرە) بیڵیٚن تا کار لە وڕەی خەڵکەکە نەکات، ئەوانیش کە هەواڵەکەیان بۆ هیٚنایەوە وتیان: "عوزەلو قاڕرە"[3].

بەڵیٚ، (بنی قريظة) پەیمانکەیان شکاندو یەکەمین قافڵە (تەداروکاتیان) نارد بۆ قورەیش کە باری بیست هوشتر خورماو هەنجیرو جۆ بوو تا (ئەحزاب) بتوانیٚت زیاتر خۆی ڕابگریٚت، بەڵام پیٚش ئەوەی بگاتە ئەوان (مەفرەزەیەکی ناو شاری مەدینە) دەستیان بەسەردا گرتو نەیانهیٚڵا بگات بە ئەحزابو هیٚنایانە خزمەتی پیٚغەمبەرﷺ[4]، پیٚغەمبەر ﷺ بۆ بەرزکردنەوەی وڕەی خەڵکی دوو هیٚزی نارد بۆ شار کە (بە هەردووکیانەوە پیٚنج سەد کەس ئەبوون)، بەناو شاردا ئەگەڕانو (الله اكبر)یان ئەکرد، مەفرەزەیەکی ئەو دوو هیٚزە (بیست بارە حوشترەکەی گرت)[5]، پیٚغەمبەر ﷺ زۆر بیری کردەوە چۆن ئەم ئابلۆقەیە بشکیٚنیٚ بۆیە هاتە سەر ئەو قەناعەتەی لەگەڵ (غطفان)دا (صفقە)یەك ببەستیٚو درز بکاتە سوپای (ئەحزابەوە)[6]، (صفقە)کەش ئەوەبوو: ئەوان بگەڕیٚنەوە شویٚنو وڵاتی خۆیانو دەست لەم ئاڵوقەدانە هەڵگرن بە بەرانبەر (یەك لەسەر سیٚ)ی بەروبوومی (مەدینە)وە بۆ ماوەیساڵیٚك، وەك (باشمیل لە غزوة الاحزاب: ص٢٠١)دا باسی ئەکات.. بەڵام ئەوەبوو پیٚش ئیمزاکردنی ئەم (صەفقە)یە پیٚغەمبەر ﷺ ئەم پیٚشنیارەی خستە بەردەم سەحابەکان تا ڕای خۆیانی لەسەر بدەن، هاوەڵان ڕایان لەسەری نەبوو

---

[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە، * ئەم قسە ناشرینەیان بەرانبەر سەعد بەڵگەی پیسی ناخیان بوو کە قەڵەمەکەی ئیٚمە شەرم ئەکات وەری بگیٚڕیٚتە سەر زمانی کوردی.

[2] ئەم زیادەیە لە (البداية والنهاية) (٤٥٤/٤)دا هەیە.

[3] (عوزەلو قارە) ئەو دو خیٚڵە ناپاکەبوون کە (چل) صەحابەیان بە (غەدر) شەهیدر کرد.

[4] السيرة النبوية، الصلابي (٣٣٨/٢٦).

[5] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پیٚشوو.

[6] نووسەرانی (سیرە) لەوانە (عەلی موحەممەد ئەلصەلابی) لە (السيرة النبوية) (٣٤٢/٢)و (أحمد باشميل، ص٢٠١) لە (غزوة الأحزاب)دا ئەڵیٚن: بۆیە پیٚغەمبەر ﷺ (غطفان)ی هەڵبژاردووە، چونکە ئەیزانی ئەوان هیچ ئامانجیٚکیان لەم شەڕەدا نییە سەروەتو سامان نەبیٚت، بەڵام قورەیش و یەهود ئامانجی سیاسییو دینییان هەیە لەم شەڕەداو نیازیان وایە کە قەوارە ئیسلامییەکە لەبنو بیٚخەوە دەربهیٚنن، ئەوەبوو (غطفان) بیٚ سیٚو دوو (صەفقە)کەیان قبوڵ کرد.

هەردوو سەعدەکە (سەعدی کوڕی مەعازو سەعدی کوڕی عوبادە) کە سەرۆکی ئەوس و خەزرەج بوون، عەرزیان کرد: قوربان، ئەمە پێشنیارو ڕای جەنابتەو حەز ئەکەی ئێمەش ڕامان لەسەری بێ، یان شتێکە خوا بۆی داناوی و فەرمانی پێکردووی، یان شتێکە لەبەر خاتری ئێمە ئەیکەی؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بل شئ أصنعه لكم، والله ما أصنع ذلك الا لأني رايت العرب، متكم عن قوس واحدة وكالبوكم، من كل جانب، فأردت ان أكسر عنكم شوكتهم الى أمرما). واتە: "بەڵکو ئەمە شتێکە لەبەر خاتری ئێوە ئەیکەم، خوا شایەتیشە ئەمەش بۆیە ئەکەم، چونکە سەیر ئەکەم عەرەب هەمووی بەیەکەوە تیربارانتان ئەکەنو لە هەموو لایەکەوە قولاپیان بۆ هەڵداون، مەبەستم ئەوەیە شەوکەتیان بشکێنم بۆ ماوەیەکیش بێت.." هەردوو سەعدەکە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە کاتی خۆشی کە وەکو ئەوان موشریك بووین و خوامان نەئەناسی چاوەڕوانی ئەوە نەبوون دەنکێ خورمامان بخۆن بە میوانداری، یان کڕین نەبێت، ئەی پاش ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لێناوین و ئیسلامی بۆ ناردووین و سەربەرزی کردوین، ماڵ و سەوەتمانیان بدەینێ؟! قوربان! ئێمە پێویستمان بەشتی وانییە، سوێند بەخوا شمشێر نەبێت هیچی ترمان لێ نابینن تا بزانین خوا چۆن حوکمی نێوانمان ئەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیتر ئەوە بڕیاری خۆتانە، سەعد سوڵحنامەکەی وەرگرت و لەت و پەتی کردوو وتی: (منەتیان نەبێ)، با پەلامارمان بدەن[1].

بەهەرحاڵ یەهودو (بنی قريظة) چوونە بەرەی شەڕەکەو شەڕیان ڕاگەیاندو نێتی ئەوەیان هێنا لەگەڵ سوپای ئەحزابدا تەڕو وشك پێکەوە بسووتێنن و ماڵ و منداڵی پێغەمبەرو ئەصحابەکانی بدەنە دەست (سوپای ئەحزاب) لە بازاڕەکاندا بفرۆشرێن و ببنە ئاردی ناو دڕك.

بەڵام خوای گەورە خۆی دەخالەتی کرد لە شەڕەکەدا سوپای ترس و سەرماو ڕەشەبای ناردە سەر سوپا فشۆڵەکەی ئەحزاب و کەسێکیشی نارد بەناوی (نەعیمی کوڕی مەسعود) توانی درز بخاتە نێوان (بنی قورەیزەو سوپای ئەحزابەوە[2]،سوپا بێ شومارەکەی ئەحزاب ورەیان بەرداو ئاشبەتاڵیان لێکردو هەریەکەو گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْراً وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيّاً عَزِيزاً) (الأحزاب: ٢٥). واتە: خوای گەورە ئەوانەی کە خۆیان کافر کردبوو بە دڵی پڕ ڕقەوە گەڕاندەوەو هیچ خێرێکیان چنگ نەکەوت و شەڕەکەشی لادا لە موسڵمانان، خوای گەورەش بە هێزو خاوەن دەسەڵاتە.

ئەوە سەربوردەی (بەنی قورەیزە) بوو لە چەند لاوە ناپاکییان ڕاگەیاند، لەلایەکەوە دژ بە دەستووری مەدینە بوون لە چەند ماددەو بڕگەیدا، لەلایەکیشەوە نێتپیسی بەردەوامیان، لەلایەکیشەوە زمانپیسییان بەرانبەر پێغەمبەر ﷺو بەرانبەر سەعدی هاوپەیمانیان کە زۆر لێیان پاڕایەوە هەمان مێژووی (بەنی نەزیر) نەیەنن بەسەر خۆیاندا، لە لایەکی ترەوە نەیانئەهێڵا موسڵمانان لە مەدینەدا ڕۆژێك بەبێ ترس و غەم بخەون، بەڵکو ئەبوو هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیان بێت، نەوەك لە ناخافڵێکدا جوولەکە پەنێك بدەن!

ئەم یەهودانە مێژوویان هەروا بووە، دەستیان چووە بە خوێنی چەندان پێغەمبەردا، خوای گەورە ئەفەرموێ: (أَفَكُلَّمَا جَاءكُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقاً كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقاً تَقْتُلُونَ) (البقره: ٨٧). هەموو کاتێك کە پێغەمبەرێکیان بۆ ئەهات و هەواو ئارەزووتان نەیئەگرت، لوتتان ئەکرد بە ئاسماندا و کۆمەڵێکیانتان لێ ئەکوشتن و کۆمەڵێکتان بە درۆزن ئەدایە قەڵەم! دیارە هەرئەم خووخدەیان بووە بۆیە لە هەموو ئەورووپاشدا جێیان نەبوویەوە،

[1] پرسیارەکانی هەردوو سەعدەکە زۆر وردبوون کە سێ لقیان لە پێشنیارەکە دروست کرد، ئێمە گەڕانەوەمان بۆ ئەم چەمکە ئەبێت لەلاپەڕەکانی دوایدا.

[2] ئەم کارەی (نعيم کوڕی مەسعود) چیرۆکێکی دوورو درێژەو بە ئاشکرا دەرئەکەوێت کە خوای گەورە لەو کاتە ناسکەدا بۆ بەرزکردنەوەی ورەی خەڵکی مەدینەو ڕماندنی ورەی سوپای ئەحزاب ڕێکی خستبوو. بۆ درێژەکەی سەیری (حياه محمد/ هيكل، ص ٣٢٥ ـ ٣٢٦) بکە.

نەك هەر ئەوە بەڵكو كوورەو مەنجەنیقیان بۆ دروست كردن بۆ ئەوەی بنەبڕیبن، بەڵام كە هەرچار نەكران ڕەویان پێكرا بە بەرنامەیەكی ورد تا بێتە فەلەستین ئەوەتا لەو كاتەوەی هاتوونەتە ئەم ناوچەیە، بەردەوام دەستیان لە خوێنی خەڵیدایە، شەڕی ١٩٤٨و شەڕی ١٩٥٧و شەڕی ١٩٦٣و شەڕی ١٩٧٣و ١٩٨٢.. هتد، ئێستەش لە كانی ئەم نووسینەیەدا، كە (٢٠٠٦/٧/٩)ە بەوپەڕی دڕەندەییانە بەربوونەتە وڵاتی لوبنانو تۆپبارانی ئەو وڵاتە جوانە ئەكەن، لە جیاتی قارەمانانەو مەردانە شەڕی ساحەو مەیدان بكات لەگەڵ (حزب الله)دا كەچی بەربووەتە گیانی شارو هاووڵاتیانو هەر ڕۆژەی قەسابخانەیەك بەرپا ئەكەن، لە (قانا)و (عیتا شعب)و (مارون راس)و (عیترون).. باشە با لە (میر فطروس)و دەستەو دائیرەكەی بپرسین، میللەتێ دەستی دوژمن ڕابكێشێو بیهێنێتە سەرت بە سوپایەكی بێ شومارەوە لە ژێرەوە كلك گرێ بدات لەگەڵ سوپای ئەحزابداو قسەی ناشایستە بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ كە سەرۆكی وڵاتو قەوارەكەیە بكاتو چی پەیماننامە هەیە بیخاتە ژێر پێو بەنوێنەرەكەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ (اكلت أير أبيك) كە ئەو لە ڕووی دۆستایەتی كۆنو دڵسۆزییەوە لەسەر ئەنجامی ئەم ناپاكییەیان ئاگاداریان بكاتەوە ئامادەبن بەیەك هەڵمەت ئەوەی پەیوەندی هەیە بەم ئایینە تازەوە لە یەك ڕۆژدا وەك دەغڵو دان دروێنەی بكەن.. باشە ئەبێت هەڵوێست چیبێت لێیان (ڕیزلێنان)و (ئافەرین) بكرێن؟ یان چاوپۆشییان لێ بكرێ تا جارێكی تر خۆیان ڕێك بخەنەوە! ئایا ئەم میكرۆبانە جگە لە قەڵاچۆكردن هیچ چارێكی تریان هەیە؟! موحەممەد ئەلغەزالی ئەڵێ: "سوپای بێ شوماری ئەحزاب دەوروبەری مەدینەیان چۆڵ كرد.. بەنی قورەیزەش بە تاكو تەنیای مانەوەو غەدرو ناپاكییەكەشیان بەناو چاوانیانەوە لە هەموو كەسەوە دیار بوو، وەك تاوانبارێك وابوون كە بەسەر تاوانەكەوە گیرابێتو سەری كرز كردبێتو چاوەڕوانی دادگاییكردن بكات".

دڵی گەورەو بچووكی موسڵمانان كوڵی ئەدا لە داخی یەهود، یەهودێك دنیای پەلكێش كردبێت بۆ لەبنو بێخ دەرهێنانی ئەهلی ئیسلام، لە كاتێكدا ئەوان جگە لە ڕاستگۆییو وەفاداری هیچی تریان نەبینیوو لە پێغەمبەر ﷺ ئەی ئەم ناپاكییە گەورەیە لەپای چیی؟

دوای ئەمانەش داڵدەی تاوانبارێكی وەك (حویەی كوڕی أخطب)یان داوەو لە قەڵاكانی خۆیاندا قایمیان كردووە، كە دونیای (تحریض) كردبوو دژ بە پێغەمبەر ﷺو بە بتپەرستەكانی قورەیشی وتبوو: دینی ئێوە زۆر چاكترە لە دینی موحەممەدو هاوەڵەكانی[1]. لەبەر ئەمانە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بانگ بدرێت بەناو خەڵكیداو بووترێ (من كان سامعا مطيعا فلا يصلين الا في بني قريظة)[2]. هەركەسێك گوێ گرو گوێڕایەڵە با (نوێژی عەسر) بەرێتە (بەنو قورەزە)و لەوێ بیكات، موسڵمانان دانە دانەو كۆمەڵ كۆمەڵ كۆبوونەوە لە دەوری قەڵاتەكانی (بەنی قوریظة)و ئاڵای موسڵمانان بەدەست (عەلی)ەوە بوو، عەلی كە نزیكبوویەوە لێیان سەیر ئەكات هێشتا ئەوان خۆیان بە مەغدور ئەزانن و قسەی ناشایستەو بەرزو نزم بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ ئەكەن.. حەزرەتی عەلی عەرزی پێغەمبەری ﷺ كرد وتی: قوربان لە قەڵاكەیان نزیك مەكەوە، نیازیان خراپە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دیارە شتی خراپت لێ بیستوون دەربارەی من؟ وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر خۆم ببینن هیچی خراپ ناڵێن.. فەرموودەیەك هەیە چەند زانایانی فەرموودە لەوانە (ئەلبانی) ئەڵێ: (ضعیف)ە، گوایە پێغەمبەر ﷺ لە قەڵاكانیان نزیك ئەبێتەوەو گوێی لە هەندێ قسەی خراپیان ئەبێت، ئەفەرموێ: (يا اخوان القردة، أهل أخزاكم الله وانزل بكم نقمته؟) بە خەجاڵەتییەوە وتیان: (يا أبا القاسم ما كنت جهولا). جا موحەممەد ئەلغەزالی ئەڵێ: "ئەوە

[1] ئەم هەڵوێستەی (حویەی) ئەوەندە مایەی شەرمەزارییە (دكتۆر ئیسرائیل ولفنسون)ی ڕۆژهەڵاتناس باسی ئەو خاڵە ڕەشە بەناوچاوی زاناو حەبرەكانی یەهودەوە ئەكات كە ئایینی بتپەرستیان بە چاكتر دایە قەڵەم لە ئایینێك كە بانگ بۆیەكتاپەرستی ئەكات، سەیری هەڵسەنگاندنی ئەم هەڵوێستە بكە لە كتێبی (حياة محمد/ محمد حسين هيكل ص٣٢٩).

[2] فقه السيرة/ ص٣٣٧.

سیفەتی یەهودە کە بێ خەم بوون دەست ئەدەنە بێ عەقڵی، گەر دەسەڵاتیان هەبوو دەست ئەدەنە خەڵك کوشتن، کە ترسناکییەکیش بەرەوڕوویان بوویەوە بەها باڵاکان وەبیر خەڵکی دێننەوە، بۆ ئەوەی هەر خۆیان‌و هەر بەتەنیا خۆیان سوودی لێ وەربگرن! بەڵام مەسەلەی ئەو پەیمانانەی ئەیدەن لە ژیانیاندا، ئەوە کۆتا شتە کە باسی بکەن، هەرچەندە ئەم جارە عەقڵیەکەیان فریایان نەکەوت، هەرزوو موسڵمانان گەمارۆیان دان‌و ئابڵوقەیان خستنە سەر"[1].

کە بەنی قورەیزە دڵنیابوون ئەبێ سزای ناپاکییەکەیان وەربگرن کەعب سەرانی یەهودی لە قەڵاکەدا کۆکردەوەو پێی وتن: ئەی کۆمەڵەی یەهود تازە تووشی ئەوە بوین کە ئەیبینن، جا من سێ پێشنیارتان ئەخەمە بەردەست کامیانتان بەدڵە با کار بەوەیان بکەین.. وتیان: ئادەی کامانەن؟ وتی: شوێن ئەم کابرایە بکەوین‌و پشتیوانی لێ بکەین.. سوێند بەخوا! باش بۆتان ڕوون بووەتەوە ئەم کابرایە پێغەمبەری خاوەن پەیامی خوداییە، ئەوە هەر ئەو پێغەمبەرەیە کە لە تەوراتدا باسی کراوە، بەمەش خوێن‌و ماڵ‌و منداڵتان‌و ژنەکانتان (ئەمان)یان دەست ئەکەوێت.. سەرانی جوولەکە وتیان: هەرگیز شتی واناکەین‌و دوای جگە لە تەورات ناکەوین.

وتی: دەی ئەمەم لێ وەرناگرن، وەرن بەدەستی خۆمان با ژن‌و منداڵەکانمان بکوژین‌و شمشێرەکانمان هەڵکێشین‌و بچین بۆیان‌و خەمی دوای خۆمان نەبێت، تا بزانین خوا چی بڕیار ئەدات لە نێوان ئێمەو موحەممەددا، جا ئەگەر هەموو تیاچووین ئەوە ترسی هیچ کەسێکمان نییە دوای خۆمان خۆ ئەگەر سەریش کەوتین ئەوە ژن‌و منداڵی ترمان دەست ئەکەوێت..

وتیان: ژن‌و منداڵەکانمان بەبێ هیچ گوناهێك بکوژین؟ جا دوای ئەوان ژیان خۆشی چییە؟

وتی: دەی کە ئەمەشم لێ وەرناگرن، ئەمشەو شەوی شەممەیە بەڵکو موحەممەدو هاوەڵەکانی بێخەم بن لێمان‌و با بچینە خوارەوەو دەستێکیان لێ بوەشێنین. وتیان: ڕۆژی شەممە لە خۆمان تێك بدەین کە کەسی پێش ئێمە تێکی نەداوە؟ کەعب وتی: لەو ڕۆژەی لەدایکبوون پیاوێکتان نییە تەنیا شەوێك خاوەنی ئیرادەی خۆی بوبێت!

(بەنی قورەیزە) هەوڵیاندا کە صوڵحنامەیەك بکەن لەگەڵ موسڵوماناندا وەك ئەوەی (بەنی نضیر) بەڵام بێ سود بوو، موسڵمانان ئەیانوت ئەبێ (بێ هیچ مەرجێك) تەسلیم بن، دیسان داوایان کرد کە کەسێك بێت‌و ڕاوێژی لەگەڵ بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبو لوبابە)ی لەسەر داوای خۆیان نارد بۆ ناویان، لە ئەبولوبابەیان پرسی: بە حوکمی موحەممەد ڕازی ببین؟ وتی: بەڵێ، (ئەبو لوبابە) ئاماژەیەکی بۆ گەرنیشی کرد وەك ئەوەی بڵێ: فەرمانی (ئیعدام)تان بۆ دەرچووە، (ئەبو لوبابە) یەکسەر دوای ئەوە هەستی کرد نهێنییەکی درکاندووەو ئەوە ناپاکییە نهێنی بدەی بە دوژمن، بۆیە ڕووی نەهات بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو یەکسەر چوویەوەبۆ مەدینەو خۆی بەستەوە بە کۆڵەکەیەکەوەو بڕیاریدا تا پێغەمبەر ﷺ لێی نەبووری، خۆی نەیکاتەوەو هەر لەوێدا بمێنێتەوە.. ئابڵوقەکە درێژەی کێشاو گەیشتە (٢٥) شەو، عەلی کە ئاڵا بەدەستی سوپاکەبوو هاواری کرد: ئەی کەتیبەی باوەڕوداران، (کە زوبەیری کوڕی عەوام)یشیان لەگەڵدا بوو، سوێند بەخوا یان منیش وەك حەمزە شەرابی شەهیدی ئەنۆشم یان دەرگای ئەم قەڵاو قولانەیان ئەشکێنم، (بەنی قورەیزە) وتیان موحەممەد ئێمە بە بڕیاری (سەعدی کوڕی مەعاز) ڕازین، ئەوەبوو داوایان لێکرا تەسلیم بن‌و بێنە خوارەوەو پێغەمبەریش ﷺ ناردی بە شوێن (سەعد)دا بهێنن تا بڕیار بدات بۆیان[2].

---

[1] فقە السیرة، ص٣٣٩.

[2] سەعد لەسەرنگەرێکداو لە کاتی پاسەوانیدا لە شەڕی (خەندەق)دا تیرێك بەر شادەرماری قاچی کەوتبوو بەردەوام خوێنی لێ دەڕۆیی، پێغەمبەری خوا ﷺ خێمەیەکی تایبەتی بۆ هەڵدابوو لەژێر چارەسەرو چاودێری بەردەوامدا بوو، سەعد دوای ئەو پێکرانە دوعای کردبوو خوایە: ئەوەندە بمهێڵی تا چارەنووسی بەنی قورەیزە بەچاوی خۆم ئەبینم. (الرحیق المختوم، ص ٢٩٧).

یەهود بەنیازی ئەوەوە (سەعد)یان (کە گەورەی ئەوس بوو)، هەڵبژارد کە بەسۆز بێت بەرانبەریان‌و نەرمی بنوێنێ[1]، (ئەوس)یش هەروا بۆی ئەڕۆیین، کاتێك (سەعد) بە برینداری‌و جلی خوێنینەوە هات، پێغەمبەر فەرمووی هەستن لەبەر سەعدو لە وڵاخەکەی دایبەزێنن، پیاوانی عەشرەتەکەی کە دایان ئەگرت، هەندێکیان پێیان ئەوت: بەڵکو تۆ هەر چاکبیت لەگەڵیاندا! ئەویش وتی: کاتی ئەوە هاتووە گلەیی کەس کارم تێنەکات، بەڵام سەعد وەك موحەممەد ئەلغەزالی ئەڵێ: "لەناو ئەو هەموو تکایەدا کەلێی ئەکرا ئەوەی لەبیر نەئەچوو کە هەر خوا خۆی‌و بە شتێکی سەرسوڕهێنەر ماڵ‌و منداڵ‌و موڵك‌و سامان‌و شەرەف‌و هەموو شتێکیانی ڕزگار کرد لە ناپاکی یەهودو سوپای بێ شوماری ئەحزاب، ئەوەی ئەهاتە بەرچاو کە بەنی قورەیزە داڵدەی ئەو هەموو خەڵکە ناپاك‌و دڕندانەیاندا کە بۆ لە بنوبێخ دەرهێنانی یەکتاپەرستی ڕاستەقینە هاتبوون، سەعد ئەوەشی ئەهاتەوە بیر کە بەنی قورەیزە چۆن پەیمانەکەیان شکاندو ئەو هەمووە قسە نەشیاوو ناشایستەیان بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ‌و خۆشی کرد کە تکای لێ ئەکردن دەست تێکەڵ نەکەن لەگەڵ دوژمندا باوەك بەنی نەزیرتان بەسەر نەیە کەچی ئەوان پێیان وت: (اكلت اير أبيك)؟"!!.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەعد! ئەو خەڵکە بڕیاری خۆیان داوەتە دەستی تۆ! سەعد وتی: هەر بڕیارێك بدەم جێبەجێ ئەکرێت بەسەریاندا؟ یەهود وتیان: بەڵێ، سەعد وتی: بەسەر موسڵمانەکانیشدا؟ وتیان: بەڵێ، سەعد وتی: بەسەر ئەوەیشدا ئاڵەوێدایە؟ ڕووی نەهات ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوو بەرانبەر پێغەمبەر بیڵێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەڵێ بەسەر منیشدا.. سەعد وتی: بڕیاری من ئەوەیە کە هەموو پیاوە (شەڕکەر)ەکانیان ئیعدام بکرێن‌و ماڵ‌و سامانەکەنیشیان موصادەرە بکرێت‌و کۆتاییان پێ بێت.

نووسەرانی (سیرة) ئەڵێن: ئەم بڕیارەی (سەعد) ئەوپەڕی دادو ئینصافی تیدابوو، چونکە بەنو قورەیزە زیاد لەوەی ئەو ناپاکییە گەورەیان ئەنجامدا چەك‌و تفاقی دنیاشیان پێکەوە نابوو بۆ قەلاچۆکردنی یەکجاری موسڵمانان (هەزارو پێنج سەد شمشێری شەڕو دوو هەزار ڕم، سێ سەد قەڵغان، هەزارو پێنج سەد زرێ پۆش‌و جەوەنەی ئاوو..) ئەگەر سەعد ئەم بڕیارەی نەدایە هەر هەلێکیان بۆ هەڵکەوتایە لەدەستیان نەئەدا بۆ لەناوبردنی یەکجارەکیی موسڵمانان[2]. سەیر ئەوەیە لە کاتێکیشدا کە بەرەو ئیعدام کردن ئەبران پەشیمان نەبوون لەوەی کردبوویان.. نووسەرانی (سیرە) ئەڵێن: "(حویەی کوڕی ئەختەب)یان هێنا بۆ ئیعدام کردن، کە وەك ئەزانن ئەم میکرۆبی ئەو هەمووە ناپاکییە بوو، سەیرێکی پێغەمبەری خوای ﷺ کردو وتی: سوێند بەخوا هەرگیز گلەیی لەخۆم ناکەم کە دوژمنایەتی تۆم ئەکرد، بەڵام هەرکەسێك خوا پشتیوانی نەکات فەشەل ئەهێنێ‌و ڕیسوا ئەبێت، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی: خەڵکینە! چی بکەین لەژێرباری خوادایین، ئەوە قەدەرەو کتێبەو داستانێکە خوا دژ بە (بنی ئیسرائیل) نووسیویەتی پاشان ملی شۆڕکردو ئیعدام کرا"[3].

نکولی لەوە ناکرێت چ لە ناو یەهودو چ لەناو قورەیشدا کەسی وایان تێدابووە بەبێ هیچ ترسێك ڕووبەڕوی مەرگی خۆیان بوونەتەوەو مەردانە بۆی ڕاوەستاون‌و بیروڕا پوچەکان‌و تاقم‌و گروپە هیچپەکانیش ئەوەندە پیاوی خۆیان دەست دەکەوێت کە بە دڵ‌و بە گیان شتەکەی خۆیان بگرن‌و خۆیانی بۆ بەخت بکەن، هەرچەندە ئەو بە دڵ

---

[1] موحەممەد حسنێن هیکل لە (حياه محمد، ص٣٢٩)دا ئەڵێ: "زۆر سەیرە بەنی قورەیزە بە چ عەقڵێکەوە سەعدیان هەڵبژارد باشە لەبیریان چووبوویەوە چییان بە سەعد وت‌و لەبەردەم ئەودا چ کارێکیان کرد بەرانبەر بە پەیماننەکەیان، دیارە هەر (قەدەر) کوێری کردن تا ئەوەی لە (لوح المحفوظ)دا بۆیان دیاری کرابوو بێت بەسەریانداو ڕووبدات"!!.

[2] الرحيق المختوم، ص٣٠٤.

[3] فقه السيرة، الغزالي، ص٣٤٢.

* مەبەستیان ئەوەبوو ئایا بچن کوڕەکانیان لەوێ بهێننەوەو بیانکەنە موسڵمان.

گرتن‌و خۆفیداکردنه ئه‌و شته پووچ‌و بێخه‌یره‌یان ناکاته شتێکی به‌سوودو چاك‌و سته‌م‌و زوڵمه‌که‌شیان ناگۆڕێ به‌دادو سه‌روه‌ری.

یه‌هودی دوێنێ هه‌رهه‌مان یه‌هودی ئه‌مڕۆن، سه‌دان‌و هه‌زارانیان له فه‌له‌ستیندا سه‌ربڕی هه‌ر به‌بێ ده‌نگی‌و ئه‌و وڵاته‌یان داگیر کردو فه‌له‌ستینیان کرده وڵاتێکی بێ گه‌ل بۆ گه‌لێکی بێ وڵات‌و ئێستا که ده‌ستیان ئه‌ڕوات به‌رده‌وام خه‌ڵك تیرۆر ئه‌که‌ن‌و خانووبه‌ره تێك ئه‌ده‌ن‌و ئاگری فیتنه خۆش ئه‌که‌ن..

ئه‌وه‌بوو سه‌ربورده‌و سه‌رگوزشته‌ی یه‌هودی به‌نی قوره‌یزه که (عه‌لی میر فطروس) بۆیان ئه‌گری‌و ئه‌ڵێ شیعاری (لااكراه في الدين) هه‌ر قسه‌بوو، شیعارێكی درۆ بوو.. جێگه‌ی خۆیه‌تی ئه‌وه باس بكه‌ین ئه‌م ئایه‌ته له ڕووداوه‌كه‌ی (به‌نی نضیر)دا دابه‌زی‌و بوویه یاسایه‌ك بۆمامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵ (خاوه‌ن كتێبه‌كان)دا.

موفه‌سیره‌كان‌و نووسه‌رانی (سیره) ئه‌ڵێن: "عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌باس ئه‌ڵێ: ئافره‌تی وا هه‌بوو له‌ناو (ئه‌نصار)دا زۆر كه‌م منالی بۆ ئه‌ما، سوێندی ئه‌خوارد كه ئه‌گه‌ر خوا منالی بۆ بهێلێ، بیكاته یه‌هودی، كه ڕه‌و به (به‌نی نه‌زیر) كرا، ئه‌نصار هاتنه خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ‌و وتیان: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا، ئه‌ی كوڕه‌كانی ئێمه؟ خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی دابه‌زاند (لا اكراه في الدين)"[1].

(مه‌سروق) كه گه‌وره تابعییه كه ئه‌فه‌رموێ: موسڵمانێكی ئه‌نصاری له تایه‌فه‌ی (به‌نی سالمی كوڕی عه‌وف) دوو كوڕی هه‌بوو هه‌ردوكیان ببونه (نه‌صرانی) پێش ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری ئیسلام سروشتی بۆ بێت، وا ڕێكه‌وت له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵێك نه‌صرانیدا (پاش هاتنی ئیسلام) بۆ بازرگانی كردن هاتنه‌وه بۆ مه‌دینه، باوكیان چوو بۆلایان‌و هێناینیه‌وه بۆ ماله‌وه، جا پێی وتن: سوێند به‌خوا وازتان لێ ناهێنم تا موسڵمان نه‌بن، دوو كوڕه‌كه‌ش وتیان ئێمه نابینه موسڵمان: كێشه‌كه‌یان برده لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ كابرای ئه‌نصاری وتی: باشه ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا لێ بگه‌رێم ئه‌م جگه‌رگۆشانه‌م بچنه ئاگر؟ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌م ئایه‌ته‌ی بۆ خوێنده‌نه‌وه (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة: ٢٥٦) كابرا وازی لێهینان‌و خواحافیزی لێكردن[2].

جا ئیتر نازانم ئیتر ئه‌وه كه‌ی ویژدانه (میر فطروس)و (شوان. ع)و (سیامه‌كی بابه‌ك) ئه‌لێن ئه‌و شیعاره ناڕاستی ده‌ركه‌وت به‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌یده‌هێلا جگه له موسڵمان (بوون)ی هه‌بێت[3]. بۆ ئه‌وه‌ش ئه‌ڵێ: عه‌ره‌به موسڵمانه‌كان خۆشیان له هاوپێخه‌می ژنه مێردداره‌كان نه‌ئه‌پاراست، ئه‌وه له‌ڕاستییه‌وه دووره.. پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌فه‌موێ: (من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يسق ماءه زرع غيره)، هه‌روه‌ها ئه‌فه‌رموێ: (من كان يؤمن با لله واليوم الاخر، فلا يفضي على امرأة من السبي حتى يستبرئها)[4].

كه‌واته ئافره‌تان یان "دوگیان"ن یان "دوگیان" نین ئه‌وه حوكمی یه‌كه‌میان‌و ئه‌وه‌ش حوكمی دووه‌میان، ئیتر ئه‌و بوختانه گه‌وره‌یه به‌ڵگه‌ی چییه ئه‌گه‌ر (نه‌زانین) یان (به ئاره‌زوور) نه‌بێت!.

- (عه‌لی میر فطروس) به‌رده‌وام له‌سه‌ر (نه‌زانین)و (هه‌ر به ئاره‌زوو)ه‌كه‌ی خۆی به‌رده‌وام ئه‌ڵێ: كه قوره‌یش زانییان ئیسلام مه‌ترسی بۆ سه‌ر قازانج‌و به‌رژه‌وه‌ندییه چینایه‌تییه‌كانی ئه‌وان نییه، به‌بێ شه‌ڕ ئه‌ستۆكراته‌كانی مه‌ككه سه‌ریان بۆ سوپای پێغه‌مبه‌ر ﷺ دانه‌واندو ملیان كه‌چكردو.. بوونه موسڵمان، واپێده‌چێت هه‌ر به‌و

[1] مختصر تفسير الامام الطبري، ص ٥٦/ لأبي يحيى محمد بن صمادج التجيبي/ ١٩٩٨/ الندوة العالمية للشباب الاسلامي.

[2] اسباب النزول، الواحدي النسابوري، هامش مختصر تفسير الامام الطبري (ص٥٧).

[3] بۆ وه‌ڵامی زیاترو بۆ ئه‌وه‌ش بۆت ده‌ربكه‌وێ به درێژایی مێژووی ئیسلامی ئه‌و شیعاره ئیشی پێكراوه سه‌یری (ده‌وڵه‌تی خیلافه‌ت.. ل ٥٧ بۆ ٦٠) بكه.

[4] الروض الانف، شرح سيرة ابن هشام، السيهلي، (٤١/٤).

بۆنەیەوە بوو پێغەمبەر ڕووی موسڵمانەکانی لە (مسجد الاقصی)ەوە بەرەو (مسجد الحرام) گۆڕی.. بەنیازی بەدەستهێنانی پشتگیرییان و دابینکردنی قازانجی بازرگانی مەککە، بۆ بەرگری کردنیش لە مەترسی خراپبوونی بازاڕو نابودی ئابووری بازرگانەکانی مەککە حەجی بەسەر موسڵمانەکاندا سەپاند"[1].

ئەم دەقەی سەرەوە پڕیەتی لە نەزانین:

١. گۆڕینی "قیبلە" لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو نەك دوای "فەتحی مەککە" کە ئەمیان لە ساڵی هەشتی کۆچیدا بوو[2].

٢. هەروەها (حەج) لە ساڵی (٩)ی کۆچیدا فەرز کرا کە هەموو دوورگەی (عەرەبی) ملکەچییان بۆ ئیسلام دەربڕیو هیچ پێویست بەوە نەبووە (دان) بۆ خەڵکی دابکرێت تا ئیسلام قەبووڵ بکەن.

٣. ئەو شتانەش کە تۆ باسی ئەکەی (گۆڕینی قیبلە)و (فەرزکردنی حەج) ئەوانە کارو بڕیاری خوان نەك پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندە ئیشی هەیە کە ئەو ڕێنمایی و بڕیارو یاسایانەی خوای گەورە پێی ئەدات ئەو بیخوێنێتەوە بۆ خەڵك، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِين)، پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەندەی لەسەرە کە بەڕۆشنی ڕاگەیاندنی خۆی بکات.

٤. لەوەشدا هەر بەهەڵەدا چووە کە وائەزانێ (حەج) بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی ئابووری فەرزکراوە، فەلسەفەی فەرزبوونی (حەج) زۆر لەوە گەورەترە کە (میر فطروس) ئەیزانێ.. بازۆر بە کورتی ئاماژە بەو ئامانجانە بدەین کە (حەج)ی بۆ فەرز کراوە.

ئیسلام ئەیەوێت چ هەستی تاکەکەسی و چ هەستی کۆمەڵو چ هەستی ئەنتەرناسیۆنالستی ئوممەتی ئیسلام هەمیشە بە زیندوویی و هەستیاری بمێنێتەوە، بۆ پاراستنی یەکەمیان (نوێژ) بۆ دووەمیان (هەینی) بۆ سێیەمیان (حەج) دانراوە..

"حەج" کۆنگرەیەکی ساڵانەیە بۆ دەمەزەردکردنەوەی ئەو هەستانەو بۆ گۆڕینەوەی هیواو ئاواتی میللەتانی ئیسلام بە گشتی، "حەج" هەستی عەبدایەتی بۆ خوا زیندوو ڕائەگرێتو (ئینتما) بۆ ئوممەتی ئیسلامی بەرز ئەکاتەوە، زیاد لەمانەش ئەو هەمووە ئامانجە ڕۆحیانەی "حەج" کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (من حج فلم یرفث ولم یفسق رجع کیوم ولدته امه) متفق علیه[3].

جگە لەوەی (میر فطروس) نەزانین و ناحاڵی بوونی زۆری بە خەرجداوە هەندێ گزیو فێڵیشی لە خوێنەرەکانی کرووە، بۆ نموونە لە مەسەلەی فەرزکردنی حەجدا لەبەر هۆکاری ئابووری پەراوێزێکی داناوە ئەڵێ: "سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٩٧)و سورەتی (بقرة) ئایەتی (١٩٧و ١٩٨)و سورەتی (مائدة) ئایەتی دوو"، کە ئەگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتانە هیچیان نە باسی قیبلە گۆڕینیان کردووەو نە باسی هۆی ئابووری فەرزکردنی حەجیان کردووە، ئەو بەوپەراوێزە ئەیەوێ خوێنەر وا تێ بگات کە ئەو ئایەتانە پیشتیوانی قسەکەی ئەون، لە کاتێکدا وانییەو ئایەتەکان تەنیا باسی فەریزەی حەج ئەکەن نەك شتی تر.

. (عەلی میر فطروس) دیسان ئەڵێ: "هەموو دەستکەوتو غەنیمەتی شەڕی (هوزان) درا بە ئەو ئەرستۆکراتیانەو (أبوسوفیان) لەگەڵ هەردوو کوڕەکەیدا (واتە: مەعاویەو یەزید) هەریەکەیان سەد هوشترو چل کیلۆ زیویان

[1] ئیسلامناسی (ل٣٠).

[2] سەیری (حیاة محمد، هیکل، ص٢٣٧) و (الرحیق المختوم، ص١٩٤) بکە.

[3] ریاض الصالحین (ص٤٥٧) الامام النووي/ دار الكتاب العربي/ بیروت ـ لبنان/ ط ١٩٧٣/١.

بەرکەوت، ئەمە پاش ئەوەی یارمەتیی و سامان لە مەدینەوە بۆ (ابو سفیان) هەر دەنێررا"[1]. سەیری بێویژدانیی و دۆرو بوختانی ئەم دەقەی سەرەوە بکەن:

١. بۆسەرچاوەی ئەو زانیارییە (میر فطروس) ئەڵێ: "تأریخ طبري، ب٣، ل١٢٠١و ١٢٢٤، تأریخ یعقوبي، ب١، ل ٤٣٥، سیرة النبویة ابن هشام، ب١، ل ٧٩". کە ئەگەڕێیتەوە بۆ ئەم سەچاوانە سەیر ئەکەی هیچی وانییە.. جارێ زانیاری دابەشکردنی غەنیمەی (هوزان)و (ثقیف) لە بەرگی دووی تەبەریدایە نەك بەرگی سێ کە دوو چوکلەشی بۆ کردووە (٣) تاکەس نەزانێ ئەوە لەوانەیە (٢)ی فارسی بێت، لە بەرگی دووهەمیشدا تەبەری تەنیا ئەڵێ: (فأعطی أبوسفیان بن حرب مائة بعیر، وأعطي ابنه معاویة مائة بعیر)[2]. ئیتر نە باسی یەزیدی تێدایەو نە باسی چل کیلۆ زیوی تێدایە، دەی ئیتر ئەمە شورەیی نییە؟ هەروەها ئەوەی (ابن هشام)یش لە بەرگی (چوارەم)دایە نەك یەك و بەو شێوەیەش نییە کە (میر فطروس) ئەیڵێ، ئەویش تەنیا باسی (١٠٠) هوشتری مەعاویەو باوکی ئەکات، نە باسی یەزیدو نە باسی چل کیلۆ زیوی تێدا نییە[3].

٢. ئەڵێ یارمەتی هەر نێردراوە بۆ ئەبوسفیان لە مەدینەوە! کێ وتی؟ کوا سەرچاوە؟! کەی؟ ئایا پێش فەتحی مەککە یان دوای فەتح، یان دوای شەڕی هوزان و (ثقیف).. (میر فطروس) ئەیەوێ بڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەر پەیوەندی بەردوام بووە بە ئەبوسفیانەوە چ پێش پێغەمبەرایەتی، چ پاش پێغەمبەرایەتی، چ لە مەککەدا بووبی یان لە مەدینەدا، باشە ئەوە منداڵیش شتی وا ئەڵێ! باشە ئەبوسفیان چی نەکرد بۆ کوژانەوەی ئاینی ئیسلام و تیرۆرکردنی پێغەمبەر ﷺ و لەناوبردنی سەرو ماڵ و منداڵی موسڵمانەکان! بەڵام خوای گەورە سەری خستن و کوفرو بێ دینی ڕیسوا کردو ناچاری کردن ملکەچ بێت بۆ ئیسلام و ئەهلی ئیسلام، دەی ئیتر هاوکاری ناردنی چی؟!

. (میر فطروس) ئەڵێ: "حەزرەتی موحەممەد بە بنیاتنانی (ئۆلگاریشیەکی خێزانی) لە دەوڵەمەندترین ئەرستۆکراتەکانی مەککە توانی زەمینەیەکی ئابووری کۆمەڵایەتی بۆ دەسەڵاتێکی بەتواناو خاوەن ناوەندێکی ئیسلامی دابین بکات".

پاشان بە تەعبیری جوان و ناجوان ئەڵێ: ئەوەندە بەسە کە: "١. دەست بە سەراگرتنی هەموو سامانەکەی خەدیجە کە دەوڵەمەندترین ئەرستۆکراتەکانی مەککە بوو لەلایەن موحەممەدەوە زەمینەیەکی لەباری ئابووری دارایی بۆسەرهەڵدان و گەشەی باوەڕەکانی موحەممەد ئامادەکرد.. ٢. عائیشەی کچی ئەبوبەکری خواست و ئەبوبەکر کابرایەکی دەوڵەمەند بوو کە پاش ئەو خزمایەتییە هەموو توانا ئابووریی و کۆمەلایەتییەکانی نایە بەردەست موحەممەد لەبەر ئەو کارەش نازناوی (صدیق)ی لەلایەن پێغەمبەرەوە پێ بەخشراوە.. چەندین جار کرایە فەرماندەو.. پاش کۆچی دوایی موحەممەدیش بووە (خەلیفەی یەکەم).. ٣. عومەرو.. ٤. عوسمان و.. ٥. عەلی..٦. زوبەیری کوڕی عەوام.."[4].

دوای ئەم قسە ناڕاستانە لە بنچ و بنەواندا، وشەو ڕستەی ناشیرین دەربارەی هەریەك لەو کەسانە دەکات و.. شتی وا ئەڵێ لەقوتوی هیچ عەتارێکدا نییە، بۆنموونە ئەڵێ: "عومەر پێش مردنی موحەممەد، پێغەمبەری بەشێت و وڕێنەکەر لەقەڵەم دەداو لە پێغەمبەرێتی موحەممەد کەوتە گومانەوە بە شیوەیەك کە لەڕێککەوتنی (حدیبیە)دا گوتی: (ما شككت في نبوة محمد قط كشكي يوم الحديبية)"[5].

---

[1] ئیسلامناسی ل ٣٠ ـ ٣١.

[2] تأريخ الطبري (٥٥٨/٢) مؤسسة الاعلمي للمطبوعات/ بيروت/ لبنان/ الطبعة الاولى/ ١٩٩٨.

[3] سيرة ابن هشام/ دار أحياء التراث العربي/ بيروت/ لبنان/ بێ ساڵ و ژمارەی چاپ لەوردبینیی و لێکۆڵینەوەی هەرسێ زانا (مصطفى سقا)و (ابراهيم الابياري)و (عبدالحفيظ شلبي).

[4] ئیسلامناسی، ل (٣١، ٣٢، ٣٣، ٣٤).

[5] ئیسلامناسی، ل٣٣.

جا له پەراوێزدا بۆ سەرچاوە ئەم قسەیە ئەڵێ: "بڕوانە تأريخ طبري ل٣، ل١١٢٢)، دەربارەی عوسمانیش ئەڵێ: كە (ڕوقیە) ژنی عوسمان و كچی پێغەمبەر بوو، بەهۆی نەسازان و خراپی عوسمانەوە لەژێر قامچی عوسماندا گیانی دەردەچێت و دەكوژرێت، لە ڕاستیدا عوسمانیش بكوژی كچەكەی موحەممەد بووە"[1].

زۆر بێ عەقڵانەش ئەڵێ: "بەڵام پلەو شوێنی ئابوری و كۆمەڵایەتی عوسمان هەرگیز نەیدەهێشت كە ئەو مەسەلە لەبەرچاو بگیرێت تەنانەت موحەممەد كچی دووەمیشی واتە (ام كلثوم)ی پێدا"[2].

دەربارەی عەلی-یش بەدەم (ابن حزم)ەوە كە ئەو لەبەر ئەوەی نەزانە ئەڵێ (ابن خرم) ئەڵێ: ".. نكولی لەوە ناكرێ كە عەلی لە دەوڵەمەندترین كەسانی تیرەو هۆزەكەی خۆی بووەو خاوەنی موڵك و زەوییەكی یەكجار فراوان بووە"[3]... زیاتر لەوە بوختان ئەكات و ئەڵێ: "لە حەزرەتی (صادق)ەوە دەگێڕنەوە كە: ئەو ئەنگوستیلەیەی كە حەزرەتی عەلی لە كاتی نوێژدا بەخشیەوە، كێشی ئەڵقەكەی چوار مسقال زیوە، كێشی نقێمەكەشی پێنج مسقاڵ یاقوتی سوور بوو كە نرخەكەی خەراجی یەك ساڵی دەوڵەتی شام بوو"[4].

جا لە ڕاستیدا مرۆڤ نازانێ كوێی ئەم زانیارییانە ڕاست بكاتەوە، سەرچاوەكانی كە هیچی وایان نەوتووە، یان بنج و بناغەی زانیارییەكان كە نە لەمێژوودا شتی وا هاتووەو نە هیچ عەقڵێكیش ئەوە ئەبڕێ شتی وا ڕوویدا بێت.. باوەك مەحوی شاعیر ئەڵێ: (فەقەت كە نەبوو (دەركی كولل) یەكبارە نابێ (تەركی كولل) ئێمەش كە فریای ڕاستكردنەوەو پوچەڵكردنەوەی هەمووی ناكەوین با درۆ شاخدارەكانی هەڵنەوێرین:

١. جاری ئەڵێ: "دەستی گرت بەسەر سامانەكەی خەدیجەدا" ئەگەر مەبەستت لە (دەست بەسەرا گرتن) "موصادەرە"ی عەرەبییە ئەوە هیچی وانەبووەو كەس ماڵی خەدیجەی موصادەرە نەكردووە، ئەگەر مەبەستت لە دەستبەسەراگرتن، بەكارهێنان و سوودوەرگرتنە، ئەوە (خەدیجە) ژنی پێغەمبەری خوا بووەو بە دڵ و بە گیان خۆی و ماڵی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووەو كەسێكیش بە ئارەزووی خۆی و وەك كوردەواری ئەڵێ: (بە حوسن و ڕەزای خۆی) موڵك و سامانی سەرف بكات بۆ هەركەسێ كە خۆشی ئەوێ، بۆ ئەبێ ڕەخنەی لێ بگیرێ و ناوبنرێ دەستبەسەراگرتن؟ زیاد لەمەش ئەرێ ئەوە ئەو دەوڵەمەندییەی خەدیجە تاكوێ و تاكەی بڕی كرد؟ باشە خۆ لە (ساڵی خەمباری = عام الحزن)دا موسڵمانەكان بە خەدیجەشەوە لە شیوەكانی ئەبوتالیبدا لە ژێر ئابڵوقەدا بوون و كەسیان نانێك وانەبوو بیخۆن، ئیتر ئەم سەروەت و سامانەی خەدیجە لەكوێ بوو[5]؟

ئەم ماركسیانە زۆر سەیرن، چونكە خۆیان بەبێ (بەرانبەر) نانێك نادەن بەدەم هەژارێكەوە لە ئەوان وایە هەموو كەس وەك ئەوان وایسە، تەنیا بەرژەوەندی ئابووری ئەیجوڵێنێ و هەر لەبەرپارەو پوول سڵاو لەم ئەكات و دەنگ لەو دائەبڕێت!!

٢. نازناوی (صدیق) لەبەر ئەوە درا بە (ئەبوبەكر)، چونكە لە مەككەدا كاتێك پێغەمبەر ﷺ شەوڕەوی پێ كرا بۆ (بیت المقدس)و (میعراج) بۆ ئاسمان و هات باسی ئەمەی كرد لەناو خەڵكدا، موشریكەكان هاتنە لای ئەبوبەكرد و وتیان: ئەرێ هاوەڵەكەت ئەڵێ: ئەمشەو چووە قودس و هەر ئەمشەویش هاتووەتەوە ڕای تۆ چۆنە؟ ئەبوبەكر وتی: ئێوە درۆی بەدەمەوە ئەكەن؟ وتیان: بەڵێ خۆی وائەڵێ و ئەوەتا لە مزگەوتدا بۆ خەڵكی دەگێڕێتەوە. ئەبوبەكر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خۆی وتیبێتی ئەوە ڕاستی وتووە، جا ئەوە چییە ئێوە سەرتان لێی سوڕماوە!

---

[1] ئیسلامناسی، ل٣٣.

[2] ئیسلامناسی، ل٣٣.

[3] ئیسلامناسی، ل٣٤.

[4] ئیسلامناسی، ل٣٤.

[5] مەزدەكی لە (عەرەب و ئیسلامدا)و (جیراڵدین بروكس و نوری كەریم) لە (كچانی خوادا) . سبحانە وتعالی. بێ نەزاكەتانە ئەڵێن: خەدیجە نانی موحەممەدی ئەدا!!

من هەموو جارێ هەواڵی ئاسمانم بۆ ئەگێڕێتەوەو بڕوای پێ ئەکەم جا خۆ ئەوە زیاتر جێگەی سەرسوڕمانە.. ئیبن هیشام ئەڵێ: پاشان ئەبوبەکر چوو بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی باسی درێژەی شەوڕەوییەکەی بۆ بکات.. جا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی هەر شوێنێکی لە (بيت المقدس) ئەکرد بۆ ئەبوبەکر، ئەبوبەکر ئەیوت: (صدقت، أشهد انك رسول الله)، کە پێغەمبەر ﷺ لە قسەکانی بوویەوە فەرمووی بە ئەبوبەکر: (وأنت يا أبابكر الصديق) ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەبوبەکر ناونرا (الصديق)[1]، ئیتر (میر فطروس)ئەم زانیارییە ناڕاستەی خۆی لەکوێ هێنا؟ ئەڵێ: لەبەر دەوڵەمەندیو پارەداری پێغەمبەر ناوی نا (الصديق)[*]!!.

٣. ئایا حەزرەتی عومەر پێغەمبەری بە شێت و وڕێنەکەر لە قەڵەم داوە یان وتوویەتی گومانم لە پێغەمبەرێتیی هەیە؟ (میر فطروس) بەڵگە بەوە دێنێتەوە گوایە (حەزرەتی عومەر) بە صوڵحی حودەیبییە ڕازی نەبووەو موناقەشەی زۆری کردووە لەگەڵ پێغەمبەردا کەواتە (عومەر) گومانی لە پێغەمبەرێتیی موحەممەد ﷺ هەبووە.

* پێش هەموو شتێ با ئەوە بڵێم کە ئەم (زانیارییە ناڕاستە) لە زۆربەی کتێبەکانی (شیعە مەزهەبەکان)دا باس ئەکرێ، (شیعەش) بە گشتی نە بڕوایان بە ئەبوبەکر هەیەو نە بڕوایان بە عومەر هەیەو نە بڕوایان بە تەواوی ئەصحابەکانیش هەیە، نەك هەر ئەوە بەڵکو بڕوایان بە شتێك نییە پێی بوترێ "مێژووی ئیسلامی!!"، ئەوان مێژووی ئیسلامی بە مێژووی کۆمەڵێك مرۆڤی داگیرکەر ئەزانن کە "خیلافەت"یان لە حەزرەتی (عەلی)دا گیرکردووەو نەیانهێڵاوە دوای پێغەمبەر ﷺ ئەو ببێتە خەلیفە.. هەموو شیعە توندڕەوەکان، تەنیا بڕوایان بە (دوانزە نەفەر) هەیە لە مێژوووداو ئەوی تری لای ئەوان نەموسڵمان بووەو نە دۆست بە ئیسلامیش بووە، بە ئەبوبەکردو عومەرو عوسمانو تەواوی صەحابەکانیشەوە.. جا کەواتە چۆن ئەکرێت نوسینی شیعە مەزهەبەکان بکرێتە سەرچاوە بۆسەلماندنی هەر مەسەلەیەکی مێژوویی لە مێژووی ئیسلامیدا؟ ئایا ئەکرێت بۆ نموونە لە سەرچاوەی بەعسییەکانەوە نرخو بەهای شۆڕشی کوردد وەربگیرێ، یان درێژەی ڕووداوەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد وەربگیرێ؟ ئایا ڕاستە پشت بە نووسینی وڵاتانی داگیرکەر ببەسترێت بۆ ڕاستکردنەوە ڕێژەی ئەو وێرانکارییو داگیرکارییو کوشتو بڕەی کە ئیمپریالیزم کردوویەتی لە وڵاتانی داگیرکراودا.

بۆ نموونە پشت بە نووسینی داگیرکەری ئیتالیا ببەسترێت بۆ زانینی ئێشو ئازادی گەلی لیبیا، یان پشت بە ئەرشیفی فەرەنسا ببەسترێت بۆ ناساندنی میللەتی جەزائیر.. وە هەروەها.. ئایا ئەکرێ (دادوەر)و (دەعواچی) هەردوکیان هەریەك کەسو یەك لایەن بن؟

جا ئەمەی (میر فطروس)یش هەروایە! لە سەرچاوەی شیعە مەزهەبەوە ئەگوازێتەوە (عومەر) گومانی لە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ هەبووە، یان (عومەر) پێغەمبەری بە شێت زانیوە!!

* دوای ئەم بەراییە با زانیارییە ناڕاستەکە ڕاست بکەینەوە:

لەلای عومەرو لەلای هەموو ئەصحاب ئەوە ڕۆشن بووە کە پێغەمبەر دوو جۆر (قسە)و (کردەوە)ی هەبووە:

یەکەمیان: ئەو قسەو کردەوانەی کە خوا بۆی دیاری کردووەو (وەحی) بووە.

دووەمیان: ئەو قسەو کردەوانەی کە بیروڕای خۆی بوونو (اجتهاد)ی شەخصی بووە.

پێغەمبەریش ﷺ هاوەڵانی لەمە حاڵی کردووەو فێری کردوون لە بواری یەکەمدا ملکەچو ڕازی بن و لە بواری دووهەمدا بیروڕای خۆیان نەشارنەوەو بیڵێین.

بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەرشتێك زانیبێتیان ئەوە (وەحی)یە بەبێ هیچ مەرجو موناقەشەیەك تەسلیمی ئەبوونو کاریان پێ ئەکرد.. خۆ ئەگەر شتێکیش سەیریان کردبێ (اجتهاد)ی پێغەمبەر ﷺ هی خۆیەتیو ئەوان

---

[1] سیره ابن هیشام (٢/٤٠).

* مەزدەکی بێنەزاکانەتر لە (عەرەبو ئیسلام)دا ئەڵێ، بۆیە پێی وتراوە (صدیق)، چونکە خۆش باوەڕبوو، نەك ڕاستگۆ!! جا توخوا پیاوی خۆشباوەڕو سادە ئەو کارە گەورانەی پێ ئەکرێ کە ئەبوبەکر لە مێژوودا کردنی؟!

بارێکی تریان بەخێرو بەرژەوەندی زانیبێ ئەوە موناقەشەیان کردووەو بیروڕای خۆیان بە ئازادی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وتووەو موناقەشەی (لایەنی چاکەو) لایەنی (خراپە)ی ئیشەکەیان کردووە، لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ مەسەلەی دیاری کردنی شوێنی شەڕی (بدر)و مامەڵە لەگەڵ ئەسیرەکانداو نووسینی ئاشتینامەیەك لە نێوان پێغەمبەرو (غطفان)دا لە شەڕی (ئەحزاب)و (بڕگەکانی ئاشتینامەی حودەیبییە) لە شەڕی (حودەیبیە)داچوار مەسەلەی گەورەن کە پەیوەندن بەم باسەی ئێمەوە..

لە (بەدر)دا هاوەڵان پرسییان (قوربان ئەم شوێنەی جەنابت هەڵت بژاردووە ببێتە مەیدانی شەڕەکە، خوا بۆی دیاری کردووی کە بۆ ئێمە نییە پێش‌و پاشی پێ بکەین یان بیروڕای خۆتەو وای بە باش ئەزانی؟ فەرمووی: بیروڕای خۆمەو وای بە باش ئەزانم، (خەباب) کە هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ بوو وتی: دەی قوربان بچینە فلانە شوێن لێرە زۆر باشترەو ستراتیژی ترە.. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بە گوێی کرد)[1]، بۆ ئەوەی (غطفان)یش ئێمە لە پێشەوە لە باسی فرمێسك ڕشتنەکەی (میر فطروس)دا بۆ (بەنی قورەیزە)دا باسمان کرد هەردوو سەعدەکەی مەدینە عەرزی پێغەمبەریان کرد، قوربان: ئەمە پێشنیارو ڕای جەنابتەو حەزئەکەی ئێمەش ڕامان لەسەری بێ، یان شتێکە خوا بۆی داناوی‌و فەرمانی پێکردووی، یان شتێکە لەبەر خاتری ئێمە ئەیکەی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بل شيء أصنعه لكم..)، ئەوەبوو کە هەردوو سەعدەکە بە "ئازادی"و "ئازایی" کە ئیسلام فێری کردبوون بیروڕای خۆیان وت، کە پێچەوانەی بیروڕاو (اجتهاد)ەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، پێغەمبەریش ڕایەکەی ئەوانی پەسەند کردوو وازی لە ڕایەکەی خۆی هێنا.. ئەوەی هەردوو سەعدەکە سێ لقی تێدابوو:

١. ئایا وەحییە؟

٢. ئایا ڕایەکە هی پێغەمبەرە ﷺو ئەو حەزئەکات‌و پێی خۆشە ئەمانیش وابکەن؟

٣. یان (اجتهاد)ێکە قابیلی ئەوەیە ڕاگۆڕینەوەی لەسەر بکرێت.

هەردوو سەعدەکە ئامادەبوون لە گریمانی یەکەم‌و دووەمدا هیچ قسەیەك نەکەن، ئەوە نەبێ تەسلیم بین‌و جێبەجێی بکەن، یەکەمیان لەبەر خاتری خوای گەورەو دووهەمیان لەبەر خاتری پێغەمبەر ﷺ، بەڵام کە زانییان ئەوە ڕایەکی شەخصی پێغەمبەر ﷺو پێغەمبەریش ﷺ پێی خۆشەو پێی باشەئەوانیش ڕای خۆیان بڵێن، ئەوەبوو ڕایەکەی خۆیان وت‌و ئەوەی ئەوانیش کاری پێکرا، بۆ ئەوەی حودەیبییەش هەر بەو شێوەیەبوو سەرەتا چ حەزرەتی عومەر چ جگە لەویش وایان ئەزانی کە ئەم صوڵکردنە ڕاو بۆچوونی شەخصی پێغەمبەرە ﷺ بۆیە هەقیان بەخۆیان دا موناقەشەی سەرەتاو بڕگەکانی ئاشتینامەکە بکەن، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕوون کردنەوە کە ئەمە بڕیارو هەڵبژاردنی خوایە بۆ پێغەمبەر ﷺ هەموو بێدەنگ بوون.. موحەممەد عەبدولقادر ئەبوفارس لە کتێبی (النظام السياسي في الاسلام . ص٥٣)دا ئەڵێ: ".. کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (من پێغەمبەری خوام‌و لە فەرمانی ئەو لانادەم) هاوەڵان تەسلیمی مەسەلەکە بوون"[2]. جا ئیتر نازانم (میر فطروس) چی ئەوێ لە حەزرەتی عومەر؟ شەڕی چی پێ ئەفرۆشێ؟ دلخی چی لە دڵدایە بۆی؟ ئاخر خۆ عومەر کە سوپای فتوحاتی نارد بۆ ئێران لەبەر ئەوەبوو کە هێزی ساسانییەکانی ئەوکاتە هێزێکی ستەمکارو میللەت خۆر بوون، تەنانەت نەیانئەتوانی دان بە مافی میللەتێکی گەورەی وەك میللەتی کورددا بنێن، گاڵتەشیان بە میللەتێکی تری گەورەی وەك (عەرەب) ئەهات، بەردەوامیش لەشەڕدابوون لەگەڵ (ڕۆم)دا خەیاڵی (ئیمپراتۆرێتییان) سنووری نەبوو، (ابن كثير) لە (البداية والنهاية ٧/٤٠)دا ئەڵێ: "یەزدەجەرد کە پاشای فارسەکان بوو لەکاتی خەلیفە عومەردا بە نوێنەری موسڵمانانی وت: (من لەم زەوییە فراوانەدا هیچ میللەتێکم نەبینیوە لە ئێوەی عەرەب سەر لێشێواوتر بێت، ئێوە لە هەموو کەس کەمترن‌و لە هەموو کەس خۆخۆرترن، کاتی خۆی هەر بە لادێیەکانی خۆتان سەرمان ئەکوتینەوەو نە ئێمە بیرمان لە

[1] بۆ زیاتر ئاگاداری لەم باسە سەیری هەر کتێبکی (سیرە) بکەی تێیدایە، بۆ نموونە سەیری (سيرة ابن هشام) (٢٧٢/٢) بکە.

[2] النظام السياسي في الأسلام/ محمد عبدالقادر ابو فارس/ ص ٥٣.

پەلاماری ئێوە ئەکردەوەو نە ئێوەش نیازی پەلاماردانی ئێمەتان هەبوو، جا ئەگەر ئێستاش وا ئەزانن شتێك زیادتان کردووە، ئەوە لە خۆبایی مەبن، ئەگەر قاتو قڕیش تەنگی پێ هەڵچنیون ئەوە شتێ خواردنتان بۆ دابین ئەکەین، تا پیتو بەرەکەت ڕووتان تێ ئەکات، پاشایەکیشتان بۆ دائەنێین کە نەرم بێت لە گەڵتانداو باش بێت بۆتان"[1].

(میر فطروس) بۆ سەرچاوەکەش کە ئەو زانیارییە هەڵەیەی لێ وەرگرتووە نووسیویەتی (تأریخ طبري: ب ٣/ ل١١٢٢)، کە گەڕامەوە بۆ (تأريخ طبري) سەیر ئەکەم هیچی وای تێدا نییە!! جاری ئەو ڕووداوە لەبەرگی دووهەم لاپەڕە (٤٦٩)دایە نەك (بەرگی سێ)، پاشان یەك وشە چییە لەو دێڕە عەرەبییەی ئەو هێناویەتی کە دەڵێ: عومەر وتی: (وما شككت في نبوة محمد قط كشكي يوم الحديبية) لە (تأريخ طبري)دا نییە[2]، ئیتر نازانم چۆن خەجاڵەتی ناکێشی!! لەوە ناترسێ خوێنەرانی کیتێبەکەی لەوەودوا ئیتر متمانەیان نەمێنێ بە نووسینەکانی؟ ئاخر ئەوە جارو دووجار دەجاریش نییە، ئاوەها بوختان بکاتو زیادە بە قسەی مێژوونووسانەوە بنێو تەزویر بکات.

* بێ شەرمانەش ئەڵێ: "عوسمان ڕوقیەی ژنی خۆی کچی پێغەمبەری لەژێر قامچیدا کوشت، کەچی پێغەمبەر ﷺ لەبەر پارەو پوول نەك هەر چاوپۆشی لێکرد بەڵکو کچی دووهەمیشی دایە"، ئاخر خوا بتگرێ، هیچ بێ غیرەتێك هەیە لە دونیادا بگاتە ئەو ئاستە کە یەکێك کچەکەی لە ژێر داردا بکوژێ کەچی ئەوەندە نەفس نزمو دنیاپەرست بێ لەبەر پارەو سەروەتو سامانی لە کابرای بکوژ ببورێتو گوێ بەو غەدرە گەورەیە نەداتو کچێکی تریشی بداتێ؟! هیچ کەسێك ئەوە قەبووڵ ئەکات نەخوازەڵڵا پێغەمبەر ﷺ؟ ئاخر پێغەمبەر ﷺ کەی دونیای ویستووە؟ خۆ قورەیش ئامادەبوون هەموو سەروەتو سامانی خۆیانی بدەنێ کچیشی نەکوژن، ئاخر خۆ تۆ ئەڵێی پێغەمبەر پیاوێکی زاناو بیرتیژو هۆشیارو ئەوەو ئەوە بووە، باشە هیچ گێلو داماوێك هەیە لە دنیا غیرەتی شتی وا قبوڵ بکات؟ چ جای پێغەمبەر ﷺ؟! دیارە ئەو شتە بوختانو درۆی شاخدارەو ئەوەشی ئەوە بڵی تۆزقاڵێك دینو ویژدانو عەقڵ چییە نییەتی.

* (میر فطروس) بۆ سەرچاوەی ئەم بوختانەی ئەڵێ: (متخب التواریخ اصاب محمد هاشم خراسانی . ل ٢٤ . ٢٥)، من ئەو سەرچاوەیەم دەست نەکەوت تابزانم ئەو (خوراسانییە) وای وتووە، یان ئەم درۆی بەدەم ئەویشەوە کردووە، وەك درۆی بەدەم (طبري)و (ابن هشام)ەوە کردووە.

بەهەرحاڵ هیچ عەقڵێك قبوڵی ئەوە ناکات پێغەمبەر ﷺ لەو ئاستەدا بووبێت شتی وا قەبووڵ بکات.. نەك هەروا نەبووە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ بەرانبەر عوسمان زۆر بەڕێز بووەو هۆکەشی ئەوەبوو کە عوسمان پیاوێکی شەریفو بەدینو بەشەرمی وابووە، پێغەمبەر ﷺ بە شانازییەوە ژنو ژنخوازی لەگەڵدا کردووە، نووسەرانی (سیرە) لەوانە چەند سەرچاوەی (شیعەکان) باسی گەورەیی عوسمان ئەکەن، بۆ نموونە (میرزا محمد تقی) لە (ناسخ التواریخ)دا ئەڵێ: "عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: (رحم الله أبا عمر و (عثمان بن عفان)، كان والله أكرم الحفدة وافضل البررة، هجادا بالاسحار، كثير الدموع عند ذكر النار، نهاضا عند كل مكرمة، سباقا الى كل منحة، حبيبا، ابيا وفيا، صاحب جيش العسرة، ختن رسول الله ﷺ)[3]، (عەلی)یش لە (نهج البلاغة)داو لەو کاتەدا کە ئاژاوەچییەکان هاتنە مەدینە بەناوی گلەییو گازندەوە، (عەلی) ئەچێتە لای عوسمانو پێی ئەڵێ: (ان الناس ورائي وقد استفسروني بينك وبينهم، ووالله ما أدري ماأقول لك، ما أعرف شيئا تجهله ولا ادلك على امر لاتعرفه انك لتعلم مانعلم، ما سبقناك الي

[1] البداية والنهاية (٢/ ٤٠).

[2] زۆر سەیرە هەر زیادە فریودانی خوێنەر دەقەکەشی بە (عەرەبی) نووسیوە بۆ ئەوەی ختوکەی عەقڵی خوێنەر بداتو حاڵی بکات کە ئەو قسەیە وتراوەو کراوە!!

[3] الشيعة وأهل البيت (احسان الهی ظهير) ص١٣٩، الناشر ادارة ترجى السنة لاهور باکستان/ مطبعة جاويدان/ ١٩٨٢.

شيء فنخبرك عنه ولا خلونا بشيء فنبلغكه، وقد رايت كما راينا وسمعت كما سمعنا، وصحبت رسول الله كما صحبنا وما ابن ابي قحافة ولا ابن الخطاب باولى بالعمل منك.. وأنت اقرب الى رسول الله ﷺ وشيجة رحم منهما، وقد نلت من صهره مالم ينالا فالله فالله في نفسك فانك والله ماتبصر من عمى ولا تعلم من جهل"[1].

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (فریشتەکانی ئاسمان شەرم لە عوسمان ئەکەن، وەکو چۆن شەرم ئەکەن لەخواو لە پێغەمبەری خوا ﷺ)[2].

(ئەگەر کچی ترم ببوایە دوای دوو کچ دیسان مارەم ئەکرد لە عوسمان)[3]، هەروەها ئەفەرموێ: (خوا فەرمانی پێ کردووم کەیەك لەدوای یەك ئەو دوو کچەم مارە بکەم لە عوسمان)[4].

پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی چەند چاکەی گەورە گەورەی لە عوسمان بینی فەرمووی: (خوایە، عوسمان لە بیرنەکەی، عوسمان دوای ئەمانە ئیتر هیچیش نەکات زیانی لێ ناکەوێ)[5].

تەنانەت (کولەینی) کە گەورە ((محدث))ی شیعە مەزهەبەکانە) لە (الكافي)دا کە بەرزترین سەرچاوەی شیعەکانە، ئەڵێ: بە زمانی (ئیمامی صادق)ەوە کە فەرموویەتی: "ينادي مناد من السماء اول النهار الا ان عليا صلوات الله عليه وشيعته هم الفائزون، قال: و يناد مناد آخر النهار الا أن عثمان وشيعته هم الفائزون"[6].

کە عوسمان کۆچی کرد بۆ حەبەشە لەگەڵ ڕوقیەی خێزانیدا، ماوەیەك هەواڵیان نەبوون پێغەمبەر ﷺ زۆر بێتاقەت بوو تا ڕۆژێکیان ئافرەتێکی قورەیشی هاتە لای پێغەمبەر ﷺو وتی: محمد ئەمڕۆ زاواکەتم بینی لەگەڵ ژنەکەیدا لە ڕیگا، پێغەمبەر فەرمووی ئێ، حاڵیان چۆن بوو؟ ئافرەتەکە وتی: خێزانی سواری کەرێکی لات کردبوو خۆشی جڵەوی کەرەکەی ڕائەکێشا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صحبهما الله، ان عثمان اول من هاجر بأهله بعد لوط عليه السلام)[7]. خوا هاوەڵێتییان بکات، عوسمان یەکەم کەسێکە پاش (لوط) پێغەمبەر بە ماڵو منداڵەوە لەبەر خوا کۆچیان کردبێت.

جارێکیان لەسەر بێگوێیەك گوێی کۆیلەیەکی خۆی ڕاکێشا، زۆری نەبرد فەرمووی بە کۆیلەکەی وەرە تۆش گوێچکەی من ڕاکێشەرەوە با هەق بە هەق بێت، کۆیلەکە بەناچاریو تەریقییەکەوە گوێچکەی حەزرەتی عوسمانی ڕاکێشا! عوسمان فەرمووی: توند ڕایکێشە، چەند خۆشە هەر لە دونیا حەق بەحەقی خۆت بکەیت نەکەوێتە ئاخیرەت[8].

نەك هەر ئەمە بەڵکو لە ژیاننامەی عوسماندا باس ئەکرێت کە هیچ ژنو مێردێك وەك عوسمانو ڕوقیە کامەران نەبوون.. (قاضي ابن العربي) لە (العواصم من القواصم)دا ئەڵێ: (ئوسامەی کوڕی زید ئەڵێ: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ مەنجەڵێك گۆشتی تێدابوو پێیدا ناردم بۆ عوسمان، منیش کە ڕۆیشتمە ژوورەوە سەیرم کرد لەگەڵ ڕوقیەی خێزانیدا دانیشتوون، هیچ ژنو مێردێکی لەوان چاکترم نەبینبووە.. کە گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

---

[1] نهج البلاغة، تحقيق صبحي صالح، ص ٢٣٤.

[2] حياة الصحابة (٥٤٢/٢).

[3] منهاج السنه النبويه (١٤٥/٢)، العواصم من القواصم، ص٣٤.

[4] ئاجوری بە سەندی خۆی ئەیگێڕێتەوە (العواصم، ص٣٣) پەراوێزی (الشيعة وأهل البيت: ص١٤٧).

[5] حياة الصحابة (١٥٢/٢).

[6] الكافي في الفروع (٢٠٩/٨).

[7] حياة الصحابة (٣٣٠/١).

[8] هەمان سەرچاوە (٩٥/٢).

**چویته لایان؟ عەرزم کرد بەڵێ، فەرمووی: ژنو مێردی لەوان چاکترت تا ئێستا بینیوە؟ وتم: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا)[1].**

**ئیتر شورەیی نییە (میر فطروس) یان (شوان. ع) یان سیامەکی بابەك بڵێ: (مێژوونووسە ئیسلامییەکان پێی لەسەرە ئەوە دائەگرن کە عوسمان بکوژی (رقیە)یە! یان بڵێ لەڕاستیدا عوسمانیش بکوژی کچەکەی موحەممەد بووە!!)**

*** بۆ ئەوەش کە (عەلی) بە یەکێ لە دەوڵەمەندو ئەرستۆکراتەکانی مەککە دائەنێو ئەڵێ: گوایە پێغەمبەر (دەسەڵاتی بنەماڵە)ی پێ دروست کردن، ئەوە لەوانەی پێشوو پووچ ترن، جاری مێژوو ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبەر منالزۆریو هەژاریی (ئەبو تالیب) لەگەل عەباسی مامەیدا (دیارە لە مەککەو پێش پێغەمبەرایەتی) ڕێککەوتن هەریەکەیان منالێك بهێننە لای خۆیانو ئەرکێك لەسەر (ئەبو تالیب) هەڵبگرن، پێغەمبەر ﷺ عەلی گرتە خۆیو عەباسیش جەعفەری گرتە خۆی، ئیتر کام دەوڵەمەندی عەلی؟ دوای ئەوەش کە موحەممەد بوویە پێغەمبەر ﷺ، عەلی هەر لای ئەو مایەوەو تا کۆچیشیان کرد بۆ مەدینە هەر لا ی ئەوبوو، لە مەدینەش عەلی نیازی ژنهێناذی کرد (بە هاندانی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو سەعدی کوڕی موعاز بەتایبەتی)، ئەوەندەی پارە نەبوو بیداتە مارەییو جیهازیی فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ وەك سەرچاوەکانی مێژوو ئەیڵێن تەنانەت سەرچاوەی شیعە مەزهەبەکانیش، عوسمانی کوڕی عەففان هاوکاری کرد لەگەل ئەبوبەکرو عومەرو سەعددا کارەکەیان بۆ ڕێکخست[2]. ئیتر نازانم ئەوە یانی چی کە (میر فطروس) ئەڵێ: موحەممەد ئۆلیگاریشییەکی خێزانی لە ئەرستۆکراتەکانی مەککە دروست کرد.. لەوانە باسی عەلی ئەکات!!**

**بۆ شایەتی ئەم درۆیەشی قسەیەکی (ابن حزم) ئەکات کە نا وەکەی نازانێو دەڵێ: (ابن خرم) گوایە وتوویەتی (نکولی لەوە ناکرێ کە عەلی لە دەوڵەمەندترین کەسانی تیرەکەی خۆی بووە)، ڕاستە (ابن حزم) شتێکی وا دەربارەی عەلی ئەڵێ، بەڵام نەك لە مەککەدا نەك لە مەدینەشدا، بەڵکو باسی کاتی مردنی حەزرەتی عەلی ئەکات لە کوفەدا کە کاتێك مرد چی لێ جێما، دەی باشە ئەوە گزی کردن نییە لە خوێنەرو پیرو لاوی کورد؟! باسی مەککە بکەیو ڕووداوی پاش چل پەنجا ساڵی لەوەو دوا بکەی بە بەڵگە بۆی.**

**باسی موستیلەکەی عەلی ئەکات کە لە نوێژدا بە خشیوەتیو ئەڵێ تەنها نرخی نقێمەکەی هاوتای خەراجی یەك ساڵی دەوڵەتی شام بوو!! ئاخر ئەبێ ئەو موستیلەیە چەند گەورە بووبێ، باشە خۆ ئەگەر نەك نقێمەکەی بەڵکو موستیلەکە هەموویو بە پەنجەی عەلی خۆشیەوە لە ئاڵتونی عەیارە (هەزار)یش بێ ناگاتە ئەو نرخەی جێگەی بووەتەوە لە عەقڵی ئەودا؟! ئەمە جگە لەوەی زانایانی فەرموودە ئەم ڕووداوە هەر لە بناغەوە بە هەڵبەستراو ئەزانن[3].**

---

[1] العواصم من القواصم/ ابن العربي/ دارالثقافة، بێ مێژووی چاپو ژمارەی چاپ.

[2] بۆ ئەم ژنهێنانە با سەیری بۆ نمونە کتێبی (الشیعة وأهل البیت) احسان الهي ظهیر بکرێ، ل ٧٣ . ٧٦.

[3] ئیبن تەیمییە ئەڵێ: هەندێ درۆزن فەرموودەیەکیان هەڵبەستووە گوایە ئەم ئایەتە (إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ) (المائدة: ٥٥). دەربارەی عەلی هاتووە کە لە نوێژدا موستیلەکەی دەستی بەخشیوە.. جا ئیبن تەیمییە ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە بە ئیجماعی هەموو زانایان بە فەرمودە، درۆیەکی ئاشکرایە لە زۆر ڕووەوە:

١. صیغەی (الذین) صیغەی کۆیە، (عەلی)یش تاکە.

٢. (واو) لە ئایەتەکەدا (واوی حالیە) نییە، ئەگینا دروست نەبوو پشتیوانی لە هیچ موسڵمانێك بکرێ ئەوانە نەبێ کە لە نوێژداو لە ڕوکوعدا زەکات ئەدەن کە هەموو (صحابە)و (قرابە)ی لێدەرچێ.

٣. عەلی زەکاتی لەسەر فەرز نەبووە، لەکاتی پێغەمبەردا ﷺ.

٤. دانی جگە لە موستیلە لە جیاتی زەکات باشترە لە موستیلە.

ئەم ڕقبوونەی (میر فطروس) لە دین و لە خەڵکی پارەدار جگە لەگریی دەروونی چییترە؟ زۆر سەیرە هەندێ کەس کە دەوڵەمەند ئەبێ لە خۆڕایی ڕق لە خوار خۆی هەڵدەگرێ و بە سووک سەیریان ئەکات، هەندێ کەسیش هەیە کە هەژار ئەکەوێ لە خۆڕایی ڕق لەسەروو خۆی هەڵدەگرێ و بە سووک سەیریان ئەکات.

* هەروەها لە لاپەڕە (٣٠)دا دەربارەی عەلی ئەڵێ: "عەلی پاش ناکۆکی و ململانێیەکی زۆر بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و خەلافەت، پاش عوسمان بووە خەلیفەی چوارەم، جا پەراوێزێکی نادروست و داپۆشراو بە بوختان ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: .. حەزرەتی عەلی بە دادپەروەرێکی گەورەو مەزن بەناوبانگەو ئەو کە خۆی لە کوشتنەوەی بکوژانی عوسمان لادا، بەو بیانووەی کە ناکرێ چەند کەس لە بری تاقە کەسێك بکوژرێن، کەچی دەرهەق بە بکوژانی دۆستەکەی خۆی (عەبدوڵلای بن خباب) توندوتیژییەکی وای نواند کە وێنەی نەبوو". ئەم دەقە لەسەرەوە بۆ خوارەوە تەنیا ئەوەی وایە کە (ابن حزم) باسێکی لەو جۆرەی کردووە، بەڵام نەك بەو شێوەیەی ئەو بەڵکو لە ڕاستیدا بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەوەوە، فەرموون خوێنەرانی بەڕێز تەزوویرو درۆو بوختانەکانی (میر فطروس) ببینن.

١. عەلی ململانێی بۆ بەدەستهێنانی خیلافەت (نەك خەلافەت وەك ئەو ئەڵێ!)، نەکردووەو هەرکەسیش وابڵێ درۆ بەدەم ئیمامی عەلی-یەوە ئەکات، ئەوەتا عەلی خۆی و لە پیرۆزرتین کتێبدا لای شیعەکان کە (نهج البلاغة)یە ئەفەرموێ: "دعوني والتمسوا غيري.. فأنا لكم وزيرا خير لكم مني أميرا"[1].

واتە: لێم بگەڕێن و بڕۆن کەسێکی تر بکەن بە خەلیفە جگە لە من، چونکە من وەزیر بم بۆتان باشترە لەوەی ئەمیرو خەلیفەتان بم.. باشە ئیتر کوا ململانەو شەڕی خیلافەت و سەرۆکایەتی؟! خۆ ئەوەتا بە ئاسانی و بە مەمنونی لەسەر سینییەك (خیلافەت)ی ئەهێننە بەردەم و ئەو ئەڵێ: بڕۆن جگە لە من بکەن بە خەلیفەی خۆتان و با من وەزیری ئەو خەلیفەیە بم باشترە لەوەی کە خەلیفە بم، لەوانەیە یەکێك بپرسێ بۆچی و هۆی چی بووە عەلی لە (خیلافەت) خۆی لاداوە؟ لەوەڵامدا ئەڵێین: خوا باشتریش ئەزانێ، هۆکەی ئەوەبووە کە عەلی خۆی خۆیی باشتر ناسیوە لە خەڵکی، زانیویەتی کاروباری خیلافەت زۆر لەوە گەورەترە خەڵك ئەیزانێ، زیاد لەمەش ئەو ئەزمونێکی دوورو درێژی کاری وەزارەتی لا کۆبووەتەوە لە خزمەت (ئەبوبەکر)و (عومەر)و (عوسمان)داو لە خەڵك باشتر ئەیزانی کە سروشت و بیروڕاکانی بە (وەزارەت) باشتر ئەخوا تا بە (خیلافەت).

٢. عەلی خۆی لە بکوژانی عوسمان لانەدا، بە بیانووی ئەوەی کە چەند کەس لە جیاتی یەك کەس ناکوژرێتەوە، ئەوە درۆو بوختانەو ئیبن حەزم خۆشی ئەوە نەك هەر ناڵێ بەڵکو ئەوە ڕەت ئەکاتەوە، کەچی (میر فطروس) نیهادی ڕستەکەی هێناوەو گوزارەکەی قرتاندووەو خەجاڵەتیش ناکێشێ!!.

عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) بڕیاری کوشتنەوەی بکوژانی عوسمانی دابوو بەڵام چاوەڕوانی هەلی گونجاوی ئەکردو قەناعەتی وابوو کە کەفو کوڵی هەلو مەرجەکان پێویستە بنیشێتەوەو ئەم ئاژاوە چی و یاخیانە ئەبێت بڵاوەیان پێ بکرێ و پاشان ئەوەی دەستی بووە لە شەهیدکردنی عوسماندا ئەبێ سزای عادیلانەی خۆی وەربگرێ.. ئەوەتا لە (نهج البلاغة)دا ئەڵێ: (يا اخوتاه لست اجهل ماتعلمون، ولكن كيف لي بقوة، والقوم المجلبون على حد شوكتهم، يملكوننا ولا نملكهم؟ ان هذا الامر أمر جاهلية وان لهؤلاء القوم مادة، ان الناس من هذا الامر اذا

---

٥. زەکات ئەبی خەڵك خۆی دەری بکات نەك داوای لێ بکرێت!! هەروەها بۆ درێژەی زیاتری ئەم باسە سەیری (منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية) (١/١٥٥و ١٥٦) بکە.

[1] نهج البلاغة (ص٢٤٢).

حرك على امور: فرقة ترى ماترون وفرقة لا ترى ما ترون، وفرقة لاترى هذا ولا ذاك، فاصبروا حتى يهدأ الناس وتقع القلوب مواقعها.. وسأمسك الامر مااستمسك واذا لم أجد بدا فآخر الدواء الكي)[1].

نەك هەر ئەمە بەڵكو ئەوەتا دەربارەی بكوژانی عوسمان ئەفەرموێ: (لعن الله قتلة عثمان في السهل والجبل)[2]. خوا نەفرینی خۆی بڕێژێ بەسەر بكوژانی عوسماندا لە دەشتدابن یان لە شاخدا بن.

٣. وتمان ئیبن حەزم باسێكی وای هێناوە بەڵام ئەوە ڕەت ئەكاتەوە گوایە هەندێ ئەڵێن عەلی لەبەر ئەوە بكوژانی عوسمانی دەست لێ نەدا، چونكە قەناعەتی نەبووە چەند كەس لە جیاتی یەك كەس بكوژێ، ئیبن حەزم زۆر بەڕوونی ئەڵێ: (وفعله في طلب دم عبدالله بن خباب يقطع صحة من تأول على (علي) انه يمكن ان يكون لايرى قتل الجماعة بالواحد)[3][*]، دەی باشە خوێنەری بەڕێز ئەم جۆرە كەسانە كە نە شەرم لە خواو نە شەرم لە ئابڕووچوونی خۆیان ناكەن هەقی چییانە، ئەوە نەبێت ڕیسوا بكرێن تا واز لەم بوختانو تەزویركارییو نەزانین و بە ئارەزووەی خۆیان ئەهێنن.

* (عەلی میر فطروس) لەسەر بوختانو نەزانینەكانی خۆی بەردەوام ئەبێت چی (ناو) بە خەیاڵیدا هاتووە، گوایە كە مردووەو میراتی زۆری لێ بەجێ ماوە ئەخاتە لیستێكو ڕیزیان ئەكاتو ئەڵێ: موحەممەد بۆ داكوتانی دەسەڵاتی خۆی لە ئەم پیاوە زەنگینو دەوڵەمەندانە (ئۆلیگاریشیە كی خێزانی) دروست كرد!

جارێ زۆر بێ شەرمانە بە تەعبیری ناشیرین ناشیرین باسی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوفو زەیدی كوڕی سابتو خالیدی كوری وەلیدو عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر ئەكات، كە بە ڕاستی مرۆڤ نازانێ ڕەتی كامە شتی بداتەوە، ئەوەی كە لەسەرچاوەكەدا ئەو هێناویێتیی وانییە؟ یان هەندێ وایەو ئەو تەزویری تێدا كردووە، یان لە مێژوودا بە پێچەوانەی ئەوەوە هاتووە.. بەرهەحاڵ ئەوانەی لە پێشەوە باسمان كرد، ئەوە ئەسەلمێنێ كە ئەمانەی تریش هەروان، وەك وتمان (استدل بالمعلوم على المجهول)، بەڵام با ئەمە یەك دوو نموونەی تریش باس بكەینو ئەوی تر جێ بهێڵین بۆ خەڵكی تر چۆن ئەیدەنەوە بەسەر (میر فطروس)و پێڕەكەیدا بیدەنەوە بە سەریاندا.

(میر فطروس) پاش ئەوەی لە خۆیەوە ژمارە لێ ئەدا بۆ دەوڵەمەندیو پارەداری ئەو كەسانە، پەراوێزێك دائەنێتو ئەڵێ: "سەرنجتان بۆ ئەوە ڕادەكێشین كە زوبەیری كوڕێ عەوامو عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف و تەلحە بەشێكی زۆر لە سامانەكەیان لەسەردەمی خەلافەتی عوسماندا پێكەوەنا"[4].

یان دەربارەی خالیدی كوری وەلیدیش بە سوكایەتیكردنو گاڵتە كردنەوە ئەڵێ: "سەبارەت بە هەڵسو كەوتو ڕەفتاری مرۆڤانەی ئەم سەردارە مەزنەی ئیسلام هەر ئەوەندە بەسە كە بڵێین (خالد بن وليد) شەوێك بووە میوانی مالكی كوڕی نویرە، كە یەكێك بوو لە موسڵمانە بەناوبانگەكانو لە ناكاودا بە شێوەیەكی زۆر ناپیاوانە خانەخوێكەی كوشتو سەری بڕیو خستیە ناو تەنوری گەرمەوە، هەر ئەو شەوەش دەستی بە ژنەكەی گەیاند، خەلیفەی موسڵمانانیش ئەبوبەكر، پاش بیستنی ئەم تاوانە سامناكو بێ شەرمانەیە، بە بیانووی ئەوەی كە دەسەڵاتی ئیسلام پێویستی بەسەردارێكی وەك خالید هەیە لە سزادان پاراستیو بەخشی"[5].

---

[1] نهج البلاغة، ص ٣٤٢ ـ ٣٤٣.

[2] مختصر التحفة الاثنا عشره بة، الالوسي، ص٢٦٨، وقف الاخلاص، ١٩٩٤/ تركيا، استنبول.

[3] الفصل في الاهواء والملك والنحل/ ابن حزم (١٥٥/٤) دار الندوه/ لبنان/ بيروت، ط (١) مطبعة/ ١٣٢٠هـ.

[*] واتە/ هەڵوێستی (عەلی) دەربارەی وەرگرتنەوەی خوێنی (عبدالله كوڕی خباب) قسەی ئەوانە ئەبڕێت كە (تأويل) بۆ (على) ئەكەن گوایە ڕای نەبووە كە لە جیاتی یەك كەس چەند كەس لە (قصاصدا) ئەكوژرێتەوە (ئەگەر بە یەكەوە ئەو كەسەیان كوشتبێت).

[4] ئیسلامانسی، ل ١٠٨.

[5] ئیسلامناسی، ل٣٧.

جا لە پەراوێزدا ئەنووسێ (بڕوانە تاريخ يعقوبی .ب٢ .ل١٠٩، تاريخ طبري، (٤) ل ١٤٠ . ١٤١، شيعه دار أسلام/ سيد محمد حسين طباطبائي ل١١). لەم دەقەی سەرەوەدا خوێنەری بەڕێز بۆی دەرئەکەوێ کە ئەم کابرایە چەندە بێ شەرمو خەجاڵەتە، چەندە دڵ پڕ لە کینەیە بەرانبەر سەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ، هۆکەشی ئەوەیە کە قسەی شیعە توندڕەوەکان وەردەگرێو ئەیداتەوە، بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ ڕاست ئەفەرموێ: (ان مما أدرك الناس من كلام النبوة الاولى، اذا لم تستحِ فاصنع ما شئت)[1]، ئەوەیبە میراتی لە هەموو پێغەمبەرە پێشووەکانەوە ماوەتەوە بۆ خەڵك ئەو قسەیەیە کە ئەڵێ: "ئەگەر شەرمت تێدا نەبوو چی ئەکەی بیکە!".

بەڵام ئێمە ناچارین هەریەك دوو وەڵامی خێرا لەسەر ئەو دەقەی پێشوو بدەینەوە:

١. ئەڵێ: ئەو زانیارییانەی لە (طبری)و (یعقوبی)و (طباطبائي) وەرگرتووە لە کاتێکدا درۆ ئەکاتو لە (طبري) وەرنەگرتووە، تەنیا لەو دوو سەرچاوەی ترەوە وەرگرتووە کە هەردووکیان (شیعە مەزهەب)نو شیعەش بە گشتی (صەحابە) بەکافرو زاڵمو خوانەناس ئەزانن و قسەیان لەسەر سەحابە بە هیچ شێوەیەك وەرناگیرێو عەقڵیش هەر وا دەڵێ[2].

٢. ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ نوخبەی هەموو مرۆڤایەتین، ئەگەر دەوڵەمەندبووبن ئەوە بە عارەقی ناوچەوان و کاری پیاوانە پارەیان پەیدا کردووەو بە هەموو شێوەیەکیش پشكو بەشی هەژارانیان بەزیادەوە دەرکردووە لێی، نەك وەك مرۆڤە ڕژدو ناجوامێرەکان کە بە هەموو ڕێگەیەکی چەوتو لارو مەشروع سەروەت بنێن بەیەکەوەو گەنج و لاوو هەژارو پیریش لە دوورەوە زیتەی چاوی بێتو ئەمیش کەیفیان پێ بکاتو بەرنامە بۆ ئیستغلالکردنیان دابڕێژێ.

ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ کە بەڕەشو ڕووتی کۆچیان کرد بۆ مەدینە تەنیا سەریان دەکردوو ماڵیان هەمووی داگیر کرا لەلایەن بێ ویژدانەکانی قورەیشی دەسەڵاتدارەوە، ئەوەبوو کە چوونە مەدینە، خەڵکی مەدینە موسڵمانانە هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺو عەرزیان کرد، قوربان! چی سەروەتو سامانمان هەیە بە یەکسانی دابەشی بکە بەسەر ئێمەو برایانی کۆچکەردا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی شتێکی تر هەیە بۆ ئەوە نەکەین؟ وتیان ئەو شتە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی ئەمان ئیش نازانن ئێوە ئیشیان پێ بکەنو لەبەروبومەکەدا شەریك بن، وتیان باشە، ئەی پێغەمبەری خوا[3].

هەبوو لەناو صەحابەکاندا کاسبیو بازرگانی ئەزانی، هەر زوو دەستی دایەوە کاسبیو کەسابەتو پارە پێکەوەنان، بە ڕێگەی حەڵاڵ و نەیهێڵا بێتە بار بەسەر برایانی (ئەنصار)ەوە لە مەدینەدا، لەوانە (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف) کە (میر فیطروس) خۆشی لێی نایە.

(ابن كثير) لە (البداية والنهاية)دا ئەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفو سەعدی کوڕی ڕەبیعی کردە برای یەکتری، سەعد بە عەبدوڕڕەحمانی وت: برای بەڕێزم! من سوپاس بۆ خوا لەناو مەدینەدا لە هەموو کەس پارەدارترم، جا وەرە باماڵەکەم بکەمە دوو بەشی یەکسانەوە، نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ تۆ، دوو ژنیشم هەیە، هەرکامیان سەرنجی ڕاکێشای تەڵاقی ئەدەم بۆتو تۆ مارەی بکە، عەبدوڕڕەحمان فەرمووی: (بارك الله في مالك وأهلك، دلوني على السوق!!)، واتە: خوا فەڕو بەرەکەت بخاتە ماڵو مناڵت، تۆ ڕێگەی بازاڕم پیشان بدەن! ئیتر

---

[1] جامع العلوم والحكم (٤٩٦/١)، فەرموودەی ژمارە (٢٠).

[2] لە کتێبی (دەوڵەتی خیلافەت بوژانەوەی کۆمەڵگەو گەشەندنی شارستانییەت)دا بەردێژی هەڵسەنگاندن کراوە بۆ (یەعقوبی)و (مەسعودی)و سەرنجی خوێنەران بۆ ئەو کتێبە ڕادەکێشین.

[3] مختصر تفسير ابن كثير (٤٧٤/٣).

چوویە بازاڕو دەستی دایە کڕین‌و فرۆشتن"[1].ئەوانە پیاوانێکی نەفس بەرزو هەڵبژاردە بوون، ئەگەر بەو شێوەیە بوونایە کە تۆو شیعە توندڕەوەکان ئەیڵێن، بستێك ئەم دینەیان بۆ نە ئەبرایە پێشەوە، ئەگەر لە لوتکەی ڕەوشتبەرزی‌و مرۆڤایەتیدا نەبوونایە نەئەبوونە پەسەندیدەی خوا لە قورئانداو پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکاندا، سەد ڕەحمەت لە مەولەوی کە دەربارەی ئەو بەرە ناوازو نەجیبزادانەی (صەحابە) ئەفەرموێت:

ئەوانن ئەوان چاکیان بناس

(خير امة أخرجت الناس)

ئەدەس ئەوان کەوت دەرەجەی قوبووڵ

ڕزامەندی هەق، صوحبەتی ڕەسوڵ

بکە بەچاوی دڵ تەماشایان

لەم قورئانەدا مەدح‌و سەنایان

ئینصافت بوێ نەزەرە کە ورد ورد

چڵۆنە شەخصێ خودا سەنای کرد

نەك هەر لە جایێ، جا یەکێ جادوو

ڕاس وەبێ جادوو، (جاهدوا، جادوا)

*********

بە نەفس‌و بە ماڵ (في سبيل الله)

بالله، مع الله، في الله، لله

********

ئەدوی هەرکامی لەوانە کەوی

تۆش یاری یەکی لەمانە دەوێ[2]

٣. ئەڵێ (خالد خانە خوێکەی کوشت!)، (سەری بڕی!)، (خستیە تەنور!)، (دەستی گەیاندە ژنەکەیشی!)، (ئەم سەردارە مەزنەی ئیسلام!) ئەم قسانە جگە لە کینەو ناجوامێری (مير فطروس) چی تر لێ وەردەگیرێ؟!

خالیدێك کە هەموو ژیانی جیهادو تێکۆشان بووە لە پێناو ڕزگارکردنی میللەتە ژێر دەستەکانی دنیا لە چنگی زاڵمانی ساسانی‌و ڕۆمی ئەوکاتانە، کوا کاتی ئەوەی بووە دابنیشێ‌و پارەو پوول پێکەوە بنێ، باشە خۆ (ابن كثير) ئەڵێ: "لما مات خالد، لم يوجد له الا فرسه وغلامه وسلاحه"[3].

ئیتر کابرایەکی کینە لەدڵ چی ئەڵێ با بیڵێ، خالد لە کۆتایی ژیانیدا گەڕایەوە بۆ مەدینە پاش ئەو هەمووە جیهادو تێکۆشانەی لە بەرانبەر ڕۆم‌و فارس، هەر لەوێش لەسەر جێگە مرد[4]،ئەوەتا ئەفەرموێ (لە ئەوەندەو ئەوەندە شەڕدا بەشداریم کردووە لە لەشمدا بستێك نییە شوێنەواری شمشێرێك یان تیرێك یان ڕمێکی پێوە نەبێت، کەچی ئەوەتا ئێستا لەسەر جێگە ئەمرم وەك چۆن وشتر ئەمرێت، خوایە خەو لەچاوی ترسنۆکەکان بتۆرێنی)[5].

---

[1] البداية والنهاية (٣/٢٢٤).

[2] شەرحی عەقیدەی مرضية، مەلا عەبدولکەریمی مدرس، ل٤٦٥.

[3] البداية والنهاية (٧/١١٥).

[4] نظرات في السيرة، حسن البنا، مكتبة الاعتصام، ط ١/ ١٩٧٩.

[5] البداية والنهاية (٧/١١٢).

حەزرەتی عومەر لەگەل ئەوەدا کە لە سەردەمی خۆیدا (خالد)ی لە میری سوپای لادا[1]، بەلام هەر بەچاوی ڕێزەوە سەیری خالیدی ئەکرد. خالیدیش هەروا بوو بۆ ئەو، بۆیە کاتێك کە مرد فەرمووی: "خوا ئەزانێ زۆر بەشوێن مەرگدا گەڕاوم و چنگم نەکەوتووە، کەچی هەر ئەبێ لەسەر جێگە بمرم، هیچ کردەوەیەکیشم جێگەی ئومێد نییە دوای (لااله الا الله) بەقەدەر ئەو شەوەی کە تا بەیانی باران لێی داین و ئێمەش چاومان نەچووە خەو بۆ ئەوەی کافران خافڵگیر بکەین.. پاشان وتی: ئەگەر مردم ئەوە چەك و ئەسپەکەم بکەن بەخێر لەڕێگەی خوادا"[2].

(چەك و مال و ئەسپەکەی دانا بۆ جیهاد لە ڕێگەی خواداو منالەکانیشی دایە دەستی عومەری کوڕی خەتتاب)[3].

ئەو چیرۆکە خەیالاوییەش دەربارەی (مالکی بن نویرة) ئەیهێنێ، پینەو پەڕۆی دونیای پێوەیەو ئەم چیرۆکە لە کیتێبی (تەها حسین)دا هەیە کە ئەو هەندی ویژدانیشی بە خەرج داوە کە ئەم ئەوەشی بە خەرج نەداوە.. تەها حسین لە کتێبی (خالد بن الولید: سیف الله المسلول)دا ئەلێ: ".. ڕێی تێ ئەچێ کە ڕاویەکان شتی زۆریان پێدا نابێت و ئیسرافیان زۆر کردبێ بەلام نکولی لەوە ناکری کە خالید خەلکی زۆر کوشتووە.."[4]، هەروەها ئەلێ: ".. عومەر وای ئەبینی کە خالبید لەسەر کار لابرێ چونکە مالکی کوڕی نوەیرەی بەناهەق کوشتووە، بەلام گەورەمان (!) ئەبوبەکر وای ئەبینی کە لا نەبرێ، چونکە زیاد لە سنوور گوێڕایەلی ئەبوبەرکی ئەکردو شەڕی زۆری ئەبردەوە"[5]، بەلام من بۆ ئەوە گەڕام تا بزانم بناغەی ئەم بوختانە لە کوێوە هاتووە سەیر ئەکەم بناغەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ کتێبی (منهاج الکرامە)ی (ابن المطهر الحلي) کە زانایەکی شیعە مەزهەبەو ئەوە ڕەخنەی توند لە خالید ئەگرێت و یەکێك لەو ڕەخنانەی ئەوەیە ئەلێ: "کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ئەبوبەکر ناردی بۆ شەڕکردن لەگەل ئەهلی یەمامەدا کە موسلمانێتی خۆشیان ڕاگەیاندبوو، دوو هەزارو دوو سەد نەفەری لێ کوشتن و مالکی کروی نورەیشی ناپاکانە! کوشت، کە موسلمانێکی دیار بوو، هەر ئەو شەوەش چووە لای ژنەکەی.. ئەهلی سوننەت بۆیە بەنی خەنیفە بە (مرتدین)و هەلگەڕاوە ئەزانن، چونکە زەکاتیان نەدا بە ئەبوبەکر"[6].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بناغەی ئەم بوختانە لە (منهاج الندامة)ەوە هاتووە وەك هەندێ زانا ناویان لێ ناوە، بەلام با جارێ ڕاستی چیرۆکەکە وەك مێژوونوسانی متمانەدار باسی ئەکەن بنووسین..

ئەمەش ڕاستی چیرۆکەکەیە وەك مێژوونووسانی ئیسلامیی وتوویانە: "بەنو تەمیم کە خێلێکی گەورەی عەرەب بوو، لە ڕۆژانی پاشگەزبوونەوەی خێلە عەرەبەکاندا بوونە چەند دەستەیەك، هەندێکیان پاشگەز بوونەوەو زەکاتیان نەدەدا، هەندێکیش زەکاتەکانیان ناردە خزمەت ئەبوبەکر، هەندێکیش چاوەڕوان بوون تا بزانن چی ئەبێت، لەم کاتانەدا (سەجا حی کچی حارثي کوڕی سوەیدی کوڕی غطفاني تغليبي) کە ئافرەتێکی نەصرانی عەرەب بوو لە دوورگەوە بە خۆی و سوپاکەیەوە هاتە ناوچەکەیان و خەلکێکی زۆری لەگەلدا بوو، خۆی ئامادەکردبوو بۆ شەڕی ئەبوبەکری صدیق و لافی پێغەمبەرایەتی لێئەدا، (بەنی تەمیم)یش بە گشتی دایانە پال (سجاح)و یەکێك لەوانە

---

[1] (ابن کثیر) لە باسی هۆی عەزلکردی خالیددا ئەلێ: عومەر فەرمووی: لەبەر ئەوە عەزلم کرد تا خەلکی بزانن خوا دینی خۆی سەرئەخات نەك خالید، وە با ئەوە بزانین هێزو گۆڕان هەر لە دەست خوادایە.. البدايه والنهايه (١١٣/٧).

[2] هەمان سەرچاوە (١١٤/٧).

[3] نظرات في السيرة، ص ١١٥، (في سيره سيدنا خالد بن الوليد ـ ٢٠).

[4] قضايا الادب والثقافة والفن/ أنور الجندي ص١٥٨، ئەنوەرلجوندی لەو کیتێبەدا هەلسەنگاندنێکی ڕەخنەیی ورد بۆ زۆرێك لە کتێبەکانی (تەها حسین) ئەکات و ئەو بوختانانەی ڕەت ئەکاتەوە.

[5] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6] ئیبن تەیمییە بە درێژی لە (منهاج السنه)دا ڕەتی ئەو کتێبەی (ابن المطهر الحلي) ئەداتەوە بە نۆ بەرگ، چاپی زانکۆی موحەممەدی کوڕی سعود.

(مالکی کوڕی نوەیرە) بوو.. جا پێکەوە شەڕی (مسیلمە)یان کردو (مسیلمەو سجاح) ئاشتینامەیان ڕاگەیاند، ئەم ئەوی خواستو ئەو شوی بەم کرد[1]، کە نیوەی خەراجی زەوی یەمامەی لە موسەیلەمە وەرگرت گەڕایەوە بۆ دورگە، (مالك) دوای ئەوەی (سەجاح) ئاشبەتاڵی لیٚ ئەکات، زۆر پەشیمان بوویەوەو ڕەوی کرد بۆ جێگەیەك بەناوی (البطاح)، خالید کە دوای سوپا بەرزیوەکانی (هەڵگەڕاوەکان) کەوتبوو، بڕیاریدا بەرەو (بطاح)یش بچێت، (ئەنصار) وتیان: ئەوەی خەلیفە ئەبوبەکر بۆی دیاری کردبووین ئەنجاممان داوەو با بگەڕێینەوە، خالید وتی: ئەم کارە ئەبیٚ بگاتە ئەنجامو منیش هەل لەدەست نادەمو هیچ فەرمانێکیشم بۆ نەهاتووە (واتە بۆ نەڕۆشتین بۆ بطاح)، منیش ئەمیرمو بڕیاریش لای منە، زۆریش لەکەس ناکەمو نیازی (بطاح)یشم هەیە دوو ڕۆژ ڕێگە ڕۆیشتن و نوێنەری (ئەنصار)یش گەیشتە خالیدو وتی: (ئەنصار)یش بەڕێوەنو بڕیاریان داوە پێت بگەن، کە گەیشتنە ئەویٚ، خالید چەند تیمێکی دروست کردو بەناوچەکەدا بلاوی کردنەوە تا خەڵك بانگ بکەنەوە بۆ لای ئیسلام، چی پیاوی دیارو سەرکردە هەیە لەناو (بەنی تەمیم)دا بڕیاری (بیستن)و (گوێڕایەڵی)یاندا، تەنیا (مالکی کوڕی نویرە) نەبێت، هەر دوودڵ بوو، تا ئەوەبوو (مەفرەزەیەك) خۆیو ئەوەی لەگەڵیدا بوو بە ئەسیری گرتنیان، مەفرەزەکە یەك قسەنەبوون لە زانیارییەکانیاندا یەکێك کە (حارسی کوڕی ڕەبعی ئەنصاری) بوو ئەیوت، ئەمانە نوێژ ئەکەن، هەندێکیش ئەیانوت: نە بانگیان داوە نە نوێژیان کردووە.. ئەڵێن[2].. ئەو شەوەی ئەسیرەکانی تێدا ئەگرن زۆر سارد ئەبێتو بانگدەرەکەی خالیدیش هاوار ئەکات: ئەسیرەکانتان گەرم بکەنەوە.. خەڵکەکە واتیٚ گەیشتن کە مەبەستی کوشتنیانە، بۆیە هەموویان کوشتن، (ضراری کوڕی ئەزوەر) مالیکی کوڕی نویرەی کوشت، کە خالید گوێی لە دەنگەکەبوو، هاتە دەرەوەو سەیر ئەکات هەموو ئەسیرەکانیان کوشتووە، یەکسەر ئەڵێت: ئەگەر خوا شتێکی ویست ئەیکات، ئەوەبوو پاشان خالید ژنەکەی مالکی کوڕی نویرەی مارەکرد (پاش ئەوەی حەلاڵی بەسەردا هات)[3]، بەڵیٚ (ابن کثیر) ئەڵیٚ: نا.. خالید ناردی بەشوێن مالکی کوڕی نویرەداو زۆر سەرزەنشتی کرد کە دوای (سجاح) کەوتووەو وازی لە زەکاتدان هێناوەو پێی وتووە: مەگەر نازانی کە زەکات هاوڕێی نوێژکردنە؟ مالیك لە وەلامدا ئەڵیٚ: ئەوە ڕێبەرەکەی ئێوە لافی وا لێئەدات! خالید ئەڵێت: باشە پێغەمبەر ﷺ ڕێبەری ئێمەیەو هی تۆ نییە؟.. زرار بڕۆ بدە لە ملی، ئەوەبوو لە پاشاندا درا لە ملی.."[4].

(پرۆفیسۆر ئەمیر عبدالعزیز) لە (الوجیز في تأریخ الاسلام والمسلمین)دا پاش ئەوەی ئەم قسەی کۆتایی (ابن کثیر) ئەگوازرێتەوە . هەرچەندە لە ناو کەواندا لەدوای قسەکەی (مالك)ەو ئەڵیٚ: "مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بووە، (ئەگەر ڕاست بێت قسەی وای کردبێت) . ئەڵیٚ: (ئەم جۆرە چیرۆکانە کە ئەقڵ ئەیانگرێت بووەتە مایەی ئەوەی کە پێنووسی هەندیٚ لە مێژوونووسانی ئیمپریالیزمو ڕۆژهەلاتناسانو بەکریٚ گیراوان، دنیایەك گومانو درۆی هەڵبەستراو بڵێن لێرەدا تا خەڵکی چەواشە بکەن بەرانبەر ئەو مێژووە پڕ سەروەرییەی کە ئیسلام هەیەتی، بۆ ئەوەی خەڵك لەم دینە دوور بکەوێتەوەو زیهنی موسڵمانان لارو خوار بێتو نەنازن بەم دینەوەو سەرگەردان بن، لە کاتێکدا هیچ پێویستیی نییە بەو هەراو هەلا گەورەیە کە بە پێنوسی چەند دەجالێکی گرگن کە پەروەردەی دەستی دوژمنو ناحەزانی ئیسلامن ئەنووسرێت، ئەمە لە کاتێکدا کە کۆمەڵگە گومراو سەرلێشێواوەکانی ئیمپریالیزم و

---

[1] ئەم شووکردنە فێڵبازانەیە شتی ناجوانو سەیرو سەمەرەی زۆر تێدا ڕوویدا (ابن کثیر) لە (البدایة والنهایة ٦/٧١٢ ـ ٧١٣)دا باسیان ئەکات.

[2] وشەی (یقال) و(قیل) لە زمانی شەرعدا بۆ شتێك بەکاردێت کە هەواڵەکە جێگەی دڵنیایی نەبێت واتە (ضعیف) بێت.

[3] ئەوە قسەی من نییەو قسەی (ابن کثیر)ە کە ئەڵیٚ (فلما حلت بنی بها) (البدایة والنهایة: ٦/٧١٤).

[4] البدایة والنهایة (٦/٧١٤).

خاچپەرستەکانو ستەمکارانی ترو جگە لەوانیش لە ناو تاریکیو بەدڕەوشتیو ستەمکاریدا لولو گێژ ئەخۆن کە هەمووشی بە زیانی مرۆڤایەتی تەواو ئەبێت"[1].

جا خوێنەری بەڕێز ئیتر ئەوە تۆو ئەوەش (میر فطروس) سەیر بکە بزانە ئەو دوو شتە هیچی لەیەك ئەچێ،؟!.. کوا خالید میوان بووە لای مالیك؟ یان کوا مالیك یەکێك بووە لە موسڵمانە بەناوبانگەکان؟! یان کوا سەرو کواتەنوورو کوا خانە خوێ؟![2].. هتد، ئاخر ئەو شتانە کوان؟، ئەم بوختانچییانە قەناعەتیان وایە درۆ ئەگەر تا بەردەرگاش بڕیکات هەر بیکەن باشە.. نازانن پەتی درۆ کورتەو خاوەنەکەی زۆر نابات ڕیسوا ئەبێت، هەر ئەو درۆکردنەش پەلکێشی ئەکات بۆ هەرچی خراپەو ناپاکی تر هەیەو ئەوکاتەش لە دیوانی خوادا بە (درۆزن) ناوزەند ئەکرێت.. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (اياكم والكذب فان الكذب يهدي الى الفجور وان الفجور يهدى الى النار ولا يزال الرجل يكذب ويتحرى الكذب حتى يكتب عندالله كذابا)[3]، بە تایبەتی ئاگادارتان ئەکەمە کە دووربن لە درۆ، چونکە درۆکردن مرۆڤ پەلکێش ئەکات بۆ خراپەکاریو خراپەکاریش مرۆڤ بۆ ئاگر پەلکێش ئەکات، پیاوی وا هەیە درۆ ئەکاتو بەشوێن درۆدا ئەگەڕێ تا لای خوا بە کەسێکی درۆزن ناوی ئەنووسرێت..

(میر فطروس) وڕێنەو بوختانو قسەی سوكو سەلیمی تری زۆر ئەکات لەم بەشەداو ناچار ئەم مشتەی وەلامەکان ئەکەینە نموونەی خەرمانی ڕەخنە لەو قسەو قسەلۆکانە.

* (عەلی میر فطروس) لە لاپەڕە (١٤٠)دا لە ژێر ناونیشانێکی فێڵبازانەدا ئەڵێ: "هەلاگەڕانەوەی نووسەری وەحی (کاتب وحی)، پاشان باسی عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی سەرح ئەکات کە یەکێك بووە لە نووسەرانی (وەحی) لە ئیسلام پاشگەز بووەتەوە.. جا ئەڵێ: یەکێك لەو ڕووداوە سەیرو سەمەرانەی کە لە سەرەتای سالأنی بە پێغەمبەربوونی موحەممەددا ڕوویدا ڕووداوی هەڵگەڕانەوەی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەرح بوو لە ئاینی ئیسلام.. پاشان ئەڵێ: لە ئاکامدا (ئەبی سەرح) لە ئایەتی (١٤)ی سورەتی (مؤمنين) (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ) لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەوێتە کێشەوە، ئەو لەسەر ئەو باوەڕەبوو گوایە (من ئەم ئایەتەم هۆنیوەتەوەو موحەممەد لێمی دزیوە!!) (عەلی میر فطروس) پەراوێز بۆ ئەم قسەیە دائەنێ و خوێنەر وائەزانێ کە سەرچاوەی قسەکە باس ئەکات کەچی ئەڵێ: (ئایەتی ٩٣)ی سورەتی (أنعام) ئاماژەیە بۆ ئەم کارەساتە (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً أَوْ قَالَ أُوْحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ) هەرچەندە ئەو نووسیویەتی (ولم يرح اليه شئ).. پاشان ئەڵێ: پاش ئەم مەسەلەیە (ئەبی سەرح) لە ئاینی ئیسلام هەڵدەگە ڕێتەوەو پێغەمبەریش خوێنی حەلاڵ دەکات"[4].

بۆ وەلامی ئەم دەقەی سەرەوە پێویستە چەند شتێك بڵێین:

١. هەڵگەڕانەوەی خەڵك لە ئیسلام هیچ سەرسوڕهێن نییە، ئەو کەسە هەرچی بێت عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەرح بێت یان مسیلەمە بێت یان مالکی کوڕی نویرە بێت یا.. یا..

٢. ئەو ناونیشانە فێڵبازانە چییە! بۆ ئەوەی خوێنەری وابزانێ پێغەمبەر ﷺ تەنیا عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەرحی بووەو ناوی (کاتب وحی) بوویێت، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وەك نووسەرانی (سیرە) باسی ئەکەن زیاتر لە

[1] سەرچاوەی ناوبراو ل٣١٦ ـ ٣١٧، پرۆفیسۆر ئەمیر عبدالعزیز: مامۆستای (فقه مقارن)ە لە زانکۆی (النجاح الوطني) لە نابلس ـ فەلەستین.

[2] شا عەبدولعەزیز ئەلدەهلەوی نووسەری کتێبی (مختصر التحفة الاثناعشرية) لە (ل: ٢٣٨)دا ئەڵێ: "مالیكو ماڵو منالی شایيو زەماوەندیان کردووەو دەفو تەپڵیان لێداوەو جنێویان بە ئەهلی ئیسلام داوە کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ فەوتی کردووە، (بەلازەری)یش لە (فتوح البلدان)دا ئەڵێ: مالیكو عەشرەتەکەی کەوتنە شەڕ لەگەڵ خالیددا لە (بطاح)داو بە ئەسیری خۆیو هاوڕێکانی گیران.. هەروەها کە پێغەمبەر ﷺ وەفات ئەکات مالیك زەکاتی عەشرەتەکەی ئەداتەوە بە خەڵکیو ئەڵێ: زەحمەتی ئەم کابرایەتان لە کۆڵ بوویەوە".

[3] رياض الصالحين/ النووي، ص ٤٣٦، والحديث متفق عليه.

[4] ئیسلامناسی (ل١٤٠)، پەراوێژەکەش لە لاپەڕە (١٠٩)دایە.

(چل) کاتب وەحی بووە، وەك (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، زەیدی کوڕی سابتو.. هتد)[1]، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح یەکێك بووە لەوانە.

٣. ئەو ئایەتە ئەو باسی ئەکات زۆربەی نووسەرانی تەفسیر ئەڵێن لەسەر (مسیلمە) دابەزیوە کە ئەیوت (وەحی دێتە سەرم)[2].

٤. هەندێك باسی ئەوە ئەکەن کە نیوەی دووەمی ئایەتەکە لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح هاتبێتە خوارەوە، وەك (واحدی) لە (أسباب نزول)ەکەیدا ئەڵێ، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەوە باس بکات کە عەبدوڵڵا وتوویەتی (من ئەم ئایەتەم هۆنیوەتەوەو موحەممەد لێمی دزیوە!)، چونکە لەوە ئەچێ هیچ (بێ حەیایەك) لە دونیا نەگاتە ئەم تەرزە عەلمانییە بێ حەیایانەی ئەمڕۆ لە ناو کوردستاندا پەیدا بوون.

(واحدی) ئەڵێ: ئایەتی (ومن قال سأنزل مثل ما انزل الله) دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح هاتە خوارەوە، کە پێشتر موسڵمان بووبوو، پاشان ئەڵێ: "ئەمە قسەی ئیبن عەبباسە کە (الکلبی) لێوەی ئەیگێڕێتەوە".

من بواری ئەوەم نەبوو بگەڕێم بە شوێن سەنەدی ئەم ڕیوایەتەدا تا بزانم چەندێك (صحیح)ە یان (ضعیف)ەو ئەوە هەڵدەگرم بۆ کەسێکی تر یان بوارێکی تری ڕەخساو، بە هەرحاڵ شتێکی سروشتییە خەڵکی لە ئیسلامو لە دینو لەخوا هەڵبگەڕێتەوە لە بێئاگاییەکدا یان لەبەر تەماعێك یان لەبەر ترسێك یان لەبەر هەرشتێکی تر[*]، هەروەها سروشتییە ئەو کەسە جارێکی تر بچێتەوە بە خۆیداو موسڵمان ببێتەوەو تۆبە بکات، وەك عەبدوڵڵا دوای فەتحی مەککە تۆبەی کردوو بوو بە یەکێك لەو کەسانەی ئیسلامی گەیاندە کونو قوژبنی کیشوەری ئەفریقاو لە دەیانو بگرە سەدان غەزادا بەشداریی کردووە کە زۆر لە گەورە صەحابەکانی وەك عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی عەمری تێدا بووە[3]، ئیتر ئەوە کەی ئەوە ئەهێنێت (میر فطروس) بیکاتە برینێك لە مێژووی ئیسلامیداو بە سەریەوە بنیشێتەوە!!

لە مێژوودا شتی وا چەندجار ڕوویداوەو جێگەی قبوڵکردنی خەڵکیش بووە، بۆ نموونە (تولەیحەی کوڕی خوەیلد) کە لە ناخافڵیدا شەیتان خەڵەتاندیو دووری خستەوە بە ڕادەیەك خۆی لێ گۆڕالافی پێغەمبەرایەتی لێ داو دەستی کردە بانگ کردنی خەڵك بۆ لای خۆی، کاتێکیش کە ئەبوبەکر سوپای ناردە سەرو تەفرو تونای کردن ڕای کرد بۆ شامو تا ئەبوبەکر لە ژیاندابوو هەر لەوێ مایەوە کاتێك کە عومەر بوو بە خەلیفە (طولەیحە) گەڕایەوە بۆ لای ئیسلامو هات بۆ عەمرەو پاشان چووە خزمەتی عومەرو سەلامی لێ کرد، عومەر وتی: با نەتبینم تۆ دوو پیاوی موسڵمانی ساڵحت کوشتووە، (عەکاشەی کوڕی موحصن)و (سابتی کوڕی ئەقدەم)، (تولەیحە) وتی: جا ئەی ئەمیری موسڵمانان خوا ڕەحمی کردووەو ڕێزی لەو دوو پیاوە ناوە بە بۆنەی دەستی منەوە، جا بەس نەبوو خوا منی ڕیسوا نەکرد بە دەستی ئەوان، عومەر ئەم قسەیە زۆر سەرنجی ڕاکێشاو نامەی لێبوردنی بۆ دەرکرد[4].

بەقسەی (میر فطروس) بێت، هەر کەسێك گوناهێك بکات ئەبێ خوا بدا بەبەندەستیداو دەرگای تۆبەکردنی لێ دابخاتو چاوی دەربێنێ.. لە کاتێکدا خوای گەورە هەموو شەوێك دەرگای تۆبەکردن ئەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی لە

---

[1] بۆ زانیاری تەواو سەیری (البدایە والنهایە: ٢/٣٦٤)، هەروەها (الوجیز في التاریخ الاسلام والمسلمین، ص٢٩٠) بکە.

[2] المفردات: ص٢١٥، هۆی دابەزینی ایەتی (٩٣) الانعام.

[*] عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ئەفەرموێت: (کان عبدالله بن ابي سرح یکتب للنبي ﷺ فأزله الشیطان فلحق بالکفار)، واتە عەبدوڵڵا وەحی ئەنووسییەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ شەیتان پێی خلیسکاندو خۆی نا بە کافرانەوە. (البدایة والنهایة).

[3] هەمان سەرچاوە (٥/٣٧٥).

[4] البدایة والنهایة (٧/١١٦).

ڕۆژدا گوناهیان کردووەو پەشیمان ئەبنەوە، لە ڕۆژدا بەهەمان شێوە دەرگای تۆبە ئەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی لە شەودا گوناهیان کردووە کە ڕۆژیان لێ ئەبێتەوە پەنجەی پەشیمانی ئەگەزن‌و تۆبە ئەکەن، ئەوەش با هەر داغ بێت بۆ (میر فطروس)[1]، چونکە ئەوەندە حەزئەکات خوا لە خەڵك خۆش نەبێت، نازانم بۆچی پێی خۆش نییە خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای خوای خۆیان؟!

* (عەلی میر فطروس) ئەڵێ: "(بارتولد) و (گلدزیر) و(فلیپ حتی) توێژەرەوانی دیکەش لە لێکۆڵینەوەکانیاندا وای دەردەخەن کە جەنگاوەرانی عەرەب پتر بە مەبەستی چنگخستنی ماڵ‌و دەستکەوت‌و سامان، وەك هاندەرێکی سەرەکی . شەڕیان دەکرد، لە ڕاستیدا هاندەری ئایین لای ئەوان گرنگییەکی کەمتری هەبوو"[2]، جا سەیر لەوەشدایە کە لەهەمان لاپەڕەشدا ئەڵێ: "لە (ڕۆستەم) فەرماندەی سوپای ئێران‌و (مغیرە کوڕی شعبە)ش وا گەیەندرابوو کە هاندەری شەڕی عەرەبەکان لە (باوەڕێکی ئاینییەوە نەهاتووە، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت‌و غەنیمە بووە)".

لە وەڵامدا ئەڵێین:

ڕۆژهەڵاتناسان بە گشتی نەیانتوانیوە بابەتیانە لەسەر ئیسلام‌و مێژووی موسڵمانان بنووسن، بەڵکو هەندێکیان وەك (مژدەدەر)و هەندێکیان وەك (هێزی ئیمپریالیزمی) دەستیان داوەتەوە نووسین لەسەر ئیسلام.. دکتۆر مستەفا سوباعی (بەڕەحمەت بێت) کە خۆی لەگەڵ چەند لەو گەورە ڕۆژهەلاتناسانەدا چاوپێکەوتنی کردووەو کەوتووەتە گفتوگۆ لەگەڵیانداو شتی بۆ ڕاست کردنەوونەتەوە، دەربارەیان ئەڵێ: پێویستمان بە ماندووبوونێکی زۆرو گەڕانێکی وا نییە تا بگەینە ئەوەی فاکتەری یەکەمین کە ڕۆژهەڵاتناسان هان ئەدات لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام بکەن (فاکتەری دینە)، چونکە سەرەتای ئەم بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسییە بە (ڕاهیبەکان) دەستی پێ کردوو تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە[3].

ئەمانە زۆر مەبەستیانە ئیسلام بدەنە بەر ڕەخنەو لایەنە چاکەکانی ئیسلام لارو خوار بکەن‌و ڕاستییەکانی بشێوێنن، تا بۆ خەڵکی (خۆیان کە شوێنیان کەوتوون‌و ملیان بۆ کەچ کردوون) بسەلمێنن ئیسلام (کە لەو ڕۆژانەدا تاکە ڕەقیبی مەسیحییەت بوو لە دیدی ڕۆژئاواییەکاندا) ئاینێکە شایانی ئەوە نییە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بدەی، وای پیشان بدەن کە موسڵمانەکان کۆمەڵێك پیاو خۆرو دزو چەتەو خوێن مژن، دینەکەیان هانیان ئەدات بە دوای ئارەزووی جەستەییاندا بڕۆن‌و گوێ بە بەهای ڕۆحی‌و ڕەوشتی نەدەن[4].

(مستەفا سوباعی) پاش ئەوەی فاکتەرو هاندەرەکانی ڕۆژهەڵاتناسان ئەکاتە پێنج فاکتەر، هەندێك بە درێژی باسی ئامانجەکانی ڕۆژهەڵاتناسان ئەکات لەم هەموو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر ئیسلام‌و مێژووی ئیسلامی‌و وڵاتانی ئیسلامی دەیکەین ئامانجەکانیان ئەکات بەسێ بەشەوە:

أ . ئامانجێکی زانستی بە گومان دەورە دراو (مشبوه) کە مەبەستیەتی:

---

[1] جارێکیان (ئەبو ذر) لە پێغەمبەری پرسی ﷺ کێ ئەچێتە بەهەشت؟ فەرمووی: هەرکەسێ بە دڵ بڵێ (لااله الا الله)، ئەبوزەر وتی: (وان زنی وان سرق)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (وان زنی وان سرق)، ئەبو زەر تاسێ جار ئەو پرسیارەی کردەوەو پێغەمبەریش هەر هەمان وەڵامی دایەوە، لە سێیەمجاردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (وان زنی وان سرق وعلی رغم انف أبي ذر)، ئەم فەرموودەیە بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

[2] ئیسلامناسی ل (٤١).

[3] مستەفا سوباعی (بەڕەحمەت بێت) لەو کتێبەدا ئەو ڕاستیبەی بە بەڵگە سەلماندووە لە لاپەڕەکانی پێشترو پاشتری ئەم پەڕەگرافەدا.

[4] الاستشراق والمستشرقون (مالهم وماعليهم)/ السباعي، ص١٨.

١. گومانو دوو دڵی به پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ دروست بکاتو بیسەلمێنێ کە سەرچاوەی قورئان لە خواوە نییە، زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسان نکوڵی لەوە ئەکەن کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە سروشی بۆ هاتبێ.. هەیانە ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ فێی هەبووەو پەرکەمی لەگەڵدا بووە!! هەندێ ئەڵێن پیاوێکی خەیاڵ بڵاو بووە، هەیانە دیاردەکانی (سروش) بە نەخۆشی دەروونی پێغەمبەر ﷺ تەفسیر دەکات هەروەك پێش موحەممەد ﷺ کەسی تر نەبوو بێتە پێغەمبەر تا دیاردەی (سروش) ئەوەندە قورس بێتو بۆیان لێك نەدرێتەوە!

بەدوای ئەمەدا نکوڵی لەوە ئەکەن کە قورئان هی خوا بێت، کە ئەو هەمووە باسە زانستی وردانەی ناو قورئانیا ن بۆ باس ئەکرێتو ئەڵێی ئەمانە عەقڵ نایبڕێ کە پیاوێکی نەخوێندەوار پەی پێ بردبن، هەمان قسەی موشریکەکانی قورەیش ئەکەنەوە کە موحەممەد لە خەڵکی تر ئەم قورئانەی وەرگرتووە، کە دێنە ئەم خاڵە هەریەکەی قسەیەکی سەیرو سەمەرە ئەکات، کە پێیان ئەڵێی، ئاخر ئەو هەمووە ڕاستییە زانستییانەی کە دەیان ساڵ پاش قورئان دۆزراونەتەوە چۆن زانرا، وا پاساوی ئەدەنەوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی زۆر زیرەكو بلیمەت بووە!.

٢. کە نکوڵی لە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر ﷺو ئاسمانی بوونی قورئان ئەکەن، بەدوایدا ئەڵێن ئیسلام ئاوێتەیەکە لە دینی یەهودییو مەسیحی، کە هیچ بەڵگەیەکیشیان بۆ ئەم قسەیە نییە، ئەوە نەبێ هەندێ خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوان ئیسلامو ئەو دینەی تردا، (جولد تسیهر)و (شاخت) لەو گەورە ڕۆژهەڵاتناسانەن کە پێ لەسەر ئەمە دائەگرن.

٣. دروستکردنی گومان لەسەر فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەڵێن خەڵکێك بووە کە فەرموودەیان بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستووە کەچی چاو لەئاست ئەو هەمووە لێکۆڵینەوە زانستیو وردانەی زانایانی ئیسلام دائەخەن کە کردوویانە، بۆ جیاکردنەوەی فەرمووەدەی (صەحیح) لە فەرموودەی (ناصحیح)و (موضوع)، کە من بە درێژی لە کتێبی (السنة ومكانتها في التشريح الاسلامي)دا موناقەشەیەکی زۆر زانستیانەم لەگەڵدا کردوون.

٤. گومان دروستکردن دەربارەی سەربەخۆیی (فقهی ئیسلامی) ئەو فیقهە گەورەو فراوانەی کە لەناو هیچ میللەتێکی تردا لە هیچ سەردەمێکدا بوونی نییە، ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە کە موتالأی فقهی ئیسلامیی ئەکەن لە گۆ ئەکەونو نازانن چی بڵێن! ناچارن کە بڵێن ئەو فیقهە لە (ڕۆمانییەکان) (واتە لە ڕۆژئاوای خۆیان) وەرگیراوە، کە زانایانی ئێمە بە بەڵگەی ڕوون ئەمەیان لە چەند ڕووەوە ڕەت کردۆتەوە [1].

دەی ئیتر کەوابێ نرخی چییە ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە هەرچی بڵێن دەربارەی ئیسلامو مێژووی ئیسلامیی! ئەوان چۆن ئەتوانن دان بنێت بە سەروەرییەکانی موسڵمانانا لە تەواوی مێژوویاندا، چۆن مێژووی میللەتێك لە دەم دوژمنەکەی وەردەگرێت ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە ئاخر کوا مێژووی ڕاستەقینە شتی وا ئەڵێت؟!

(ابن كثير) لە (البداية والنهاية)دا باسی ئەو شەڕانە ئەکات کە ناوی ڕۆستەم یان موغیرەی کوڕی شوعبەی تێدا هاتووە، نەك ئەوانەی (مير فطروس) ناڵێ، بەڵکو زۆر بە پێچەوانەی ئەوانەی ئەوەوە ئەیڵێن بۆ نموونە: لە بەرگی (٧)و لاپەڕە (٣٨)دا ئەڵێت: ".. کە سوپای موسڵمانانو سوپای فارس لە قادسیەدا ڕووبەڕووی یەك وەستان ڕۆستەم نوێنەرێکی نارد بۆ لای سەعد تا پیاوێکی (ژیرو زانا)ی خۆیانی بۆ بنێرێ، هەندێ پرسیاری لێ بکات، سەعدیش موغیرەی کوڕی شوعبەی بۆ نارد (ڕەزای خوای لێبێت) کە شوعبە گەیشتە ئەوێ ڕۆستەم دەستی کردە پرسیار لێکردنو وتی: ئێوە دەرو جیرانی ئێمەنو ئێمەش باش بووین لەگەڵ ئێوەدا خراپەشمان لێ دوور خستوونەتەوە، لەبەر ئەوە داواکارم لێتان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتانو پەیمانی ئەوەتان پێ ئەدەم کە ڕێگەی

[1] هەمان سەرچاوە (ل ٢٣ ـ ٢٧)، پاشان دکتۆر سوباعی بە درێژی باسی دوو ئامانجەکەی تر ئەکات، ئامانجی سیاسییو ئامانجی لێکۆڵینەوەی زانستی، کە ئەمە بە پێویستمان نەزانی بیگوازینەوە.

بازرگانی ولاتی خۆمانتان لێ ناگرین.. (موغیرە) وتی: ئێمە بەشوێن دنیادا ناگەڕێین‌و دونیامان مەبەست نییە، بەڵکو مەبەست‌و داوامان شتی ترە، ئێمە خوا پێغەمبەرێکی ناردووە بۆمان‌و پێی فەرمووە: من ئەو کۆمەڵەی ئاینی من قەبوڵ ئەکات زاڵ ئەکەم بەسەر ئەو میللەتانەدا کە ئاینی من قەبووڵ ناکەن‌و هەر بەو کۆمەڵە تۆڵەیان لێ ئەکەمەوە، بەردەوام سەرکەوتنیان ئەدەمێ تا دەستیان بە ئاینی منەوە بێت، کە ئاینی ڕاستەقینەیە، هەرکەس ڕقی بێت لێی ڕیسواو زەلیلی دەکەم‌و هەرکەسیش دەستی پێوە بگرێ سەری بەرز ئەکەم! ڕۆستەم بە شوعبەی وت: ئادەی بزانم ئەو ئاینە ڕاستەقینە کامەیە؟ شوعبە وتی: ئەمما ئەو کۆڵەکەیەی کە ئەو نەبێت هیچ شتێکی لە شوێنی خۆیدا نامێنێ ئەوەیە کە شایەتی بدەی کە خوا تاك‌و تەنیایەو موحەممەدیش لەلایەن ئەو خوایەوە نێردراوە، پاشان دان بنێی بە هەموو ئەو شتانەدا کە خوا ئەیان فەرموێ‌و ئەیان نێرێ، ڕۆستەم وتی: ئەمە شتێکی چاکە، ئیتر چی؟ شوعبە وتی: ڕزگارکردنی خەڵك لە عیبادەتکردنی خەڵك بۆ ئەوەی تەنیا عەبدایەتی خوا بکات، ڕۆستەم وتی: ئەمە شتێکی چاکە، ئیتر چی؟ شوعبە وتی: ئەم خەڵکەش هەموو نەوەی ئادەمن‌و هەموو برای یەکترین‌و کوڕی دایك‌و باوکێکن.. ڕۆستەم وتی: ئەمەش دووبارە هەر چاکترە، پاشان وتی: باشە! ئەگەر ئێمە ئەم ئاینەی ئێوەمان قەبوڵ کردو هاتینە ناوی، ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆ ولاتی خۆتان؟ شوعبە وتی: ئەرێ، سوێند بەخوا دوای ئەوە بۆ بازرگانی یان پێویستییەك نەبێت نزیکی ولاتتان ناکەوینەوە، ڕۆستەم وتی: ئەمەش هەر چاکە.. کە موغیرەی کوڕی شوعبە گەڕایەوە بۆ لای موسڵمانان ڕۆستەم میرو ڕێبەرەکانی میللەتەکەی کۆکردەوەو بیروڕای دەربارەی ئیسلام لێ وەرگرتن، هەموو ڕەتی ئیسلامیان کردەوەو قەبوڵیان نەبوو بچنە ناو ئیسلامەوە، خوا ڕیسواو ڕووڕەشیان بکات وەك کردنی"[1].

دەی توخوا خوێنەری بەڕێز ئەم قسانە لەکوێ‌و ئەو قسەی (میر فطروس) لەکوێ، کە ئەڵێ: "ڕۆستەم‌و موغیرە وا حاڵی بوون کە شەڕی عەرەبەکان (مەبەستی موسڵمانەکانە) بۆ دین نەبووەو بۆ دونیاو غەنیمەت بووە".

(ابن كثير) دوای ئەم قسەیە بە درێژی باسی هەموو ئەو نوێنەرانە ئەکات کە یەك بەدوای یەکدا سەعد ئەیناردن بۆ لای فارسەکان تا فارسەکان لە مەبەست‌و ئامانجی ئەمان بگەیەنێت‌و بۆ نموونە کە (ڕەبعی کوڕی عامر)یش ئەنێری، لێی ئەپرسن: چی ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە؟ ڕەبعی ئەڵێ: "الله أبتعثنا لنخرج من شاء من عبادة العباد الى عبادةالله، ومن ضيق الدنيا الى سعتها، ومن جور الاديان الى عدل الاسلام"[2].

٣. لەلایەکی تریشەوە، ئەمەی (میر فطروس) پێچەوانەی هەموو ئەو هەوڵانەی خۆیانە کە ئەیدەن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن "ئیسلام بە زۆر دراوە بە کۆڵ میللەتاندا"، باشە ئەگەر ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ بۆ غەنیمەت‌و پارەو دەستکەوت شەڕیان کردووە، ئەی ئەوە کێ دینی بڵاوکردووەتەوە؟! ئەی باشە ئەم ئیسلامە چۆن گەیشتە بنی دنیا، چۆن پیاوی دنیاویست دینی پێ بڵاوئەکرێتەوە؟! باشە هەر لەم ڕۆژانەدا نابینی ئەوەی باسی (دین) ئەکات‌و کەچی هەڵگری خەمی (دنیا)یە، ناتوانێت بستێك ئیسلام بەرێتە پێشەوە، یان نابینی ئیسلام چەندە بەرەو پێشەوەو بەرەو گەشە ئەڕوات لەسەر دەستی ئەوانەدا کە دونیایان ناوەتە لاوە..

٤. بە کەمترین بەراورد لە نێوان (فتوحاتی ئیسلامی‌و) (حەمەلاتی صلیبی)دا بۆ هەموو کەس دەرئەکەوێت کە مەبەست لە فتوحاتی ئیسلامی بڵاوکردنەوەی دین‌و دینداری بووەو مەبەست لە (حەمەلاتی صلیبی) دنیا خۆری‌و داگیرکاری‌و دەستکەوت بووە، ئەگینا بۆچی ئەویان مایەوەو ئەمیان نەما؟! ئەویان توانی میللەتان بەرەو ئیسلام بهێنێ‌و ئەمیان نەیتوانی کەس بەرەو مەسیحیەت بهێنێ، ئەویان توانی کاریگەری دینی‌و فەرهەنگی‌و ڕەوشتی‌و تەنانەت یاسایش لەسەر کۆمەڵگاکان دابنێ، کەچی ئەمیان نەیتوانی.

[1] البداية والنهاية (٣٨/٧).

[2] هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.

٥. ئەم خاڵەش هەر بۆ باس ئەشێتو باشە بوترێت، داگیرکەرو دنیاخۆرو ستەمکار لەوانەیە بتوانێ بۆ ماوەیەك خەڵکی خووس بداتو ملکەچی دەسەڵاتو فەرهەنگی خۆی بکات، بەڵام هەر فشاری نەماو دەسەڵاتی کز بوو خەڵك خۆیو فەرهەنگەکەشی ئەخاتە زبڵدانی مێژووەوە.. دەی باشە ئیسلامو سوپای ئیسلامی کە چوبێتە هەر شارو وڵاتو کیشوەرێکەوە بۆچی دوای نەمانی هێزو دەسەڵاتە ئیسلامییەکەش خەڵکی هەر بە موسڵمانێتی ماونەتەوەو دەستیان لە ئیسلام بەرنەداوە، بەڵکو برەوی زیاتریشیان پێداوە.

لەمانەوەو لە زیاترلە مانەشەوە (خوێنەری بەرێز) بۆی دەردەکەوێت کە فتوحاتی ئیسلامی بۆ بڵاوکردنەوەی (دین) بووە نەك وەك (میر فطروس) ئەڵێ: "..هاندەری شەڕی عەرەبەکان (کە مەبەست موسڵمانانە) لە باوەڕێکی ئاینییەوە نەهاتووە، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتو غەنیمە بووە".

ڕاستە لەناو سوپای ئیسلامیشدا هەبووە نێتی خوا نەبووە، یان حەزی لە ماڵو سەروەتو سامان بووە، بەڵام بە گشتی موسڵمانان نێتو مەبەتسیان هەر گەیاندنی دینی ئیسلام بووە، ئەوەش شتێکی سروشتیە خەڵکێك لەناو ڕێزی صەحابەشدا هەبێ حەزی لە دونیا بێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (وان الرجل ليسلم مايريد الا الدنيا، فما يلبث الا يسيرا حتى يكون الاسلام احب اليه من الدنيا وما عليها) رواه مسلم، (رياض الصالحين: ص١٩٧).

جاری حەزکردن لە پارەو سەروەتو سامانو دنیا لە ئیسلامدا حەرام نییە، ئەوەی حەرامە دونیا پەرستی و ماڵپەرستییە، یان پێکەوەنانی سەروەتە بە ڕێگەی حەرام، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (تعس عبد الدينا وتعس عبد الدرهم تعس وانتكس واذا شيك فلا أنتقش)[1]. واتە: بێ فەڕ عەبدی دونیاو بێ فەڕ عەبدی درهەم، بێفەڕو سەروخوار بێ، ئومێدەکەم ئەو ڕۆژەی درکێك ئەچێت بەپێیدا کەس نەبێت بەمەقاش بۆی دەربهێنێ.

هەروەها پارەو سەروەتو سامان لە ئیسلامدا نە (گولە)و نە (قێزەون)یشە، وەك هەندی لە عەلمانییە بێ ویژدانەکانی ئەمڕۆی کورد ئەیڵێن، بەڵکو خوا لە قورئانداو پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەدا بەچاکی باسی سەروەتو سامان ئەکەن ئەگەر بە حەڵاڵو داد پەیدا بکرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيد)، هەروەها ئەفەرمووێ: (..إِن تَرَكَ خَيرا) کە مەبەست بەو (خێرە) پارەو سەروەتو سامانە.

دیارە ئیسلام یاساو ڕێنمایی بۆ ڕێکخستنی ماڵیش پێیە وەك چۆن یاساو ڕێنمایی بۆ تەواوی مەیدانەکانی تری ژیان پێیەو ئێرە شوێنی باسکرنی ئەو یاساو ڕێنماییانە نییە.

* (میر فطروس) زۆر کینەدارانەو نەفامانەش ئەڵێ: "قورئانیش لە چەند ئایەتدا پێی لەسەر گرنگێتیی بەدەستهێنانی دەستکەوت دا گرتووە، وەك هاندانێکی عەرەبەکان بۆ ناردنیان بۆ شەڕ تەماع و قیرسچمەیی عەرەبە موسڵمانەکان لە وەدەستهێنانی دەستکەوتدا بە ڕاددەیەك بوو کە لە هەندێ شەڕدا وەك شەڕی بدر دژی ئامۆژگاریو فەرمانەکانی خودی پێغەمبەریش دەجوڵانەوەو دیلەکانیان نەدەکوشتو بە دەستکەوتو غەنیمەت دەیانگۆڕییەوە"[2]، یان ئەڵێ: "لە شەڕی ئوحوددا ئێشکگرو بۆسەچییەکانی سەر بەرزاییەکان بە تەماحی کۆکردنەوەو دەستکەوتنی غەنیمەتو دەستکەوتەوە سەنگەرەکانیان بە جێ هێشت". بەدوای ئەمەدا خۆش ئەوەیە بەبێ ناوبڕ ئەڵێ: "لە شەڕی (جبل الرمات)یشدا بە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر، سوپاکە بۆ بەدەستهێنانی شڕەو پاتاڵ لە جێگەی خۆیان جووڵانو بووە هۆی شکانی موسڵمانان".

لە وەڵامی ئەم نەزانینو ئارەزووکارییە نەخۆشانەی (میر فطروس)دا ئەڵێین:

١. تەعبیری ناشرینی تۆ بۆ صەحابەی پێغەمبەر ﷺ هیچ لە قەدرو ڕێزی ئەوان کەم ناکاتەوە، کەسێ خوا مەدحی بکات لە قورئانداو پێغەمبەر ﷺ مەدحی بکات لە فەرموودەداو زاناو پیاوانی ژیرو پیاوانی بەویژدان مەدحی بکات، چ باکیەتی گوماناوییەکی وەکو (میر فطروس) لە زەمیاندا بێت.

---

[1] رواه البخاري

[2] ئیسلامناسی، ل٤٢.

٢. ئەڵێ لە شەڕی (بەدر)دا بە ئامۆژگاریی پێغەمبەریان نەکردو دیلەکانیان نەکوشتو بە غەنیمەت گۆڕییانەوە.. ئەم ڕستەیە لە چەندلاوە هەڵەیە:

لە لایەکەوە ئەوە ڕای پێغەمبەر بوو ﷺ کە نەکوژرێن نەك ڕای صەحابە.

لە لایەکی تریشەوە ئەو ڕایەی پێغەمبەر ﷺ چەند فەلسەفەی گەورەی تێدابوو، جارێ ئەمەی کە ڕای صەحابە نەبوو، بەڵکو ئەوە ڕای پێغەمبەر بوو ﷺ ڕاستی مەسەلەکەش ئەمەیە وەك مێژووی ڕاستەقینە ئەیگێڕێتەوە.

(پێغەمبەر ﷺ کە ئەسیرەکانی (بەدر)ی بردەوە بۆ مەدینە، دابەشی کردن بەسەر صەحابەکانداو پێی فەرموون باش بن لەگەڵیاندا، کەوتە بیرکردنەوە چی بکات لەم ئەسیرانە، بیان کوژێت یان بە بەرانبەر شتێکەوە بەرەڵایان بکات.. ئەوەبوو بڕیاریدا ڕاوێژ بە صەحابەکانی بکاتو بیداتە دەست ئەوان)[١].

(ابن کثیر) ئەڵێ: ڕاوێژی بە ئەبوبەکرو عومەر کرد، ئەبوبەکر ڕای وابوو کە نەکوژرێن، عومەر ڕای وابوو بکوژرێن، عەبدوڵڵا ڕای وابوو هەموویان بسوتێنرێن.. ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە هەموویان ئامۆزاو عەشیرەتمانن، ڕای من وایە کە بە بەرامبەر (فدیە)یەکەوە بەریان بدەی، بەڵکو خوا ئەوانیش هیدایەت بداتو بەو ماڵەش لەوانی وەرئەگرین هێزێکی پێ پێکەوە ئەنێین بەرانبەر کافران.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی تۆ ڕات چییە کوڕی خەتتاب؟ عومەر فەرمووی: نەوەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من ئەو ڕایەی ئەبوبەکرم نییە، ڕای من وایە کە لێمان گەڕێی گشتیان بکوژین، لێ بگەڕێی (عەلی) بدات لە ملی (عقیل)ی برایو منیش بدەم لە ملی فلان (هاوزاوایەکی عومەر بوو)[*]، قوربان گیان! ئەمانە پیشەواو ڕێبەری بێ دینین! پێغەمبەر ﷺ ڕایەکەی ئەبوبەکری پەسەند کرد[٢]، لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ڕاوێژی بەسێ صەحابە کرد، ئەبوبەکرو عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، دیارە وەك نوێنەری هەمووان، کە چوونە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر خوا ﷺ، وەك لە (مسند الأمام احمد: ٣٧٣/١) دا هاتووە: (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما تقولون في هؤلاء الاسرى؟) ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە خزمو کەسوکارو عەشرەتی خۆتن، بەڕای من جارێ ڕایان بگرەو بەڵکو خوای گەورە تۆبەیان لێ وەربگرێ، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر ئەمانەبوون شاربەدەریان کردیو بە درۆزنیان ئەدایتە قەڵەم، بیاندەرە دەستمان با بدەین لەگەردنی گشتیان، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ڕام وایە چ دۆڵێك داری زۆری تێدایە بیانکەینە ئەویو ئاگریان تێ بەربدەین.. پێغەمبەر ﷺ بڕیاری کۆتایی نەداو چووە ژوورەکەی خۆی، جا خەڵکی بوونە چەند بەشێك، بەشێکیان ئەیانوت ڕایەکەی ئەبوبەکر پەسەند ئەکاتو بەشێکیان ئەیانوت: ڕایەکەی عومەر پەسەند ئەکاتو هەندێکیش ئەیانوت: ڕایەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە پەسەند ئەکات، پاش کەمێك پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لای هاوەڵانیو فەرمووێ: (بە دڵنیاییەوە خوای گەورە دڵی خەڵکی وا هەیە ئەوەندە نەرم ئەکات لە ماست نەرم تر بێتو دڵی خەڵکی واش هەیە ئەوەندە توندوتۆڵ ئەکات لەبەرد ڕەقتر بێت)، ئەبوبەکر تۆ وەك ئیبراهیم پێغەمبەری (سەلامی خوای لێ بێ) کە ئەیوت: (إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)، تۆش ئەی عومەر وەك نوح پێغەمبەری وای (سەلامی خوای خوای لێ بێت) کە ئەیوت: (رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً)، بە عەبدوڵڵاشی وت تۆ وەك موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وای کە ئەویت (رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُواْ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ)، پاشان فەرمووی: (أنتم عالة، فلا ينفلتن منهم أحد الا بفداء أو ضرب عنق..)[٣]، واتە: ئێوە خەڵکێکی هەژارو بێ دەستن، با

[١] حياة محمد، هيكل ص٢٧١.

[*] ئەو زیادەیە لە (ابن کثیر)ەکەدا نییەو لە (السيرة النبوية/ الصلابي) (٦٤/٢)دا هەیە.

[٢] السيرة النبوية/ الصلابي (٦٤/٢).

[٣] هەمان سەرچاوە (٦٤/٢ ـ ٦٥)، هەروەها (تفسير ابن كثير: ٣٢٥/٢).

کەسیانتان لەدەست نەبێتەوە بە (فدیە)دان یان بەسەر بڕین نەبێت، لە کتێبیی (التربیة الجهادیة)دا (منیر الغضبان) کە نووسەرێکی بەتوانای سورییە ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی (سەعدی کوڕی مەعان)دا هەندی توڕەی و بێ تاقەتی بینی، فەرمووی (والله لکأنك یاسعد تکره ما یصنع القوم) سەعد وتی: بەڵێ قوربان وەڵڵاهی ڕاست ئەفەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە یەکەمین شکستێکە خوا هێناویەتی بەسەر خەڵکی بێ دیندا، بە ڕاستی کوشتنو لەناوبردنی ئەمانە زۆر باشترە لای من لە هێڵانەوەیان[1].

ئەوە ڕاو بۆچوونی سەحابەیە لە مەسەلەی بەدردا[*]، دەی ئیتر خوێنەری بەڕێز (میر فطروس) درۆو بوختان ناکات کە ئەڵێ: تەماعو قیرسیچمەیی عەرەبە موسڵمانەکان لە وەدەستهێنانی دەستکەوتدا بەڕاددەیەك بوو کە لە هەندێ شەڕدا وەك شەڕی بەدر، دژی ئامۆژگاریو فەرمانەکانی خودی پیغەمبەریش ﷺ دەجولانەوەو دیلەکانیان نەدەکوشتو بە دەستکەوتو غەنیمەت دەیانگۆڕینەوە! دەی ئیتر مردنو ڕووڕەشی لەکوێیە وا پێڕو تاقمەکەی (میر فطروس) دەستیان ناکەوێ، هەروەها ئەو ڕایەی پێغەمبەریش ﷺ کە گلدانەوەو نەکوشتنیان بوو، چەند فەلسەفەی گەورەی تێدا بووە وەك:

. سوود وەرگرتن لە (زانیاری)و (خوێندەواری) ئەو ئەسیرانە بەوەی هەریەکەیان ئەبێت (١٠) منداڵی موسڵمان فێری (خوێندنو نووسین) بکەن[2]، کە ئەو دوو شتە کلیلی عەقڵو بێدارینو ئەمەش ئامانجێگی سەرەکی پەیامی ئیسلامەو سەیریش نییە ئیسلام وابێت کە یەکەم ئایەتی بە (اقرأ) دەستی پێ کردووە.

. ئەوەشی دەوڵەمەند بێت بە پارەیەکی باش دێتو ئەسیرەکەی ئەکڕێتەوەو ئەو پارەیەش چەكو تفاقێکی زۆری پێ دەکردرێتو سوپای کۆرپەی ئیسلامی پێ بەهێز ئەکرێت.

. خەڵکی کە بەشەڕیش هات لەگەڵ ئیسلامدا پاش ئەم ڕووداوە ئیتر شەڕی سەرو ماڵیو مانو نەمان ناکاتو بەڵکو بیرێکیش لە خۆ تەسلیمکردن ئەکاتەوە، پەندێکی یابانی هەیە ئەڵێ: "لەگەڵ هەر دوژمنێکدا بەشەڕ هاتی پردێکی بۆ ببەستە با پاشەکشەی لێوە بکات".

. مانەوەی ئەم ئەسیرانەش لە ناو موسڵماناندا ئەو سوودەی ئەبێت کە لە نزیکەوەو بە ڕاستەوخۆ نەك لە دەمی ئەمو ئەوەوە گوێبیستی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی ئیسلام ئەبنو دوور نییە کاریگەرییان لەسەر دابنێتو کاتێك گەڕانەوە بۆ ناو کەسوکاریان بەڕێگەیەك یان زیاتر سوود بە ئیسلام بگەیەننو لە نەیارەوە ببنە یاری ئیسلام.. یان لە دوژمنەوە ببنە بێلایەن[*].

جا نازانم ئیتر شوورەیی نییە (شوان. ع)و (سیامەك بابەك)و (میر فطروس) خۆیان ئەخەنە ناو ئەم هەموو هەڵەوە، یان توخوا مایەی شەرمەزاری نییە کابرا (جبل الرمات)یشی لێ ببێ بە شەڕێکی تر لە کاتێکدا ئەوە شاخی ئوحودەو تیرهاوێژەکانی لەسەر بووەو ئەو دوو شەڕە (شەڕی ئوحود)و شەڕی (جبل الرمات) وەك (میر فطروس) ئەیڵێ هەریەك شتە بەڵام دیارە عەرەبی نەزانینەکەی ئەم پەنەی پێدا داوە.

جا (میر فطروس) لە خۆی وایە قەناعەتی بە خوێنەر کردووە کە فتوحاتی ئیسلامیی بۆ شڕەخۆری بووە نەك بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام، بۆیە بە پۆزەیکەوە ئەڵێ: "بەو پێیە، بە پێچەوانەی باوەڕی مێژوونووسو فەیلەسووفی

---

[1] التربیە الجهادیە (١٤١/١).

* (سەعدی کوڕی مەعان) سەرۆکی هەموو ئەوس بوو، قسەی ئەو قسەی عەشیرەتەکەی بوو، با ئەوەش بوەستێ کە قسەی عومەرو عەبدوڵڵاش، قسەی دەیانو سەدانی تر بوو لە ناو صەحابەداو شیکاری پێغەمبەریش ﷺ بۆ ڕایەکان ئەوەی تێدایە کە صەحابە ئەوەیان لا باش بووە کە دەرسێکی وای (بێباوەڕان) دابدەن کەس دوای ئەوە بیر لە پەلاماردانیان نەکاتەوە..

[2] صحیح السیرة النبویة/ أکرم ضیاء العمري (ص٢٦١).

* چەندام کەسی ئەسیر لە ماوەی ئەسیرییەکەیدا موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاندو کتێبەکانی (سیرە)ش باسی زۆر لەو کەسانە دەکەن، بۆ نمونە سەیری (حیاه محمد، هیکل، ص٢٧٣) بکە.

گەورەی عەرەب (ابن خلدون)و هەروەها بە پێچەوانەی هەموو ئەوانەی کە پێیان وایە ئیسلام تەنیا بزووتنەوەیەکی ئاینییە.. بنیاتنانی دەسەڵاتی ئیسلامی نەك هەر بەرهەمی حەزو پێخۆشبوونو بەجۆشبوون نەبووە بۆ مەسەلە ئاینییەکان، بەڵکو پێکهاتنی ئەو دەسەڵاتە دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی ڕژێمی ئابووریو کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی عەرەبستان"[1]!!

جا بەڕاستی جوانیان وتووە (رحم الله أمرا عرف لنفسه قدره ولم يتجاوز طوره)، ڕەحمەت لەو کەسەی خۆی ئەناسیو لە پێستی خۆشی ناچێتە دەرەوە.

(میر فطروس) وا ئەزانێ قسەی ئەو ئەبێ بخوات، بەڵام قسەی زاناو فەیلەسوفێکی وەك (ابن خلدون) نابێ بخوات!! قسەی ئەو بەڵگە نەویستەو بابەتییەو زادەی بیروبیرکردنەوەیەکی قولو ڕۆشنە، بەڵام هی (ابن خلدون) کاردانەوەو قسەی پیاوێکی ڕووکەشو نەخوێندەوارە!!

باشە ئەگەر "ڕێنماییەکانی ئیسلام بۆ فتوحاتی ئیسلامی"و "واقیعی بزووتنەوەی فتوحات"و (شوێنەوارەکانی ئەو بزاڤی ڕزگاریخوازیی ئیسلامییە) لە تەواوی مێژوودا، بەڵگەبن بۆ قسەکەی (ابن خلدون) ئەی جگە لە کینەو کاردانەوەی ناڕەواو بەدگومانیو بوختان هەڵبەستن چی تر بەڵگەی قسەکەی (میر فطروس)ە. خوای گەورە لە دەیان ئایەتدا ئەفەرموێ: (وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّه..).

پێغەمبەر ﷺ لە دەیان فەرموودەدا ئەم مانایە چڕ بکاتەوە کە ئەفەرموێ (من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله) [2].

سەحابەو سەربازانی ناو سوپای ئیسلامیش بە دەیانو سەدان قسەی دیندارانەیان هەبێت کە بەڵگەی ئەوەیە، ئەو بەرە نەجیبزادەو دڵسۆزانە بۆ مرۆڤایەتی، بۆ ئەوە دەستیان بە ماڵو منداڵو وڵاتو خۆشیو ئیسراحەتی خۆیانەوە ناوە تا ئیسلام بڵاو بکەنەوە[3].

ئەی ئیتر بۆ قسەکەی (ابن خلدون) ڕاستەقینەیەك نەبێت کە لە (میر فطروس) ون بووبێتو خەمیشی نەبێت بیدۆزێتەوە یان نەیدۆزێتەوە؟! ئەم عەلمانییە بێ ویژدانانە کە لەناو کورددا پەیدابوون ئاگایان لە پێشو پاشی خۆیانو قسەی خۆیان نییە.. لەولاوە ئەڵێن دین بەزۆر دراوە بە کۆڵی خەڵکدا، لەولاوە ئەڵێن سوپای ئیسلام بۆ بڵاوکردنەوەی دین نەڕۆیشتوون!! دەی باشە ئەگەر بۆ بڵاوکردنەوەی دین نەڕۆشتوون، ئەی بۆچی دین ئەوەندە (ڕوشد)و پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی لەسەر دەستیاندا؟ مەگەر لەسەر دەستی ئەواندا میللەتانی دونیا باوەشیان بۆ ئیسلام نەکردەوەو بەدڵو بە گیان نەکەوتنە خزمەتکردنی؟! مەگەر لە ناو ئەو میللەتانەدا دەیانو سەدان زانای بلیمەتی گەورە هەڵنەکەوت لە زانستە ئیسلامییەکاندا کە مامۆستا هەژار باسی دەیان لەو زانا گەورانە ئەکات کە تەنیا لەناو کورددا هەڵکەوتوون[4]، ئەی ئەو سەدانو هەزاران کتێبە نایابو دەگمەنانە بەرهەمی چیبوون کە ئەو

---

[1] ئیسلامناسی (ل٤٣).

[2] جامع العلوم الحكم، ص٢٢، فەرموودەکەش بوخارییو موسلیم ڕیوایەتی دەکەن.

[3] بۆ نموونە (عوقبەی کوڕی نافع) کە بۆ فتوحاتی ئیسلامی کیشوەری ئەفریقا ڕۆیشت، گەیشتە دەریای ناوەڕاستو وشکانی نەما، وتی: خوای گەورە تۆ شایەتی کە من بۆ بڵاوکردنەوەی دینی پێغەمبەرەکەت ﷺ هاتووم، ئەگەر بشمزانیبادوای ئەم ئاوە وشکانی تر هەیە ئەوە ئەمدا لێیو ئەچووم بۆ ئەوێش، پاشان دەستی بەرزکردەوەو بە هاوەڵەکانیشی وت: ئێوەش دەست بەرز بکەنەوە دەستی کرد بە دوعاکردنو وتی: (اللهم لم اخرج بطرا ولا أشرا، وانك لتعلم انما نطلب السبب الذي طلبه عبدك ذو القرنين وهو أن تعبد ولا يشرك بك شيء، اللهم انا معاندون لدين الكفر، ومدافعون عن دين الاسلام فكن لنا ولا تكن علينا ياذالجلال وألاكرام)، دوای ئەوە ئیتر گەڕایەوە. (معاويه بن ابى سفيان/ شخصيتة وعصره/ د. على محمد الصلابى، ص ٣٧٣).

[4] سەیری پێشەکی مامۆستا هەژار بۆ کتێبی (مەلای جەزیری) بکە.

میللەتانە دوای وەرگرتنی ئیسلام نووسیویانە کە تەنانەت بە ویژدانەکانی ڕۆژئاواش دان بە قەرزاری خۆیاندا ئەنێن بۆ ئەو کتێبانە.

ئەی باشە کاکە شوانو کاکە سیامەکو (میر فطروس) بۆ ئێوەش نەفرین لە شەیتان ناکەنو لە خۆتان بڕێن و بابەتیانەو بە ویژدانەوە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ئیسلام بکەن، بەتایبەتی لەم مەسەلەی (فتوحات)ەدا تا بزانن:

یەکەم: یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلام بۆ شەڕ چییە.

دووەم: واقعی ئەو سوپا ئیسلامییانە چۆن بووە.

سێیەم: ئاسەواری ئەو فتوحاتانە لەناو میللەتاندا چۆن بووە.

نەکەن یاخی بوونی چەند کەسو گروپێکی شۆڕاوە لە هەموو شتێ بەری چاوتان بگریو ڕووناکی لێکۆڵینەوەکەتان لێ تاریك بکات، چونکە لە هەموو دنیادا یاخیو لادەر هەیەو دژایەتی خۆی ئەکات با ئەو بەرانبەری دینو پێغەمبەرو خواش بێت.. خوای گەورەش بڕیاری نەداوە کە حەتمەن ئەبێ هەموو کەسێ ملکەچی دینەکەی بێت، ئەگەرنا خۆ بیویستایە وای دەکرد وەك ئەفەرموێت: (وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى)، یان ئەفەرموێت: (وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً).

ئەوەش لەبەر حیکمەت و نهێنیەکە کە خوا خۆی ئەیزانێت، کاری ئێمە نییە، کاری ئێمە ئەوەیە لەم دونیای پڕ تاقیکردنەوەدا کۆششی خۆمان بکەینو نمرەی سەرکەوتن بەدەست بهێنینو نەیدۆڕێنین، ئیتر ئەوە بەتاڵیو سەوداکردنی فەشەلو دۆڕاندنە، قوتابییەك لەبری ئەوەی خۆی بۆ تاقیکردنەوەو بەدەستهێنانی (بڕوانامە)و (پلەی بەرز) ئامادە بکات، هەر خەریکی ئەوەیە باشە ئەم تاقیکردنەوانە بۆچییە؟ دەوام کردن بۆچییە؟ قوتابیو مامۆستایەتی بۆ هەیە؟ وەك چۆن ڕەخنەو گومانو پرسیاری بێ جێی قوتابی فاشل ڕێ لە ڕەوتی خوێندنو خوێندەواریو بڕوانامەو زانکۆو ژیانی پاش قوتابێتیی ناگرێتو دامو دەزگای خوێندن هەڵناوەشتێنێتەوە، هەرواش گومانو ڕەخنەو پرسیاری نابەجێی خەڵکی یاخی لەخواو پێغەمبەرو دین ڕێ لە ڕەوتی دینداریو هاتنی قیامەتو پلەی بەرزی بەهەشتو زیندانی هەتاهەتایی جەهەنەم ناگرێتو عەرەب واتەنی (القافلة تسیرو الكلاب تنبح).

(عەلی میر فطروس) لە لاپەڕەکانی (٤٤)و (٤٥)و (٤٦)و (٤٧)و (٤٨) (٤٩)دا لە ژێر ناونیشانی (ئیسلامو خاوەنداریێتیی)دا سێ چوار باس تێکەڵ ئەکات، بەسەر یەکداو ئەیەوێت چۆن خۆی سەری لێشێواوە واش سەر لە خوێنەرەکانی بشێوێنێ، لەو لاپەڕەرانەدا سێ مەسەلەی سەرەکی باس ئەکاتو چەمکەکانیان ئەشێوێنێ:

باسی یەکەم: باسێکی بنەڕەتی موڵکداری ئەکات بەڵام نەزانانە.

باسی دووەم: باسی موڵكو میراتی پێغەمبەر ﷺ ئەکات بە تایبەتی (فدك).

باسی سێیەم: باسی شێوەکانی موڵکداریێتی زەوی ئەکات لە ئیسلامدا.

باسی یەکەم: بنەڕەتی موڵکداری

(میر فطروس) ئەڵێ: "... ئیسلام پاش سەقامگیر بوونی دەسەڵاتەکەی دەکەوێتە هەڵوەشانەوەی خاوەنداریێتیی تایبەتی"[1]. ئەم قسەیە ئەداتە پاڵ (مستەفا سباعی) کە گوایە لە (اشتراكیة الاسلام)دا وتوویەتی.. پاش ئەمە خۆی ئەڵێ: "بڕیارەکانی قورئانو فەرموودەکانی ئیسلام.. باوەڕیان بە درێژەکێشانی چەوسانەوەو دەسەڵاتی چینە دەوڵەمەندەکان هەیە.. زاناکانی زانستگای (الازهر) لە میسر بەرپەرچی بیروڕای ئەوانە دەدەنەوە کە لەسەر باوەڕی بوونی گەوهەری کۆمۆنیستی (یان سۆسیالیستی)ن لە قورئانداو بەڵگەشیان (أبو ذر)ە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم چەند بڕگەیە تەنیا دوو خاڵ ئەڵێن..

[1] ئیسلامناسی ل٤٤.

خاڵی یەکەم: ئیسلام نە سەرمایەدارییە نە (کۆمۆنیستیو سۆسیالیزمیشە)، بەڵکو ئیسلام ئیسلامە، هەرشتێکی چاك لە (سەرمایەداری) دایان لە (کۆمۆنیستی)دا هەبێ لە ئیسلامدا یان وەك (دەق) یان وەك ئاماژە باسی کراوە، بەڵام ئەوە ناکاتە ئەوەی ئەمیان یان ئەویان بێت.. ئەکرێ لە ئەم مەسەلەی موڵکدارێتییەدا باری سەرنجی ئیسلام بەسێ ڕستە بڵێت:

* سەرمایەداری چۆنێتی موڵکداریو چەندێتیی موڵکداریی دیاری ناکات.

* سۆسیالیزمی یان کۆمۆنیستی چۆنێتی موڵکداری دیار ناکات بەڵام چەندێتییەکەی دیاری دەکات.

* ئیسلام چۆنێتی موڵکداری دیاری ئەکات، بەڵام چەندێتی موڵکداریی دیاری ناکات.

ئەم سێ ڕستەیە ڕاڤەیەکی کورتی بۆ بکەین نەك لە هەموو کەس ڕۆشن نەبێت..

سەرمایەداری یاسادانانێت بۆ چۆنێتی پێکەوەنانی موڵك، واتە ڕێگەکانی موڵك پەیداکردن لەسەرمایەداریدا دیاری ناکرێت،بەڵکو ئەوە بە مافێکی تاکەکەسی ئەزانێو دەست ناخاتە ئەو ئازادییەوە بۆیە لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا جۆرەها شێوازی پارە پەیداکردنو موڵك پێکەوەنان هەیە، لە سوو خواردنەوە بیگرە تا مەی فرۆشیو لەشفرۆسیو یانسیبو قورمارو.. هەروەها یاسا دانەنراوە بۆ ڕێژەو چەندێتی ئەو موڵکدارییە، واتە بۆ هەموو کەس هەیە تاکوێ دەوڵەمەند ئەبی ببێ..

کەچی لە کۆمۆنیستیدا ڕێگە نادرێ خەڵکی لە سنوورێك کە دەوڵەت یان یاسا دیاری دەکات زیاتر بڕواتو موڵك پێکەوە بنێ، ئەوەش بەکاری خۆی نازانی یاسا بۆ ڕێگەکانی موڵك پێکەوەنان دابنێ، چونکە یان هەر ڕێگەی پێ نادرێ یان هەر چۆن پەیدای بکات ڕێگەی لێ ناگیرێ..

بەڵام لە ئیسلامدا نە ئەمیانەو نە ئەویانە.

لە ئیسلامدا یاسا بۆ چۆنێتی موڵك پێکەوەنان دیاری دەکرێت، واتە ڕێگەی حەڵاڵو ڕێگەی حەرام دیاری ئەکرێت، هەر موڵكو سامانێك بە حەرامی پێکەوە بنرێت ئیسلام هەڵی دەوەشێنێتەوەو ئەیباتەوە سەر بناغەکەی خۆیو هەر موڵكو سامانێکیش بە حەڵاڵی پێکەوە بنرێ ئیسلام موبارەکبایی لە خاوەنەکەی ئەکات، (سەعید حوی) لە کتێبی (الاسلام)دا بە درێژی باسی ڕێگە حەڵاڵو حەرامەکانی موڵکداریی ئەکاتو ئێمەش لە کتێبی دەوڵەتی خیلافەتدا کە وەڵامێکی ڕەخنەییە بۆ کتێبی (کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)ی فوئاد مەجید میصری لەوێدا ئێمەش باسێکی موڵکداری تاکە کەسیمان کردووەو سەرنجی خوێنەرانی بەڕێزی بۆ ڕادەکێشین، کە کورتەی یاساکانی ئیسلام لەم موڵکدارێتیی تاکەکەسییەدا ئەکرێ لەم خاڵانەدا باس بکرێ:

١. موڵكو سەروەتو سامان هەمووی هی خوایەو مرۆڤیش لە قیامەتدا پرسیاری تەواوی لێ دەکرێت لەو موڵكو سەروەتو سامانانەی کە خوای گەورە پێی ئەدات، پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی چۆنی پێکەوە نا، پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی چۆنی سەرف کرد، جا ئەگەر (پێکەوەنان) یان (سەرف کردن)ەکانی لە حەڵاڵدا بووبێ ئەوە بەختەوە ئەبێتو ئەگەرنا ئەو گیرۆدە ئەبێت.

٢. لە ئیسلامدا بنەمای (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُم) هەیە، واتە: دەسەڵاتی ئیسلامیی نابێت ڕێگە بدات بەوەی سەروەت و سامان تەنیا لای دەوڵەمەندەکان بێتو هەر لەناو ئەواندا ئەم دەسەتو ئەو دەست بکات، بەڵکو بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی هەیە کە ئەگەر نا هاوسەنگی بێتام (فاحش) دروست بوو ئەو هاوسەنگی بکاتەوە.

**٣. له ئیسلامدا بنه‌مای (من این لك هذا)[1] هه‌یه كه په‌رژینه بۆ پاراستنی ئه‌و بنه‌مایه‌ی له خاڵی دووهه‌مدا باسمان كرد.**

**٤. له ئیسلامدا بنه‌مای زه‌كات دان هه‌یه كه بڕی له (٢,٥٪) له سه‌روه‌ت و سامانی ده‌وڵه‌مه‌ندان ساڵانه ده‌رده‌هێنرێت و به‌سه‌ر هه‌ژاراندا دابه‌ش ئه‌كرێت و له باری سروشتیدا ئه‌و بڕه ماڵه ته‌سلیم به ده‌وڵه‌ت ئه‌كرێت و ئه‌ویش له ڕێگه‌ی وه‌زاره‌تێكی تایبه‌ته‌وه به به‌رنامه‌یه‌ك نه‌بوونی و هه‌ژاری پێ قه‌لاچۆ ئه‌كات[2]، ئه‌گه‌ر هه‌ركه‌سه‌ش بۆ خۆی ئه‌و زه‌كاته‌ی ئه‌دا ئه‌وه پێویسته‌ئاگاداری ئه‌وه‌بێت كه (منه‌ت) و (ئه‌زیه‌تدان)ی به‌دوادا نه‌یه‌ت وه‌ك خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێ: (لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى)، زانایه‌كی ڕۆژهه‌لاَتناس ورد له‌م مه‌سه‌له‌ی زه‌كاته تێگه‌یشتووه‌و خۆش ئه‌ڵێ: "دوو گرفتی گه‌وره له ناو مرڤایه‌تییدا هه‌یه كه ئیسلام توانیویه‌تی به دوو ئایه‌ت هه‌ردوكیان چاره‌سه‌ر بكات، گرفتی لاوازی په‌یوه‌ندییه كۆمه‌لاَیه‌تییه‌كان، گرفتی كه‌ڵه‌كه‌بوونی پاره‌و پوول لای ته‌نیا چینێك، ئیسلام به ئایه‌تی (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ) چاره‌سه‌ری یه‌كه‌میان و به‌ئایه‌تی (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا)، چاره‌سه‌ری دووهه‌م گرفتی خه‌ڵكه‌كه‌ی كردووه"[3].**

**٥. ئیسلام بنه‌مای (تفاضل) ئه‌سه‌لمێنێ، چونكه شتێكه واقعییه‌و ناكرێ باز بدرێت به‌سه‌ر سروشت و غه‌ریزه‌ی ڕیشه‌داری ئه‌م مرۆڤه‌دا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ش بنه‌مای (یه‌كسانی ته‌واو له موڵكییه‌ت)دا شتێكی مه‌حاڵه، ئیسلام نایسه‌لمێنێ با به‌كورتی نموونه‌یه‌ك باس بكه‌ین: ئه‌گه‌ر له شارێكدا بته‌وێ (یه‌كسانی ته‌واو) پیاده بكه‌ێ پێویسته بڕێكی یه‌كسان سه‌روه‌ت و پاره دابه‌ش بكه‌ی به‌سه‌ر هه‌مووواندا تا به‌و پاره‌یه بكه‌ونه به‌رهه‌مهێنان، پاش ساڵێك ئه‌نجامه‌كه‌ی چی ئه‌بێت؟ هه‌ندێك به‌و سه‌روه‌ت و پاره‌یه موڵكێكی زۆری پێكه‌وه‌ناوه هه‌ندێ له‌و كه‌مترو هه‌ندێكیش هه‌ژار كه‌وتووه‌و هه‌یشه ئیفلاسی كردووه.. با بڵێین بۆ جاری دووه‌م سه‌رله‌نوێ یه‌كسانییه‌كه دروست بكه‌ینه‌وه‌و ئه‌وه‌ی زیاده‌ی په‌یداكردووه لێی بسه‌نینه‌وه‌و دابه‌شی بكه‌ینه‌وه به‌سه‌ر ئه‌وانه‌دا كه پاره‌كانیان كه‌می كردووه یان نه‌ماوه، پاش ساڵێكی تر بزانین ئه‌نجامه‌كه‌ی چی ئه‌بێت، سه‌یر ئه‌كه‌ین ئه‌وانه‌ش كه ساڵی پار ڕه‌نجیان كێشاوه، ئه‌مانیش ده‌ستیان داوه‌ته بێ موبالاتی و پاڵیان لێداوه‌ته‌وه به‌رهه‌مهێنان تووشی (عجز) بووه، ئه‌وه بۆ چی؟ چونكه له‌لایه‌ك پێویستی مرۆڤه‌كان وه‌ك یه‌ك نییه تاوه‌ك یه‌ك پاره‌و ئیمكانیاتیان پێ بدرێ، له‌لایه‌كیش توانای ئیشكردن و به‌رهه‌مهێنانی مرۆڤه‌كان و توانا (عه‌قڵی) و (جه‌سته‌یی)یه‌كانیشیان وه‌ك یه‌ك نییه، له لایه‌كی تریشه‌وه (طموح) و (نه‌خشه‌ی داهاتوو)ی مرۆڤه‌كانیش وه‌ك یه‌ك نییه، جا بۆیه (یه‌كسانی ته‌واو) چۆن مه‌حاڵه‌و هه‌رگیز دروست ناكرێ، هه‌وڵدان بۆ ئه‌و شته‌ش جگه له‌وه‌ی چاندنی تۆوی بێ موبالاتی و پاڵدانه‌وه‌و وه‌ستانی گه‌شه‌ی مه‌ده‌نیه‌ته، سه‌لماندنی بنه‌مایه‌كی سته‌م ئامێزیشه‌و به مرۆڤ قه‌بوڵ ناكرێ..**

**كه‌س نه‌ڵێ (زه‌كات)یش وه‌ك ئه‌مه‌ی سه‌ره‌وه‌یه‌و جیاوازییان نییه، چونكه فه‌لسه‌فه‌ی زه‌كات زۆر جیاوازه له‌م بنه‌مای (یه‌كسانی ته‌واو)ه.**

---

[1] هه‌ندێ كه‌سانی (چه‌پ مه‌شره‌ب) بۆ له‌كه‌داركردنی ئه‌م بنه‌ما ئیسلامییه ئه‌ڵێن: ئه‌وه مه‌بده‌ئێكی عه‌ره‌بی به‌عسییه بۆیه ئه‌مه‌ش ئه‌ڵێ تاك كه‌س پێی ئه‌ڵێ: (من أين لك هذا) به ئاره‌زووی خۆی سه‌روه‌ت و سامان كۆ بكاته‌وه، هه‌شه به‌توانجه‌وه، كه ئه‌ڵێی پێی: (من أين لك هذا) ئه‌یكاته شۆخی و ئه‌ڵێ (مِن) حه‌رفی جه‌رره‌یه‌و (أين)ه‌ی پێوه مه‌جروره!!

[2] له كیتێبی (ده‌وڵه‌تی خیلافه‌ت بوژانه‌وه‌ی كۆمه‌ڵگه‌و گه‌شه‌سه‌ندنی شارستانییه‌ت) به درێژی باسی فه‌لسه‌فه‌ی زه‌كاتدانمان كردووه له (بیست خاڵدا).

[3] العبادة في الاسلام/ د. يوسف القرضاوي.

١. زەکات وەزیفەیەکی شەرعییەو دەروونەکان کەمەندکێش ئەبن بۆی‌و جۆرێك لە (خۆشی)و (چێژ لێ بردن) ئەبینین لێی، چونکە خاوەنەکەی وا ئەزانێ بەو کارە خوا لە خۆی ڕازی ئەکات‌و زۆری کەسی لەسەر نییەو ئەم بە دڵ دەری ئەکات.

٢. ئەو بڕە ساڵانە (٢,٥٪) بڕێکی زۆر نییەو کاریگەرییەکی وا لەسەروەت‌و سامانی کەسی دەوڵەمەند ناکات..

٣. زەکات وەك دانی قەرزێکە بەخوای گەورەو مرۆڤی زەکاتدەر چاوەڕوانی ئەوە ئەکات لە قیامەتدا زیاد لەو بڕە زەکاتەی ئەیدات وەربگرێتەوە، بۆیە نەك چاوی لە شوێنی نابێت بەڵکو چاوەڕوان ئەکات بە چەند قاتەوە کەڵکی بگرێت لە قیامەتدا.

٤. زەکاتدان پەیوەندی (خۆشەویستی)و (یەکتر ویستن) لە نێوان دەوڵەمەندو هەژاردا زیاد ئەکات، بە پێچەوانەی ئەوەی تر کە پەیوەندی نێوان هەژارو دەوڵەمەند ئەبێتە پەیوەندییەکی (کینە)و (خۆ خواردنەوە) بۆ یەکتری.. لە زەکاتداندا هەژار هەمیشە دەم بە دوعایە کە خوا پارەی زیاترو زیاتر بداتە دەوڵەمەندەکان‌و دەوڵەمەندەکانیش بەوچاوە سەیری هەژاران ئەکەن کە هۆی خێرن بۆ ئەمان‌و هەژاران نەبێ ئەمان چۆن ئەو خێرەیان دەست بکەوێت، بەڵام لە باری دووهەمدا ئەم چەمکانە هیچیان بوونیان نییەو دەوڵەمەند هەژار بە بار ئەزانێ بەسەر خۆیەوەو بە هەموو جۆرێ خۆی ئەدزێتەوە لەوەی پارەی عارەقی ناوچاوانی هەروا بە بەلاش بداتە خەڵکی تر بۆیە ڕق لە هەژاران هەڵدەگرێ، با هەموو ئەمانە ناو بنێین خاڵی یەك..

خاڵی دووەم" جیاوازییەکی تر لە نێوان ئیسلام‌و سەرمایەداری‌و سۆسیالیزمی‌دا هەیە لەم مەسەلەی موڵکایەتیدا، ئەویش جۆرری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە.. لە سۆسیالیزمیدا بە زۆرە ملێ پارە لە دەوڵەمەند ئەسەنرێ‌و ناهێڵرێ هەژار لە بندەسیدا بمێنێ.. لە سەرمایەداریدا دەوڵەمەند لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێ با چەند هەژاریش لە بن دەستیدا بمرێ.

بەڵام لە ئیسلامدا یاسای تەواوو تێرو تەسەل بۆ ئەمە دائەنرێ:

. مافەکانی دراوسێو دراوسێیەتی دیاری ئەکرێت.

. مافەکانی هەژاران دیاری ئەکرێ.

. پاداشت لە سەر هاوکاری (هەژار)و (دراوسێ) و(خزمان) دائەنرێ.

. زەکات فەرز ئەکرێ‌و فەلسەفەکەشی بە دەوڵەمەندو هەژارانیش ئەوترێ کە وەك لە ناوەکەوە دەرئەکەوێ دوو مەبەستی گەورەی هەیە:

١. پاککردنەوەی ماڵ‌و نەفس.

٢. گەشەکردنی ماڵ‌و نەفس[1].

جا ئەوکاتە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی سۆسیالیزمی ئەبێتە پەیوەندی ڕق‌و خۆخواردنەوەو خۆ دزینەوەو پارە شاردنەوە.. پەیوەندی کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵگەی سەرمایەداریش ئەبێتە لەیەك پچڕان‌و بێ سۆزی‌و یەکتر خواردن، دەوڵەمەند بە هەموو شێوەیەك هەژاران ئەخۆن‌و بۆ مەرامو بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریان دەهێنن..

بەڵام پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا لە سایەی یاساو ڕێنماییە هەمەلایەنەکانی ئیسلامدا ئەبێتە پەیوەندی بەردەوامو سۆزو ڕێزیش باڵ ئەکێشێ بەسەریدا.

ئیسلام سەلامکردنێك، دەستگوشینێك، سەردانی کردنێك، تەنانەت زەردەخەنەیەکیش لە بەرانبەر هەژارێکدا بە خێرو چاکە ئەزانێ، بە خشینی لوقمەیەك، لەتێ خورما، تاکە نانێك، دیناری.. بە قەڵغان ئەزانێ بۆ ئاگری جەهەننەم.

[1] وشەی (زەکات) لە زمانی عەرەبیدا دوو مانای هەیە: زکی: ای طهر وزکی: ای نما: المنجد، ماددەی (زکی).

پێغەمبەر ﷺ لە دەیان فەرموودەدا ئەم مەبەستانە دەردەبڕێ:

. ئەفەرموێ: (على كل مسلم صدقة، قالوا فان لم يجد؟ قال: فيعمل بيده فينفع نفسه، ويتصدق، قالوا: فان لم يستطع؟ قال يعين ذا الحاجة الملهوف، قالوا: افأن لم يفعل، فال فيامر بالخير. قالوا: فان لم يفعل، قال: فليمسك عن الشر، فأنه له صدقة) متفق عليه: رياض الصالحين: ص٧٨.

. ئەفەرموێ: (لاتحقرن من المعروف شيئا ولوا أن تلقى أخاك بوجه طلق ولو أن تفرغ دلوك في أناء المستقي)، رواه البخاري، في الادب المفرد. رقم (٣٠٤).

. ئەفەرموێ: (لاتحقرن جارة لجارتها ولو فرسن شاة) متفق عليه، رياض الصالحين، ص ٧٤.

. ئەفەرموێ: (افضل الصدقة اصلاح ذات المبين) رواه البزار مجمع الزوائد/ الهيتمي (٨/٨٠).

. ئەفەرموێ: (الساعي على الارملة والمسكين كالمجهاد في سبيل الله)، متفق عليه، رياض الصالحين، ص١١٧.

. ئەفەرموێ: (من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته). رياض الصالحين، ص١١٠ والحديث متفق عليه.

. ئەفەرموێ: (خير الأصحاب عندالله خيرهم لصاحبه، وخير الجيران عندالله خيرهم لجاره). رواه الترمذي، رياض الصالحين، ص ١٢٨.

. ئەفەرموێ: (من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة)، رواه مسلم رقم ٢٦٩٩.

. ئەفەرموێ: (من يسر على معسر يسرالله عليه في الدنيا والاخرة) رواه مسلم/ رقم ٢٦٩٩.

. ئەفەرموێ: (اتقوا النار ولو بشق تمرة) متفق عليه، رياض الصالحين، ص٧٧.

. ئەفەرموێ: (والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه) رواه مسلم رقم (٢٦٩٩).

. ئەفەرموێ: (من صنع اليكم معروفا فكا فئوه، فان لم تجدوا ماتكافئونه به فادعوا له حتى تروا أنكم كافأتموه)، رواه النسائي.

. ئەفەرموێ: (يا ابن آدم انك تبذل الفضل خير لك، وان تمسكه شر لك، ولا تلام على كفاف، وابدأ بمن تعول، واليد العليا خير من اليد السفلى)، رواه مسلم (رياض الصالحين) ص ١٩٦.

. ئەفەرموێ: (ما من يوم يصبح العباد فيه الا ملكان ينزلان فيقول أحدهما اللهم أعط منفقا خلفا ويقول الاخر اللهم أعط ممسكا تلفا)، متفق عليه (رياض الصالحين) ص١٩٦.

. ئەفەرموێ: (لاتحقرن من المعروف شيئا، ولو أن تعطى صلة الحبل، ولو أن تعطي شسع النعل، ولو أن تفرغ من دلوك في اناء المستسقي، ولو أن تنحي الشيء من طريق الناس، فيؤذيهم، ولو أن تلقى اخاك ووجهك اليه مذطلق، ولو أن تلقى أخاك فتسلَّم عليه، ولو أن تؤنس الوحشان في الأرض)، رواه أحمد في المسند (٣/٣٤٤).

ئیسلام بەو شێوەیە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهێز ئەکات و پیرۆزییان ئەداتێ

باسی دووهەم: (فەدەك) و میراتی پێغەمبەر ﷺ

. (میر فطروس) ئەڵێ: "(فدك) دێیەك و دارستانێکی زۆر گەورەبوو کە کێڵگەکەی بە خێرو بێری بەریزی هەبوو چەند کیلۆمەترێك لە مەدینەوە دوور بوو، پێغەمبەری ئیسلام پاش شەڕو شکانی "فدك" ئەو زەوییەی بەکچەکەی. واتە فاتیمە . بەخشی.. زۆر لە سەربازو سوپاییەکانی موحەممەد دژی ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺ وەستان و ویستیان بەپێی فەرمانی قورئان سورەتی "ئەنفال" ئایەتی (٤ . ٤٩) موحەممەد "فدك" وەك دەستکەوت و غەنیمەتی شەڕ لە نێوانیاندا دابەش بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ملی بۆ کەچ نەکردن و هەمووی وەك (موڵکی تایبەتی) دایە کچەکەی هەر ئەوەندەی موحەممەد کۆچی دوایی کردوو (ئەبوبەکری صدیق) جێگای گرتەوە، فەرمانیدا کە جوتیارو کرێکارەکانی کچی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو زەوی و زارو دارستانی خورمایە دەربکەن و

خۆی بە ناوی خەلیفەی موسڵمانانەوە دەستی بەسەردا گرت"[1]. هەروەها ئەڵێ: "حەزرەتی موحەممەد وەك گەورە موڵکدارێك بێجگە لە (فدك) خاوەنی دێو زەوی‌و زارێکی فراوان بوو، وەك ئەو زەوی‌و زارانەی کە لە خوارەوە ناویان دێنین:

١. برقە، ٢. دلال، ٣. أعوان، ٤. صافیە، ٥. حثیب، ٦. حسنا، ٧. وطیح، ٨. مشربە ام ابراهیم، ٩. سلاسم.. بەڵام پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەو زەوی‌و زارو موڵکە تایبەتییەی هەیبوو، ڕاستەوخۆ لەلایەن (ئەبوبەکری صدیق)ەوە دەستی بەسەردا گیراو زەوت کرا"[2]. بە قسەی خۆی زانیاری یەکەمیانی لە (تاریخ سیاسی الاسلام، ل ٤٢ و ناسخ التواریخ: ب ٦٢/٨ . ٦٧. وەرگرتووەو زانیاری دووهەمیشی لە (ألاموال) قاسم بن سلام ل ٧و وفاء الوفاء ل ١٥٢ . ١٣٦!! وەرگرتووە)، ئەو زانیارییانەی لە هەرکوێ وەگرتووە خۆی‌و دەستپاکی‌و دەستپیسی خۆی، بەڵام ئەو مەسەلەیە هیچی وا نییەو مێژووی ڕاستەقینە وا ناڵێ‌و یەك بڕگەی ئەو زانیارییانە ڕاست نین..

جارێ ئەمە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی دنیایی نەبووەو خەریکی موڵك پێکەوەنان بێت‌و وەك ئەم کابرا بێ حەیایە ئەڵێ: "موحەممەد وەك گەورە موڵکدارێك" هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە مرد بە شایەتی هەموو مێژوونووسان هیچی لەدوای خۆی جێ نەهێشت! ئیمامی بوخاری بە سەنەدی خۆی ئەفەرموێت: "ما ترك رسول الله ﷺ دینارا ولا درهما ولا عبدا أولا أمة الا بغلته البیضاء التي یربها وسلاحه وارض جعلها لأبن السبیل صدقة"[3]. هەروەها ئیمامی موسلیم ئەفەرموێت: "ما ترك رسول الله ﷺ دینارا ولا درهما ولا شاه ولا بعیراً ولا أوصی بشئ"[4]. نەك هەر ئەوە بەڵکو چ ئیمامی بوخاری‌و چ ئیمامی موسلیم هەردوکیان ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ کە مرد قەرزاری جوولەکەیەك بوو: (ان رسول الله ﷺ اشتری طعاما من یهودي الی أجل ورهنه درعا من حدید)[5]، بوخاری ڕونتر ئەفەرموێ: "توفي رسول الله ﷺ ودرعه مرهونة عند یهودي بثلاثین"[6].

مەسەلەی زەوی (فدك) زەوی دەوڵەت بووە، پێغەمبەر ﷺ وەك سەرۆکی ئەو دەوڵەتە مافی ئەوەی هەبووە بەکاری بهێنێ، چونکە زەوی (فيئ) بووە.. تەنانەت موحەممەد حسنین هیکل ئەڵێ: "کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد فاتیمە هاتە لای ئەبوبەکر کە بڕیاری ئەوەی بۆ بدات، زەوییەکەی (فەدەك)و خەریبەری بە ڕەسمی بداتێ.. ئەبوبەکر فەرمووی: ئاخر پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (نحن معاشر الانبیاء لانورث ما ترکناه صدقة)، جا ئەگەر پێغەمبەریش ﷺ لە ژیاندا ئەو زەوییەی پێ دابی‌و بوبێتە موڵکی تۆ ئەوە من قسەی تۆ سەنەدە لام‌و ئەوەی پیغەمبەری خوا فەرمانی پێکردبێ جێبەجێی دەکەین، فاتیمە وتی: ئەلهەق باوکم هیچی نەداومەتێ لە ژیاندا، بەڵام (ام أیمن) ئەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ مەبەستی بووە زەوی (فەدەك) بکا بە هی تۆ.. ئیتر ئەبوبەکر زەوییەکەی (فدك)و ئەوەی خەیبەریشی خستەوە سەر زەوییەکانی (بیت المال)"[7]. شیعە توندڕەوەکان ئەڵێن: "لێقەومانی گەورەو نەگبەتی زل ئەوەیە کە ئەبوبەکر و عومەر (فەدەك)یان داگیر کرد لە ئالوبەیتی پێغەمبەر ﷺ". ئەم کێشە گەورەیەش ئەوەیە کە کاتێك ئەبوبەکر خیلافەتی لە (امیر المؤمنین) ئیمامی عەلی داگیر کردو هات بەزۆریش بەیعەتی لە ئەنصارو موهاجیر وەرگرت‌و حوکمەکەی توندو تۆڵ کردەوە، چاوی بڕییە (فدك) لە ترسی ئەوەی نەك بکەوێتە دەستی (ئالوبەیت)و بە

[1] ئیسلامناسی، ل ٤٥ . ٤٦.

[2] ئیسلامناسی، ل٤٦.

[3] البدایة والنهایة (٣٠٦/٥ . ٣٠٧).

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[5] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[7] حیاة محمد هیکل، ص٥١٤.

پارە هەموو خەڵك ڕابكێشن بەلای خۆیانداو دەوری ئەو ستەمكارانە (مەبەستی ئەبوبەكرو ئەصحابەكانە) چۆڵ بكەن، بۆیە مەبەستی بوو ئیفلاسیان بكاتو هیچیان بە دەستەوە نەهێڵێو خەڵك ڕوو نەكاتە ئەمانو خیلافەتە درۆینەكەی ئەوان بەتاڵ بێتەوە، لەبەر ئەم مەبەستەبوو هاتن ئەم ڕیوایەتە درۆیەیان بەدەم پێغەمبەرەوە خستە ناو گوایە وتوویەتی: (نحن معاشر الانبیاء لانورث ماتركناه صدقة)"[1].

لەكاتێكدا هەر شیعە خۆیانو لە سەرچاوەی متمانەداریاندا ئەڵێن: "ان العلماء ورثة الانبیاء وان الأنبیاء لم یورثوا دینارا ولا درهما ولكن ورثوا العلم فمن اخذ منه أخذ بحظ وافر"[2]. (ابن كثیر) لە (البدایة والنهایة) (٣١٣/٦) ئەڵێ: "سوپاس بۆ خوا هەرچی لە فزەكانو ڕێگەكانی ئەم فەرمووده[*] هەیە هەرهەموویم لە دوور بەرگی گەورەدا كۆكردۆتەوە كە لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت كراوە، بە فقهێكی ڕاستو زۆر بە كەڵكی ئەزانمو بەپێی بابەتەكانی كتێبە فقهییەكانی ئەمڕۆش كتێبەكەم داناوەو كورتەكەی ئەوەیە كە فاتمە كاتێك داوای بەشە میراتی خۆی كرد لە (فدك)دا، ئەبوبەكر ئەو قسەیەی پێغەمبەری بۆ كردو ئەویش ملكەچ بوو، هەر ئەوەش چاوەڕوان ئەكرا لێی (ڕەزای خوای لێبێت)"، هەموو ئەو ناوە زۆرانەش كە (میر فطروس) هێناونی گوایە موڵكی شەخصی پێغەمبەر ﷺ بوون من تەنیا لە كتێبێكی شیعەمەزهەبەكاندا بینیومە من ئەگەر واش بوبێ ئەوە موڵكی دەوڵەت بووە نەك شەخصی.

باسی سێیەم: شێوەكانی موڵكداری لە ئیسلامدا

* (میر فطروس) ئەڵێ: "زەویو زاری (خاصە) (صوافي) بریتیبوو لەو زەوییانەی كە بەپێی (سورەتی (حشر) ئایەتی (٦و ٧)و سورەتی (أنفال) ئایەتی (٤) لە شەڕەكاندا دەبووە بەشی پێغەمبەرو جێگرەكانی.."[3].

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١. پێغەمبەر ﷺ جێگری نەبووە لە ژیانداو لە پاش مردنیشی كەس نەبووەتە جێگری، كە وتراویشە (خەلیفەی پێغەمبر ﷺ) مەبەست پێی جێگری پێغەمبەر نەبووە، بەو مانایەی (میر فطروس) بەكاری دەهێنێو لای خەڵك هەبووە كە دەسەڵاتی بنەڕەت بگوازرێتەوە بۆ جێگرەكەی، چونكە بە هیچ شێوەیەك دەسەڵاتی پێغەمبەرایەتی ناگوازرێتەوە بۆ كەس[4].

٢. ئەو (خمس)ەی (میر فطروس) باسی ئەكات گوایە ئایەتی (٦و ٧)ی (حەشر)و (٤)ی (أنفال) باسی كردووە، بەو شێوەیە نییە كە ئەو بۆی چووەو لەیەك دوو لاوە لێی تێكەل بووە، ئەوەی سورەتی (الحشر) ئەفەرموێ: (وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ* مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) (الحشر : ٦ ـ ٧).

واتە: ئەو (فەیئە)ی خوای گەورەی دای بە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی كافران بەبێ ئەوەی سواری ئەسپو هوشتر بنو بەشەڕ بیگرن، بەڵكو خوای گەورە ئەیەوێت پێغەمبەرانی سەربخات بەسەر هەركەسێكدا كە ئەوێتو خواش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە* ئەو (فەیئە)ی خوا ئەینێرێت بۆ پێغەمبەرەكەی لە خەڵكی وڵاتانەوە ئەوە

---

[1] (حق الیقین) الملا باقر المجلسي، پەراوێزی (الشیعة وأهل البیت) احسان الهي ظهیر، ص٨٦.

[2] الاصول من الكافي/ كتاب فضل العلم/ باب ثواب العالم والمتعلم، (٣٤/١).

* مەبەستی (نحن معاشر الانبیاءلانورث ماتركناه صدقة)یە.

[3] ئیسلامناسی (ل ٤٧).

[4] گروپە لادەرەكان (الفرقة الضالة) وشیعەمەزهەبەكان بروایان وایە كە (نبی) هەیەو (وصی) هەیە، (وصی) دەسەڵاتی (نبی) بۆ نقل ئەبێت، بەڵام ئەوە ڕایەكی نادروستەو پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە.

ئەبێتە شتێکی تایبەت بەخواو پێغەمبەری خواو بێ باوکان‌و هەژاران‌و ڕێبوارانی بێ نەوا، ئەمەش بۆ ئەوەی سەروەت‌و سامان تەنیا لە نێوان دەوڵەمەندەکاندا ئەم دەست‌و ئەو دەست نەکات، ئەوەشی پێغەمبەری خوا بۆی دانان لێی وەربگرن‌و ئەوەشی ئەو لێی قەدەغە کردن ئێوەش لێی دوور بکەونەوەو خۆتان لە (سزاو عادزی) خوا بپارێزن، بە دڵنیاییەوە خوا سزای زۆر سەختە.

ئەم سێ ئایەتە (تەواوکەرێکی تریشی) هەیە، کە سێ ئایەتی ترەو بە دوایدا ئەفەرموێت: (لِلْفُقَرَاء الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ) (الحشر: ٨)، هەروەها (وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلّاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (الحشر: ١٠).

واتە: ئەو (فەیئە) ئەبێتە شتێکی تایبەت بە ئەم سێ توێژەی تریش کە سێ ئایەتەکە باسیان ئەکات.

. هەژارە کۆچەرەکان – پشتیوانانی ڕاستگۆ – هەموو ئەو ئیماندارانەی کە بەڕێزەوە سەیری پێشینان دەکەن و شوێنیان دەکەون‌و دوعای خێریان بۆ دەکەن[1].

کەواتە ماڵی (فەیئ): ئەو ماڵەیە کە بەبێ شەڕ دەستی موسڵمانان ئەکەوێت وەك چۆن ماڵی (بەنو نضیر) دەست موسڵمانان کەوت بەبێ شەڕ، ئەمەش جیایە لە ماڵی (غەنیمە).. بەڵام دیارە (میر فطروس) هەر بە یەك شتیان ئەزانی و لەمە ئاگادار نییەو نایزانێ.

فەلسەفەی ئەوەش کە ئەم جۆرە ماڵە تایبەت کراوە بە (پێغەمبەرەوە ﷺ) ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە دادو (یەکسانی نزیك) دابەشی ئەکات بەسەر خەڵکی خاوەن مافداو پارەو پول تەنیا لای دەوڵەمەندەکان کەڵەکە نابێت، فەلسەفەی ئەوەش خزمانی پێغەمبەر ﷺ ناویان براوە لەم ماڵەداو پشکیان بۆ دانراوە هۆکەی ئەوەیە کە خزمانی پێغەمبەر ﷺ زەکاتیان پێ ناشێ‌و لێیان حەرامە، بۆیە لێرەدا مافیان بۆ دیاری کراوە وەك هەموو هاووڵاتییەکی تر.

٣. مەسەلەی (غەنیمەت)یش: بریتییە لەو ماڵەی کە لەکاتی شەڕدا ئەگیرێ‌و ئەوە لەم (فەیئە) جیایەو چۆنێتی دابەشکردنەکەشی هەر جیایەو خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ ..) (الأنفال: ٤١).

واتە: ئەوە بزانن کە ئەو غەنیمەتەی لە هەر شتێك دەستتان ئەکەوێ بە دڵنیاییەوە (پێنجیەکی) تایبەتە بە خواو بە پێغەمبەری خواو خزمانی پێغەمبەر ﷺو بێ باوکان‌و هەژاران..

کەواتە ئەویان (ماڵی فەیئەکە) هەمووی تایبەتە بەو کەسانەوە کە باسکراون بەڵام ئەمەی تریان (ماڵی غەنیمەت) تەنیا (پێنجیەکی) تایبەتە بەوانەوە کە ناویان براوە.

٤. ئەم (پێنجیەکە) نابێتە موڵك‌و میراتی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ تا لەژیاندا بێت بۆی هەیە بڕیاری تێدا بدات، کە مردیش هەمووی ئەچێتە (بیت المال)و ئەبێتەوە ماڵی گشتی.. کەواتە ئەو ماڵە نە ئەبێتە موڵکی پێغەمبەر ﷺو لە دوایدا بە میراتی (ئەصحابی فروض) بیبەن لە خزمەکانی، نە ئەشبێتە موڵکی خەلیفەکان لەدوای خۆی کە (میر فطروس) بە پێچەوانەی ئەمەوە تێگەیشتووە.

٥. ئەو پشکەی (ذوي القربی) لەم ڕۆژانەشدا بەپێی قسەی زانایان ئێستا ئەویش هەر ئەچێتەوە (بیت المال)و نادرێتە کەسانی تر کە دڵنیایی نییە لەوەدا ئایا (ذوی القربی)ن یان نا، بەڵکو ئەسپ‌و چەکی پێ ئەکرێ بۆ دەوڵەت[2].

---

[1] هەندی لە زانایان لەوانە (ئیمام مالك) ئەڵێن: ئەو کەسانەی قسە بە صەحابەو تابعین بڵێن بەشیان نییە لەم (فەیئە)دا، چونکە ئایەتەکە نایانگرێتەوە. (مختصر .. ابن کثیر/ علی الصابري) (٣/٤٧٥).

[2] الاسلام/ سعید حوی/ ص ٤٧٠.

له سەروو ئەمانەشەوە حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) لەو پێنج ئایەتەی سورەتی (الحشر) چەند چەمکێکی وردو جوانی وەرگرتووە، خراپ نییە ئاماژە بۆ هەندێکی بکەین:

أ . ئەم ماڵی (فەیئە) ئەبێت هەتا دونیا دونیایە بەشی نەوە داهاتووەکانی تێدا بێتو تاپۆ نەکرێت لەسەر کەسانێکی تایبەت، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ)، واتە: پشکی ئەوانەشی تێدایە کە لە دواوە دێن (واتە نەوەکانی داهاتوو) ئەم یاسایە تا ئێستاش لە هەندێ شوێندا هەر کاری پێ ئەکرێو زەوییەکانی عێراق زەوی پەیوەستن (عقد) نەك زەوی (تاپۆ).

ب . ئایەتی (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُم) ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە دەوڵەت بۆی هەیە لە کاتی ناهاوسەنگی بێتامدا هاوکێشەکان ڕاست بکاتەوەو سنور بۆ خەڵکی دابنێو باجی پێویست بخاتە سەر دەوڵەمەندەکان تا هاوکێشەکە ڕاست ئەکاتەوەو مەبەستی ئایەتەکە دێتە جێو پارەو سەروەت جارێکی تر ئەشکەوێتە دەستی هەژاران.

٦. زەویو زاریش بە گشتی لە ئیسلامدا وەك شەرعزانی شافیعییەکان (ئیمامی ماوەردی) باسی ئەکات بەم شێوەیە کە لەڕاستیدا (میر فطروس)یش هەندێکی لێ باس کردوون، بەڵام خراپی کردوونو هەندەکەی تریشی فەرامۆش کردووە، ئیتر یان لەبەر نەزانینو بووە یان لەبەر زۆرزانی و نیازپیستی بووە.. (ماوەردی) ئەفەرموێ: "..زەوی بە گشتی ئەبێتە چوار جۆر، یەکەمیان: ئەو زەوییانەی کە موسڵمانان خۆیان زیندووی دەکەنەوەو ئەیکەنە زەوی کشتوکاڵ، ئەمانە زەوی (عوشر)ن بە هیچ شێوەیەك (خەراج)ی ناچێتە سەر. دووەمیان: ئەو زەوییانەی خاوەنیان هەیەو خاوەنەکانیان موسڵمان ئەبنو ئەمانەش زەوی (عوشر)نو دروست نییە (خراج)یان بکەوێتە سەر. سێیەمیان: ئەو زەییانەی کە کافر بە جێیان ئەهێڵێتو ئەکەونە دەستی موسڵمانان. ئەوە سێ ڕای لەسەرە: (شافیعی) ئەفەرموێت: دەوڵەت دابەشی ئەکان بەسەر موسڵماناندا و ئەبێتە زەوی (عوشر)و دروست نییە (خراج)ی بخرێتە سەر، (مالك) ئەفەرموێت: ئەبێتە موڵکی دەوڵەتو ئەبێتە زەوی (خراج)و دروست نییە (عوشر)یان بچێتە سەر. (ئەبوحەنیفە) ئەفەرموێت: دەوڵەتو سەرۆکی وڵات بۆی هەیە کامیان بە بەرژەوەندی بزانێ ئەوە بکات.. چوارەمیان: ئەو زەییانەی کە بە صوڵحو پەیماننامە ئەکەوێتە ژێر دەستی ئیدارەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە ئەوە زەوی تایبەتە بە (خراج)و بەپێی پەیماننامەکە ئەبێت"[1].

(میرفطرۆس) وەك هەندێ لە عەلمانیەکانی کورد ئەیڵێن ئەویش ئەڵێ: "لە ڕاستیدا زۆربەی سورەتو ئایەتەکانی قورئان مانیڤێستی تۆقاندنو ترسو هەڕەشەنو زۆر لە توێژەرەوەکان بە جوانی بۆی چوون، کە دەنووسن گرنگترین هۆی ژیانی ئاینی موسڵمانەکانی چەرخی یەکەمی کۆچی، ترسو تۆقاندن بوو، ترس لە خوای تۆڵەئەستێنو بە توانا، ترس لە مردن، ترس لە ڕۆژی قیامەت ترس لە گوناە، ترس لەو دۆزەخەی کە بە دیمەنی (وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ) دەهێنرایەوە پێشچاو، پشتی شێریشی دەلەرزاند"[2]! دوای ئەوە زۆر دوور دینو بێشەرمانە باسی خوا ئەکاتو ئەڵی: "دیمەنی خوا لە قورئاندا دیمەنی فەرمانڕەواسیەکی ڕەهاو سەرەڕۆی خێڵەکانی سەردەمی (باوك سالاری) پاتریاکی بوو..!!"[3] بەردەوام گاڵتە بە خوا ئەکات (سبحانە وتعالی) و ئەڵێ: "خوا "مکار"ترین "مکار"ە، خوا لەبەر سێوێك یان دەنکە گەنمێك ئادەمو حەوای لەبەهەشت دەرکرد.."،[4] لە

---

[1] الأحكام السلطانية/ الماوردي الشافعي ص١٤٧، (قازی ئەبی فەرائی حەنبەلی)یش لە (الاحكام السلطانية) (ل ١٤٦)دا بە هەمان شێوە زەوی دابەش ئەکات لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا کە ملکەچە بۆ (ئیجتیهاد).

[2] ئیسلامناسی ل٤٩.

[3] ئیسلامناسی ل٥٠.

[4] هەمان سەرچاوەوە لاپەڕە.

وەلامدا ئەڵێین: ئەو پەرەگرافەی سەرەوە سەراپای هەڵەو پەڵەیە بەناو چاوو زەیینی "میرفطرۆس"و "پێڕو تاقمەکەیەوە"..

١. زۆربەی سوورەتو ئایەتەکانی قورئان مانشێتی تۆقاندنو ترسو هەرەشە نین.

٢. ئەو تویژەرەوانەش کە تۆ ئەڵێی (زۆر لە تویژەرەوەکان)، بە جوانی بۆی نەڕۆیشتوون وەك تۆ ئەڵێی (بە جوانی بۆی چوون) چونکە وانییە وەك (دەق) واش نییە وەك (مێژوو) ئیتر ئەم بۆچوونە جوانی لە کوێدایە؟

٣. شەرم نەکردن لە خواش بەو ڕێژە زۆرە مەگەر هەر لای ئەم عەلمانیە نامۆو کینە دارانە هەبێت کە تازە بەتازە لەناو کورددا خەریکە وەك گیاکەڵە سەوز دەبن.

لەئیسلامدا دوو بنەما بۆ پەروەردە کردنی مرۆڤ بە گشتیی هەیە، ئەو مرۆڤە منداڵ بیت یان گەورە. ژن بێت یان پیاو، ئەویش بنەمای (هاندان)و بنەمای (ترساندن)ە. ئەم دووبنەمایەش لەگەڵ ڕوشدو گەشەی فیکری و ڕەوشتی مرۆڤدا ڕاستەوانە ئەوەستێتەوە، واتە تا (هاندان) و (ترساندن) زۆرتر حزوریان ببێت لە پرۆسەی پەروەردەکردنەکەدا ڕوشدە فیکریو ڕەوشتییەکەش زۆرتر ئەبێت، بەکارهێنانی ئەم دوو بنەمایە دوای بەکارهێنانی هەردو بنەمای (گەیاندن) و (تێگەیاندن) دێت، واتە مرۆڤ سەرەتا بنەماو یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلامی پێئەگەیەنرێتو ئەوپەڕی هەوڵیشی لەگەڵدا ئەدرێ تا تێبگات (واتە قەناعەتی پێیان دابمەزرێ) ئەوجا هانئەدرێت بۆ جێبەجێکردنیان و ئەترسێنرێت لەبێ موبالاتی کردن پێیان.. ئەمە چۆن؟ بانموونەیەك باس بکەین:

ئیسلام دێت باسی نوێژ ئەگەیەنێتە مرۆڤو پێی ئەڵێ: نوێژ فەرزە لەسەر مرۆڤ لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە ئەم فەریزەیە دانراوەو ئەمەش فەلسەفەو حیکمەتەکانی نوێژکردنە یەك و دوو سێ و چوار[1] ..کە (مرۆڤ)ەکە لەوە گەیشت کە (نوێژ فەرزە) و (نوێژ بە کەڵکە)[2] ئیتر نۆبەتی ئەوەیە هانی بدەی بۆ نوێژکردن و بیترسێنی لە نوێژنەکردن، بۆ هەموو شتەکانی تریش هەروایە وەك (شایەتمان، ڕۆژوو، زەکات، ڕاستگۆیی، ناپاکی، خۆشویستنو پشتیوانی کردن لە موسڵمانان، جیهاد، خێرکردن،.. هتد ئەوە ڕوانینێك، ڕوانینێکی تریش ئەوەیە ئەم بنەمای (هاندان)و (ترساندن)ە لە عەقڵو بەرنامەی پەروەردەی هەموو کەسو گروپ و حزب و حوکمەتێکدا هەیە.. دەیان هاندانو پاداشت دانراوە بۆ ئەو کەسانەی پێڕەوی لە بەرنامەی ئەو کەسە یان ئەو گروپو حزبو حکومەتە ئەکات، بە بەرانبەریشەوە دەیان ترساندن و سزا دانراوە بۆ کەسێك بێ موبالاتی و پێشلێکاری بکات بۆ ئەو بەرنامە..

دەی ئەمە جێگەی قبوڵی هەموو عەقل و کەسو حزبو حکومەتێك بێت بۆ جێگەی ڕەخنەی (میرفطروس) و پێرەکەیەتی، یان بۆچی بۆ ئەو کەسو حیزبو حکومەتانە دروستو زانستی و پێشکەوتن بێت کە هاندانو سزادان یان هەبێت، بەلام بۆ ئیسلام نادروستو ناجوان بێتو جێگەی ڕەخنە بێت؟

ڕوانینێکی تر بۆ ئەم مەسەلەیە لە ئیسلامدا دروست لە قورئاندا (هاندان و ترساندن بەقەدەر یەك یان نزیك بەیەك بەکارهێنراون بۆ نموونە:

. ووشەی (دونیا) ووشەی (ئاخیرەت) هەریەکەیان (١١٥) جار بەکارهاتوون لە قورئاندا.

. ووشەی (مەلائیکە) وشەی (شیاطین) هەریەکەیان (٨٧٨) جار بەکارهاتوون لە قورئاندا.

---

[1] بۆ نموونە پێغەمبەر (سەلامی خوای لیّ بێت) ئەفەرموێت: "أرأیتم لو ان نهرا بباب أحدکم یغتسل منه کل یوم خمس مرات، هل یبقی من درنه شيء؟ قالوا: لایبقی من درنه شيء، قال: فذلك مثل الصلوات الخمس، یمحوا الله بهن الخطایا". (متفق علیه). (ریاض الصالحین، الذووي ، ص٣١٩، باب فضل الصلوات). هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: "إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ".

[2] تێگەیشتن لە فەرزبونو بەکەڵکبوونی یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلام دوو توخمی سەرەکین لە گەیاندنی ئیسلامدا، خوای گەورە ئەفەرموێت (اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ) بچن بەدەم خواو پێغەمبەری خواوە کە بانگتان ئەکات بۆ شتێك (ژیان)ی تێدایە بۆ ئێوەو زیندوو ێییتان پێئەبەحشێ.

. ووشەی (الموت) ووشەی (الحياة) هەریەکەیان (١٤٥) جار بە کارهاتوون لە قورئاندا، ئەی مەگەر هەر (ژیان) نییە (مردن)ی بەدوادا دێت.

. ووشەی (السيئات)و وشەی (الحسنات) بە لێوەرگیراوەکانییەوە (١٦٧) جار هەریەکەیان بەکارهاتووە.

. ووشەی (الکفر) ووووشەی (الأيمان) یەکی (١٧) جار بەکارهاتوون.

. ووشەی (الناس) ووشەی (الرسل)یەکی (٢٤١) جار بەکارهاتوون ئەی مەگەر پێغەمبەران بۆ سەر مرۆڤەکان نایەن؟![1]

ڕوانینێکی تریش ئەوەیە، خوا هیچ پێویستییەکی بەوەنییە (عبد) لێی بترسێ یان لێی نەترسێ، ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانە تەنیا بۆ ڕاگرتنی ژیان و بەرەوپێشبردنی مرۆڤەکانە بەرەو (تەکامول) ئەگەرنا مرۆڤ چی پێئەکرێ ئەگەر لە خوا نەترسێ؟ یان لێی یاخی ببێت، یان دژایەتی بکات و خۆی لێبگۆڕی، دەی ئیتر کوا لێکۆڵینەوەی ووردو جوان کە قورئان و سوورەتەکانی مانشێتی تۆقاندن و ترساندنن. شوورەیی نییە مرۆڤ چیۆ لە تاریکی بوەشێنێ؟ شوورەیی نییە درۆو بوختان بەدەم خەڵکەوە بکەی نەخوازەڵا بەدەم خوا پێغەمبەرو دینەوە.

یان شوورەیی نییە گاڵتە بە خوا بکات و بڵێ: خوا واو خوا ئەمە، ئاخر وەك (ئەبوبەکری صدیق) (ڕەزای خوای لێ بێ) نووسی بۆ کیسرای پاشای ساسانییەکان و فەرمووی: "یا کسری اتتکبر علی الله؟ کیف تتکبر علی الله وأنت الذي نزلت في مجری البول مرتين" کیسرا! ئەڵێی خۆت بەسەر خوادا هەڵدەکێشی، چۆن خۆت بەسەر خوادا هەڵدەکێشی کە تۆ (نەك جارێ) بەڵکو دووجار بە جۆگە و شوینی میزکردندا هاتویتەتە خوارەوە، ئەی ئێمە چی بڵێین بەم (میرە) یاخی و سەرلێشێواوە؟ بەڕاستی وایە، ئەوە لە پێستی خۆ دەرچوونە کەسێك لە خوا یاخی بێت لە کاتێکدا کە هەڵگری تەنەکەیەك پیسییە، لە دڵۆپێك ئاوی قێزەون دروستکراوە کە شەرم ئەیگرێ بە جلەکانیەوە بێت و لەمەجلیسدا پێوەی دابنشیێ، بەڵام هەر حەدیسەکەیە کە ئەفەرموێ: "اذا لم تستح فاصنع ماشئت".[2]

لەگەڵ ئەوەشدا هەربا ئەگەر بە ئاماژەی کورتیش بووە باسی خوا بکەین لە قورئاندا تا بزانین بەو شێوەیەیە کە (میرفطروس)و (شوان)و (سیامەك)و (مەزدەك) ئەیڵێن یان تەواو پێچەوانەی ئەوەیە: خوای گەورە ئەفەرمووێ: "قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ". (الزمر: ٥٣).

. ئەفەرمووێ: "نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ * وَ أَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمَ".

. ئەفەرموێ: "قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَنُ مَدّاً".

. ئەفەرموێ: "لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ". "لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ". "فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ". "إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ".

. ئەفەرموێ: (أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحاً أَن كُنتُمْ قَوْماً مُّسْرِفِينَ) (الزخرف: ٥).

. لە حەدیسی قودسیدا ئەفەرموێت: "عبدي أطعتنا فقربناك وعصيتنا فأمهلناك ولوعدت الينا بعد ذلك قبلناك، أني والأنس والجن في بنأ عظيم، أخلق ويعبد غيري، وارزق ويشكر سواي، خير الي العباد نازل وشرهم الي صاعد، أتحبب اليهم بنعمتي وأنا الغني عنهم ويتبغضون الى بالمعاصي وهم أفقر شيء الي، أهل ذكري أهل مجالستي، أهل شكري أهل زيادتي أهل طاعتي أهل محبتي، أهل معصيتي لا اقنطهم من رحمتى، أن تابوا الي فأنا أحبهم أحب التوابين وأحب المتطهرين، وان لم يتوبوا فأنا طبيبهم ابتليهم بالمصائب، لأطهرهم من الذنوب والمعايب وانا أرحم بعبادي من الام بولودها"[3]

---

[1] التعبير القرآني/ د. فاضل السامرائي / ص١٤.

[2] باسی پلەی ئەم فەرمودەیەمان کردووە لە پێشەوە.

[3] إبن تيمية لە (منهاج السنة): (٥/٢١٠) بەشێك لە ئەم (أثر)ە باس ئەکات.

واته: ئەی عەبدەکەم! تا گوێڕایەڵیت ئەکردین لە خۆمانمان نزیك ئەکردیتەوە، کە دەستیشت دایە گوناهکردن مۆڵەتمان پیێ دایو لێت گەڕاین، ئەگەر دوای ئەو گوناهانەش بگەڕێیتەوە بۆ لامان هەر قەبووڵت ئەکەین، منو مرۆڤو پەری لەناو دەنگوباسێکی گەورەداین، من ئەیانخولقێنم کەچی ئەوان عەبدایەتی جگە لە من ئەکەن، من رزقیان ئەدەم کەچی ئەوان سوپاسی جگە لە من ئەکەن! خێروبێرم بۆ عەبدەکانم دێتەخوارەوە کەچی ئەوان شەڕو خراپەیان بۆمن دێتە سەرەوە، خۆمیان لا خۆشەویست ئەکەم بەو هەمووە رۆزیەی پێیان ئەدەم . کە من هیچ پێویستیشم بەوان نییە . کەچی ئەوان من عادز ئەکەن لە خۆیان بەو هەمووە گوناهەی ئەیکەن . لە کاتێکدا ئەوان پێویستی زۆریان بە من هەیە . ، ئەوانەی سەرقاڵی یادکردنی منن شایەنی ئەوەن لە مەجلیسی مندابن، ئەوانەی سوپاسی من دەکەن شایەنی ئەوەن زیاتر بڕژم بەسەریاندا ئەوانەی عیبادەتی من ئەکەن شایەنی ئەوەن خۆشەویستی من بن، ئەوانەی بێگوێی من دەکەن بێهیوایان ناکەم لە رەحمەتو سۆزی خۆم، ئەگەر (لە کۆتاییدا) گەرانەوە ئەوە خۆشم ئەوێن، کەسی تۆبەکارو پاکم خۆش ئەوێت، ئەگەر تۆبەش نەکەن ئەوە من ئەبم بە دکتۆریان، توشی لێقەومانو موسیبەتیان ئەکەم تا پاك ئەبنەوە لە شورەییو گوناهەکانیان، (بەدڵنیاییەوە) من بەرانبەر عەبدەکانم بە میهرو بەرەحمترم لە دایکێك بەرانبەر بە منداڵەکەی"!!.

. هەروەها لە حەدیسی قودسی تردا ئەفەرمووێ: "یاعبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرما فلا تظالموا، ياعبادي كلكم ضال إلا من هديته فاستهدوني أهدكم، ياعبادي كلكم جائع الا من أطعمته فاستطعموني أطعمكم، ياعبادي كلكم عار الا من كسوته فاستكسوني أكسكم، ياعبادي إنكم تخطئون بالليل والنهار وأنا اغفر الذنوب جميعا فاستغفروني أغفر لكم، ياعبادي انكم لن تبلغوا ضرى فتضروني، ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني، ياعبادي لو أن اولكم وآخركم وانسكم وجنكم كانوا على أفجر قلب رجل واحد منكم مانقص ذلك من ملكي شيئا ، ياعبادي لو أن اولكم وآخركم وأنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فأعطيت كل إنسان مسألته مانقص ذلك ماعندى الا كما ينتقص المخيط اذا أدخل البحر، ياعبادي إنما هي أعمالكم أحصيها لكم ثم أوفيكم إياها، فمن وجد خيرا فليحمد الله، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن الا نفسه".[1]

. صەحابەو عاریفانو پیاوانی زاناو رۆشنبیری ئیسلام لە مێژوو لە ئێستاشدا کەس وا لە خوانەگەیشتووە کە میرفطرۆسی نەزانو کینە لەدڵ ئەیلێت، خۆناشکرێ ئێمە وتەی ئەصحابو عاریفان و زانایانی ئیسلام یەك یەك باس بکەین چونکە لەلایەك پێویست نییەو لەلایەکیش باسەکە زۆر درێژ ئەبێـەوە، بەڵام هەرکەس مەبەستی بێت با بڕوات ژیانی هاوەڵانی ئازیزی پێغەمبەر "صەلاتو سەلامی خوای لێ بێ" بخوێنێتەوەو بابزانێ (خۆشەویستی و هاندان) نەخشی زۆری بووە لە ژیانیاندا یان (ترساندنو سزادان)؟! بابزانێ عەشقو خۆشەویستی خوا توێشوی رێگەیان بووە یان ئەوەی میرفطرۆس ئەیڵێ؟ بڕوات هەر بۆ چێژی دڵو دەروونی خۆی گەشتێك بە (حياة الصحابه)دا بکات، ئەوکاتە جارێکی تر قسە هەڵەقو مەلەقەکانی میرفطرۆس بخوێنێتەوە تا بزانێ (میرفطرۆس) چەند بێویژدانە؟! ئیتر ئەوە ئێمە هیچ لەسەر ئەوە ناڵێین کە گوایە ئادەم لەسەر دەنکە گەنمێك خوا لە بەهەشت دەری کرد بێت، چونکە نەئەوە لە بناغەدا وایەو نەخوایش لەسەر دەنکە گەنمێ خەڵکی لەبەهەشت بێبەش دەکات ئەوە کەلەپوری مەسیحیەتە[*] و پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییەو وادیارە میرفطرۆس بارگاوی بووە پێی.

---

[1] جامع العلوم والحكم/ ابن رجب الحنبلي، (٣٢/٢) هەر وشەیەك لە زمانی عەرەبیدا (ئەلفو سینو تای) بچێتە سەر مانای (داوا) ئەگەیەنێ، واتە (استهدونني)و (استكسوني) ... یانی داوای هیدایەتو داوای بەرگ... و ئەوانە بکەن.

* (مەسیحیەت) و لە کەلەپوری یۆناندا، خوا وائەناسێنن کە کەسێکی ستەمکارو رەزیلو حەسودە نایەوێ مرۆڤ ئەوەندە زانیاری لاکۆبێتەوە خوای پێ بدا بە زەویدا (!!).. بۆ شارەزابوون لەم باسە سەیری کتێبی (العلمانية)ی دکتور (سفر الحوالي) بکە بە درێژی باسی ئەو مەسەلانە ئەکات بە بەڵگەو سەلماندنەوە.

. (میرفطروس) له لاپەڕەکانی (٤٢، ٤٣، ٤٥، ٤٦، ٤٧، ٤٨، ٤٩، ٥٠، ٥١، ٥٢، ٥٣)دا باسی کۆیلەو کۆیلەداری ئەکات له ئیسلامدا که جگه له هێرشی ناڕەوا بۆ سەر ئیسلام له ڕوانگەی ئەو باسەوه، هەڵەکانیشی له زۆریدا وزەیەکی ئەوێ وەڵامی هەموویان بدەیتەوه، بەڵام بەهەرحاڵ بایەك دوو بڕگه باس بکەین و پاشان وەڵامیان بدەینەوەو ڕەتیان بکەینەوه:

(میرفطرۆس) به گاڵته پێکردنەوه ئەڵێ: ڕژێمی ئیسلامی ڕژێمێکه له بنەڕەتدا لەسەر مەزنایەتی خواوەند دانراوەو مرۆڤ لەدوا لێکدانەوەدا دەوری کۆیلەو (عبدالله)ی دراوەتێ"[1]. هەروەها یەك زنجیره فەرمودەی (موضوع) و (ناصحیح) ئەهێنێ گوایه هەژاری و گێڵی له ئیسلامدا پەسەندیدەی خوایه و ئیسلام مرۆڤ هان دەدات که گێلیو هەژاریو بەلەنگازی هەڵبژێرنو بەدوایدا بگەڕێن وەك :

. "لو تعلمون مالكم عندالله لأحببتم أن تزدادوا فاقة وحاجة".

. "الفقر زين عندالله يوم القيامه".

. "اذا أحب الله عبدا حماه الدنيا". واته: دنیای لێدەسەنێتەوه.

ئێمه هیچ لەسەر ئەم حەدیسو قسانه ناکەین ئەوەنەبێ بڵێین: پێویسته (حديث) له کتێبەکانی حەدیسەوه بگوازرێتەوه، ئەگەر نا ئەوه نەزانینه یان نەتوانینه (جهل أو عجز) که به دڵنیاییەوه هەردووکیانه به نیسبەت میرفطرۆسەوه، هەروەها ئەو حەدیسانه هەندێکیان سیمای (وضع)یان پێوه دیاره وەك زانایان ئەفەرموون.. وه هەروەها ئەو فەرموودانه هەندێکیان ڕسته عەرەبییەکانیان مانا نابەخشن و ناتەواون له ڕووی (قواعدی نحو)ەوەو بۆ نمونه وەك (قد كتب الله مصيبة والأجل)[2] یان : "جف قلم بالشقى وسعيد.."[3]. هەروەها ئەو هەموو حەدیسه مەوزوعو زەعیفانەی له کتێبێك هێناوه به ناوی (نهج الفصاحة، حضرت محمد، أبو القاسم پاینده، أنتشارات جاویدان ٢٥٣٥). جا ئەو کتێبه به هیچ شێوەیەك سەرچاوه نییه بۆ وەرگرتنی حەدیسو جێگەی متمانه نییه و زانیاریه بنەڕەتیەکانی میرفطروسیش دەربارەی ئه وکتێبه هی ئەوه نییه متمانەی پێبکرێ. بۆیه جێگەی خۆیەتی هەندێ لەو حەدیسانه بەقسەی بەرباخەڵو ناو گیرفان دابنرێ، بۆ نموونه ئەوەتا ئەڵێ: "مەلا ئەحمەد نراقی (!!)[4] دەنوسێ: پێغەمبەر فەرمووی که خوا لەگەڵمدا دواو فەرمووی: ئەی ئەحمەد من که بەندەیەکی خۆم خۆش بوێت شتی پێدەبەخشم، دڵی خەفەت بار دەکەم، لەشی بەبارو ناساخ دەکەم و ماڵی دونیای بەدەستەوه ناهێڵم، ئەگەر دوژمنی بەندەیەکیش بم سێ شتی دەدەمێ: دڵی خۆش دەکەم، لەش ساغی پێدەبەخشم، دەستو باڵی پڕدەکەم له ماڵی دونیا.."[5]. باشه ئەمه چییه؟ خەوە؟! یان سروشەو بۆ ئەم ئەحمەد ناوه هاتووه؟

باشه خۆ خوای گەوره ئەفەرموێت به پێغەمبەر (ﷺ) "وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى". خوای گەوره که بینی هەژاری دەوڵەمەندی کردی، دەی گوایەخوا دوژمنی پێغەمبەره (ﷺ)؟ (پەنا به خوا)؟ باشه یانی ئەوەی لەشی ساغەو دڵی خۆشەو پاره داره هەمووی خوا غەزەبی لێگرتوونو ئەوانەشی پێچەوانەن خوا ڕزقو ڕۆزی بەسەردا ڕشتوون، ئەمه چ ستەمو بێویژدانییەکه ئەم جۆره بیاندەمانەی کەوتووەتەسەر. ئیتر له پێشەوه باسێکی ئەوەمان کرد که ماڵی دنیا نه حەرامەو نەقێزەونه، بەڵکو له ئیسلامدا به (خێر) ناوبراوەو هانی موسڵمانان دراوه که به ڕێگەی حەڵاڵ دەستی بخات، بەڵام نەبنه عەبدی پارەو پوڵ.

---

[1] ئیسلامناسی ل ٥٠.

[2] ئیسلامناسی ل ١١٣.

[3] ئیسلامناسی ل ١١٣ .

[4] ئەو نیشانەیه هی ئێمەیه.

[5] ئیسلامناسي ل١١٤.

دوای ئەم سەرەتا نەخۆشەی کە بە هەندێ حەدیسی لە خۆی نەخۆشتر هەڵیدەچنێ، میرفطروس ئەڵێ: "محمد کۆیلە و زەحمەتکێشانی فێر دەکرد کە بیر لە مافی زیاتر و ئیمکانیاتی ئاسایی زیاتر نەکەنەوە، چونکە چاکترین موسڵمان ئەوەیە کە قانیع بێت".[1](!!) جا دوو حەدیسی بەرباخەڵ ئەهێنێ وەك پەراوێز، کە داڕشتەکانیشی ناتەواون لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە "خيار المؤمن القانع" و "القناعه مال لا ينفذ". خۆی وای نووسیوە..

هەروەها لەسەر ئەم نەزانینە ئەڕوات و ئەڵێ: "لە قورئاندا بەڕاشکاوی هاتووە کە: خوا ڕزقی لە بڕێك بۆ بڕێکی تر زیاتر بڕیوەتەوەو ئەوەی ڕزقی زیاتری بۆ بڕاوەتەوە با زیادییەکەی بە کۆیلەو ژێردەستەکانی نەدات بۆ ئەوەی یەکسانی لە نێوانیاندا پێك نەیەت".[2] جا لە پەراوێزداو لە لاپەڕە (١١٦)دا ئەم ئایەتە بۆ قسەکەی خۆی ئەنووسێ: "وَاللّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاء أَفَبِنِعْمَةِ اللّهِ يَجْحَدُونَ". (النحل: ٧١ ).[*]

خوا ئەزانێ دوودڵم لەوەی وەڵامی کام بڕگەی بدەمەوە، بەرهەرحاڵ (میرفطرۆس) بەقەناعەتەوە دەربارەی یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلام بۆ مەسەلەی کۆیلە ئەڵێ: "بۆمان دەردەکەوێت بیروڕای ئەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە مەزنترین هەنگاوە دیارەکانی ئیسلام هەر لە سەرتاوە خەباتی ڕێك‌و پێك‌و هەمەلایەنەیەتی بەمەبەستی هەڵوەشاندنەوەو هەڵتەکاندنی ڕیشەییانەی نەریت‌و ڕژێمی کۆیلەیەتی ... و ئیسلام هەر لە سەرەتاوە بە گرتنی هەڵوێستی ئاشکرا نیشانیدا کە هەرگیز لایەنگری نەریت‌و ڕژێمی کۆیلەداری نییەو دژایەتی دەکات تا چ ئاستێك بیروڕایەکی بۆش و دوور لە ڕاستییە مێژووییەکانە".[3]

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو قەناعەتە برزکاوەی بدەوەمەوە دەربارەی بڕیاری ئیسلام بۆ کۆیلە و کۆیلەداری، با وەڵامی ئەو مانا نادروستەی بدەمەوە کە بۆ ئایەتەکە کردویەتی و بە هەڵەش نووسیویەتی، ئایەتەکە ئەفەرموێ: (خوا فەزڵ‌و باوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکی ترتاندا، "لە ڕووی ڕزق‌و ڕۆزییەوە".[4] کەچی ئەوانەتان کە خوا فەزڵی زیادی پێداو نایەن پارەو ڕزقەکەی خۆیان گشتی بدەنە کۆیلەکانیان‌و خۆیان یەکسان بکەن پێیان * ئەرێ ئێوە ئکوڵی لە نیعمەتی خوا ئەکەن)؟

ئەوە مانای ئایەتەکەیە کە هیچی لەوەی (میرفطرۆس) ناچێت، پاشان ئەبێت مەبەست و ئامانجی خوا لەو ئایەتە چی بێ، ئەوە پێش‌و پاشی ئەم ئایەتە دەری ئەخات و با خوێنەری بەڕێز ئەو ئەرکە بداتە بەر خۆی‌و بگەڕێتەوە بۆ ئایەتەکانی پێش‌و پاشی ئایەتی (٧)ی (النمل) تا خۆی بزانێ خوای گەورە مەبەستی ئەوەیە: ئەی خەڵکینە ئەوە بزانن تەنیا خوا خاوەنی دەسەڵاتی ڕەهایە، ئەو خاوەنی (خولقاوەکان)ەو بڕیاری مردن ئەدات‌و خەڵك پیر ئەکات‌و زانیاری ئەداتێ‌و لێشی ئەسەنێتەوەو کەس دەسەڵاتی ئەوەی نییە بەر بگرێت لە بڕیاری خوا، هەروەها خواش ئەو دەسەڵاتەی خۆی نەداوە بە هیچ کەسێك و هەر کەسێکیش لافی ئەوە لێ بدات کە خوا دەسەڵاتی خۆی یان هەندێك لەو دەسەڵاتەی داوە بە عەبدێکی‌و جیاوازی نییە لە نێوان ئەو خواداو یەکسانن، ئەوە بە هەڵەدا چووەو ڕێی لێ وون بووە، چونکە (خولقێنەرو خولقاو) هەرگیز نابن بە یەك، وەك چۆن (سيد)و (عبد)ێك

---

1 ئیسلامناسی ل٥١.

2 ئیسلامناسی ل٥٢.

* هەرچەندە ئەو ئایەتەکەی بە هەڵە نووسیبوو، بەڵام ئێمە هەر بە ڕاستی نووسیمانەوە.

3 ئیسلامناسی (٤٥، ٥٥).

4 سبحان الله! ئەو "ڕستە ناوبرە" چەند پڕە لە حیکمەت، تا کەس گومان نەبات ئەو فەزڵ‌و باودانە لە (کەینونەت)و (مادەکەیاندا)یەکە لێی دروست بوون، بەڵکو لە (ڕزق‌و ڕۆزی‌و پارەو پوڵ)دایە، لەگەڵ ئەوەدا خەڵکی لادەرو یاخی لە دین هەر عەقڵ ناگرن‌و ئەڵێن لە ئیسلامدا جیاوازی کراوە لە نێوان خەڵکدا..

نابن بەیەك، یان (بەرپرس و كارمەندێك یان شۆفێرێك و پاسەوانێك)ی ئەوبەرپرسە نابن بە یەك لەدەسەڵات و صەلاحییەتدا، ئایا هیچ بەرپرسێكی گەورە یان بچوك دەسەڵات و مۆرو صەلاحییەت و (نەثریە)كەی لەگەڵ شۆفێرو پاسەوان و كارمەندەكانی بەردەستیدا ئەكاتە دووبەشەوە و خۆی یەكسان بكات پێیان؟! یان ئایا هیچ دەوڵەت و حكومەتێك ئەوەی لێی قبوڵ ئەكات؟ ئەوە قسەكردنە بە پێی "عەقڵ"و "واقعیەتی" خەڵك، ئەوەش بەڵگەیەكی لۆژیكی ووردە كە لە دوو سەرەتاو ئەنجامێك دروست ئەبێت..

سەرەتای یەكەم: مرۆڤەكان لە ماڵ و دەسەڵاتدا جیاوزاییان هەیە.

سەرەتای دووهەم: خەڵك ئامادە نییە كە ماڵ و دەسەڵاتەكان یەكسان بكات.

ئەنجامەكەی ژیان بە سروشتی ئەڕوات بەڕێوە بەپێچەوانەشەوە ژیان تێك ئەچێت ئەگەر ئەو سەرەتانە دەستكاری بكرێن.

واتە ژیان بەو شێوەیە بەردەوام ئەبێت كە دەسەڵاتەكان جیا بكرێنەوەو گەورە و بچوك دیاری بێت ئەگەر جیاوازی "دەسەڵات" نەماو هەموو كەس یەكسان بوو ئەوە "فەوزا" و "بەرەڵڵایی" دروست ئەبێ و ژیان تێك ئەچێ، خوای گەورەش "خولقێنەر"و دەسەڵاتی رەهایە و "خولقاویش" بێ دەسەڵاتە. پێوانە بە دەسەڵاتی خوای گەورە . یان دەسەڵاتی سنوورداره، كە عەبد ئامادە نەبێت دەسەڵاتی خۆی بداتە عەبدێكی وەك خۆی هەر لەبەرئەوەی ئیمتیازێكی بەسەریدا هەیە ئەی خوای گەورە چۆن دەسەڵاتی خۆی ئەداتە دەست عەبدێك كە رێژەی بەراورد نییە لە نێوانیاندا، ئەو خولقێنەرەو ئەو خولقاوە..[1]

دوای ئەمە با بچینە سەر ئەوەی كە ئایا ئێمە هەقمانە بڵێین ئیسلام خەباتی زۆری كردووە بۆ نەهێڵانی كۆیلایەتی یان (میرفطرۆس) هەقیەتی كە بڵێ (ئەو قسەیە بۆش و دوورە لە راستییە مێژووییەكان)؟!.

١. ئەوەی نكوڵی لێناكرێ ئەوەیە ئیسلام یاسای كۆیلایەتی دانەهێنا بەڵكو یاسای ئازادكردنی كۆیلەی داهێنا، یاسای كۆیلایەتی لە هەزاران ساڵ پێش ئیسلامەوە هەبووە لەناو میصرییە كۆنەكان و هیندو رۆم و یۆنانییەكاندا.[2]

٢. لە هەموو پەرتووكە ئیسلامییەكاندا ( چ حەدیس) بێت یان (فقە) بێت بابەتێك هەیە بەناوی (كتاب العتق) (باس و خواستەكانی ئازادكردنی كۆیلە) نەك بە ناوی (كتاب الرق) بۆ نموونە، كە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر خاڵی یەكەم.

٣. ئیسلام سێ بنەمای گەورەی كردە دەسپێك بۆ ئازادكردنی كۆیلە:

أ . بەرتەسك كردنەوەی بە كۆیلە كردن و قۆرخ كردنی تەنیا لە حاڵەتی شەڕدا بە پێچەوانەی ئەوەی هەبوە، كە بۆ سادەترین هۆ خەڵك ئەكرایە كۆیلەو ئازادی لێ زەوت ئەكرا، وەك (هەژاری، نەبونی، یان بە هۆی پرۆسەی (دزین و فراندن)ەوە.[3]

ب . دەرگای ئازادبوونی كۆیلەی كردەوە بۆ هەر كەسێ بیەوێ و ئاسانكاریشی بۆ بكرێ.

ج . دەستوورێكی ووردو هەمەلایەنەی دانا بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ كۆیلەدا بە چاكترین شێوە. وەك ئەوەی بۆ نموونە: "ببینی ئاگرێكی گەورە كەوتوەتەوە جا بۆ ئەوە دەستی بەسەردا بگرین، دێین سەرەتا (ئاگربڕ)ی بۆ

---

[1] خوای گەورە ئەفەرموێت : (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا) كەواتە مادامێك زەوی و ئاسمانەكان تێك نەچوون كەواتە دو خوا نییە و یەك خوا هەیە.

[2] بۆ نموونە سەیری (منهاج المسلم)ی أبوبكر الجزائری ص٧٨٠ بكە.

[3] هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئیسلام تەنیا كۆیلەیەتی لە شەڕدا قۆرخ كرد لەبەر چەند هۆكارێك بوو لەوانە: تا گیانی تۆڵە سەندنەوە كزبكات، لە جیاتی كوشتنی دیل كە باوێكی بڵاو بوو جاران، ژیانی بپارێزرێ تا لە پاشاندا دەرگای ئازادییان لێ بكرێتەوە. (منهاج المسلم / الجزائري، ص٧٨٢).

**دەکەین، پاشان (دەرگاو دەوازەکان) ئەکەینەوە تا ئەوەی ئاگرەکە بەندی کردووە خۆی ڕزگارو دەرباز بکات، پاشان دەست بە کوژانەوەی ئاگرەکە بە گشتی ئەکەین..**

**جا ئیسلام سەرەتا ئاگربڕی کردو پاشان دەرگاکانی ئازادبوونی کردەوەوە دوایی هات ئەو دەستوورە وردە هەمەلایەنەی دانا تا ئەوەی لە بەندی کۆیلایەتیدا ئەمێنێتەوە ڕێزو مافەکانی وەك مرۆڤێك پارێزراوبێت‌و چانسی ژیانی بۆ دروست بکرێتەوەو کەی خۆی ئارەزووی کرد ئازادی خۆی بکرێتەوە.**

**ئێمە ئەم باس‌و نموونەو بەڵگەکانمان بۆ باسەکان بەدرێژی لە کتێبی (دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت)دا باس کردووە هەرکەس ئەمەندە تینوێتی ناشکێنێ بابگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، ئومێد دەکەین وەڵامی هەموو گومانەکانی دەست بکەوێ... بەڵام با هەر چۆن بووە کورتەیەکی زۆر کورت بڵێین:**

**١. ئیسلام کۆیلەو سەرداری یەکسان داناوە لە بنەڕەتی خولقاندا.**

**٢. پیوستە کۆیلە و سەردار هەمان خواردن‌و هەمان جل‌و بەرگ بپۆشن.**

**٣. ناوی ببرێ بە (فتاي) یان (فتاتي) نەك بە (عبدي) یان (أمتي).**

**٤. ئەگەر داوای ئازادی کرد لە (سەردارەکەی) نەك هەر ئەبێ بە گوێی بکات بەڵکوە ئەبێ هاوکاری (ماددی) یشی بکات، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ: "من أعان غارما أو غازيا أو مكاتبا أظله الله يوم لا ظل الا ظله". المنهاج ص٧٨٩. واتە: هەرکەس یارمەتی پیاوی قەرزار یان پیاوی غەزاکەر یان کۆیلە بدات کە ئازادی خۆی ئەکڕێتەوە، ئەوە خوا ئەیخاتە ژێر سێبەری ڕەحمەتی خۆی لە ڕۆژێکدا کە جگە لە سێبەری ئەو سێبەری تر نییە.**

**٥. ئەگەر مناڵی لێی بوو ئازاد ئەبێ...، ئەگەر سەردارەکەی مرد ئەم ئازاد ئەبێ...، ئەگەر قەواڵەی بۆ نووسی لەگەڵ نوسینەکەدا ئازادا ئەبێ...، ئەگەر بە ڕاستیشی نەبێ‌و بڵێ تۆ ئازادی ئازاد ئەبێ...، ئەگەر شەریکەکەی بەشی خۆی لەو کۆیلەدا ئازاد بکات ئەم بەشەی تریشی ئازاد ئەبێ...، ئەگەر بەشێك لە بەندەکەی ئازاد کرد بەشەکانی تری ئازاد ئەبێ...، ئەگەر سەردارەکەی لێی بدات کۆیلەکە ئازاد ئەبێ....، ئەگەر قەواڵەی ئازادی نووسی و نەیبوو نرخەکەی خۆی تەواو بکات لەبەر هۆی دروست ئەوە ئازاد ئەبێ...**

**٦. بوارێك لەو بوارانەی کەزەکاتی تێدا سەرف ئەکرێ، کڕینی کۆیلەیە دانە دانەو کۆمەڵ کۆمەڵ‌و ئازادکردنیانە کە ئەوە ئەرکێکی هەمیشەیی دەوڵەتی ئیسلامییە.**

**هەموو ئەم حاڵەتانەش ئایەت‌و حەدیس‌و فەتوای زانایانی لەسەرەو لە کتێبی ناوبراودا بەڵگەکان هێنراون.**[١]

**جا کەواتە ئیتر یان قسەکەی (میرفطرۆس) پووچ و بۆشەو دوورە لە ڕاستی، یان قسەکانی ئەوانەی بە بەڵگەوە پێچەوانەی قسەکەی ئەو دەڵێن.**

**. (میرفطرۆس) لە ژێر ناونیشانی (ناوەختی دروشمی "یەکسانی و برایەتی ئیسلامی") دا مانای ناشیرین و سەقەت لە هەنگاوە کانی ئیسلام بۆ ئازادکردنی کۆیلە دەردەهێنێ، وەك ئەوەی بترسێ نەوەك کەسێ ئەوە هەنگاوانە سەرنجی ڕابکێشن‌و ئیتر بڕوا بە قسە بۆشەکانی ئەو نەکات، بۆیە ئەڵێ: "لە ئیسلامدا بیلالی حەبەشی هاوشان‌و برای ئەو سەییدە قوڕەیشیی دەوڵەمەندەیە کە لانی کەم سامانەکەی سەدان وشترو دیناری زێڕە".**[٢]
**دوای ئەوە ئەڵێ: ""بێگومان!!**[*] **ئەم برایەتییە بۆ ئەو ئەرستۆکرات‌و کۆیلەدارانەی کە لە توڕەیی کۆیلەو کۆمەڵێ هەژاران ئەترسان نەك هەر خراپ نەبوو بەڵکو زۆر باش‌و جێگای پەسەندکردیش بوو، چونکە ئەو دروشمەی**

---

[1] سەرچاوەی ناوبراو لاپەڕەکانی (٢٣٥ تا ٢٤٦).

[2] ئیسلامناسی ل ٥٥.

[*] ئەوەی ناو کەوانەکان هی ئێمەیەو سەیرمان لەو حوکمەی ئەو دێ کە ئەڵێ (بێگومان).

(برایەتی ئیسلامی) بەلانی کەمەوە دەبووە هۆی ئەوەی کە کۆیلەو هەژارو کۆمەڵی ڕەنجدەران (!!*) چیدی وەك دوژمن سەیری ئەرباب و ماڵ و سامانەکەی نەکەن.. لەسەرئەو بناغەیە دەسەلاتی ئیسلامی (یەکێتییەکی پیرۆز)ی نێوان کۆیلەداران و ئەرستۆکراتەکان و کۆیلەو ڕەنجدەران بوو".[1] لەوەلامدا ئەڵێین:

١. ئەم جۆرە بنیادەمانە مرۆڤ نازانێ چۆنیان بدوێنێ، ئیسلام باری کۆیلە چاك ئەکات ڕەخنەی لێئەگرن، ئەگەر چاکی نەکات ڕەخنەی لێئەگرن، یاساو ڕێنمایی وردو پڕحیکمەت بۆ مەسەلەکانی ژیان دائەنێ ڕەخنەدەگرن، واناکات رەخنەدەگرن!! دواندنی پیاوی خانەگومان و دڵپیس زۆر زەحمەتە، بەلام کاکە! ئایا کۆیلەیەك یان خزمەتکارێك باری ژیان واچەرخا بێت بۆی کە لەو ڕۆژەدا ئەو خزمەتکارو یەکێکی دی پارەداربێت کە ئەوە دەستوورێکی نەگۆڕە لە ژیاندا و جاری واهەیە زۆر نابات پێچەوانە دەبێتەوە ئەم پارەدارو ئەو ئەبێتە خزمەتکار، باشە ئایا پەیوەندی نێوان ئەو دووانە (پارەدار)و (خزمەتکار)پەیوەندی ڕق و کینەو دوژمنایەتی و چەقۆ لە یەکتری سوین بێت باشە یان پەیوەندی ڕێزو برایەتی پیرۆزو سۆزو هاوکاری بێت؟ باشە تۆ بۆ حەز ئەکەی خەڵك ڕقیان لەیەکتری بێت و براو تەبا نەبن؟! چ خێرێکت لەو شەڕەدا دەست ئەکەوێ؟

٢. باشە کەی ئەرستۆکرات و ئەشرافی مەککە بەوە دڵخۆش و کەیفدار بوون کە پێغەمبەر (ﷺ) شیعاری (برایەتی ئینسانی) ئەدا بە گوێیاندا، باشە مەگەر ئەوان یەکێك لە ڕەخنە و گازندەکانیان ئەوەنەبوو کە ئەیانووت چون ئێمەی ئەشراف و دەوڵەمەند یەکسان ئەکەی بەو کۆیلەو هەژارانە. مەگەر نەهاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ)و پێیان وت: "ئەگەر مەجلیسی ئێمەو مەجلیسی ئەو کۆیلەو هەژارانە جیا بێت ئێمە گوێ بۆ قسەکانت شل ئەکەین، چونکە ئەوە شان نزمییە بۆ ئێمە لەگەڵ ئەواندا یەك مەجلیسمان ببێت، تا ئەوە بوو خوای گەورە فەرمووی: (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً) (الكهف: ٢٨) واتە: بەردەوام ئارام بگرە لەگەڵ ئەوانەدا کە بەیانیان و ئێواران دەم بە نزاو پاڕانەوەن و مەبەستیان هەر ئەوەیە خوا لە خۆیان ڕازی بکەن و چاویان لێدوور مەخەرەوە ئایا تۆ بریقوباقی ژیانی دونیات ئەوێ؟و بە گوێی ئەو کەسە مەکە کە دڵمان بێئاگا کردووە لەم قورئانەو شوێن هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە، چی کاروئیشی هەیە هەمووی کەمتەرخەمی و گوێ نەدانە بە دین.

ئیتر کوا (بێگومان)ەکەی تۆ، کوا بوختانەکەی تۆ؟

٣. توخوا ئەبێ ئەوە لە ریزی سەروەرییەکاندا بنووسرێ کە ئیسلام ئەتوانێ کابرایەکی پارەدارو زەنگین بکاتە برایەکی ڕاستەقینەی هەژارێکی بێ نان و شوێن یان ئەوە وەك ڕەخنەو شورەییەك بنوسرێ؟

ئیسلام بتوانێ کۆیلەکە لەو سەردەمەدا هیچ ڕێزو حوورمەت و ئەرزشێکی نەبوو، بەرز بکاتەوەو بیکاتە (سید)و (سردار) یان برای (سید)و (سردار)ەکان، هەقی ئەوەیە رەخنەی لێ بگیرێ و بێشەرمی بکەی بەرانبەری یان هەقی ئەوەیە ئەو یاساو ڕێنماییانە بۆ ئەمرۆش بکەیتە بەرنامەو یاسا بۆ جێبەجێکردن.

. ئەصحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبوبەکریان ئەوت "إنه سيدنا واعتق سيدنا".[2] ئەوە سەردارێکی ئێمەیەو سەردارێکی ئێمەشی لە کۆیلەیەتی ڕزگارکرد.

. عوسمان کوڕی عەففان گوێی کۆیلەیەکی خۆی ڕاکێشا لەسەر کەمتەرخەمییەك، زۆری نەبرد بانگی کردەوەو پێی وت: وەرە تۆش گوێچکەی من ڕابکێشەرەوە و با نەکەوێتە قیامەت، کە کۆیلەکە (بە تەریقییەکەوە) گوێچکەی

---

[1] ئیسلامناسی ل٥٥.

[2] سەیری (حياة الصحابة)ی کاندهلوی بکە بۆ شتی زیاتر لەوبارەیەوە.

عوسمانی گرت، عوسمان فەرمووی: توند ڕایبکێشە با هەق بەهەق بێت! چەند خۆشە هەر لە دونیا هەق بە هەقت لەگەڵدا بکرێو نەکەوێتە قیامەت".[1]

. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕۆژێکیان بە کەنیزەکێکی خۆی وت: بەڵکو تۆزێك باوەشێنم بکەی تا هەندێك ئەخەوم، کەنیزەکەکە دەستی کردە باوەشێن کردنی و حەزرەتی عومەر خەوی لێکەوت و خەویش زۆری هێنا بۆ ئەمو ئەمیش خەوی لێکەوت، کە عومەر خەبەری بویەوە باوەشێنەکەی هەڵگرتو دەستی کردە باوەشێنی کردنی کەنیزەکەکەی! کە کەنیزەکەکە خەبەری بوویەوە سەیر ئەکات حەزرەتی عومەر باوەشێنی ئەم ئەکات تەریق بویەوەو هاواری کرد، عومەر فەرموی: "إنما أنت بشر مثلي أصابك من الحر ما أصابني فاحببت أن أروحك كما روحتني".[2] واتە: تۆش بنیادەمێکی وەك من و وەك منیش گەرما زۆری بۆ هێناوی، پێمخۆش بوو تۆ چۆن فێنکیت بۆ من پەیدا کرد منیش وا فێنکی بۆ تۆ پەیدا بکەم!!

. پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموی: کۆیلەو خزمەتکارەکانتان برای ئێوەنو خوای گەورە خستونییەتە لای ئێوە، باهەرکەس کۆیلەو خزمەتکارێکی هەبوو لەو خواردنەی بداتێ کە خۆی و ماڵو مناڵی ئەیخۆنو لەو بەرگەی بکاتە بەر کە خۆیو ماڵو مناڵی ئەیپۆشنو ئەگەر کارێکیشی پێسپارد با هاوکاری بکات".[3]

(میرفطرۆس) باسی ئەوە ئەکات گوایە ئەم برایەتیە پیرۆزە زۆرە ملێیە(!!) (دیارە بە گاڵتە پێکردنەوە) زۆری نەبرد ڕووی لە کزی کردو تێکشکاو ناتەبایی سەری هەڵدایەوە".[4] نازانم ئەوە کەی وایە.

. باشە خۆ ئەم برایەتییە لە سەردەمی پێغەمبەردا بۆ ماوەی (٢٣) ساڵ دەوامی کێشا.

. پاش پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەردەمی "خولەفای ڕاشیدین"یشدا بۆ ماوەی (٣٠) ساڵێك دەوامی کێشا.

. پاش ئەوەش خۆ هەموو فتوحاتی ئیسلامی لە ژێر ئەو برایەتییەدا ئەکرا، لە سەردەمی ئەمەوییەکانداو سەردارو کۆیلەو دەوڵەمەندو هەژار هەموو پێکەوە بوون.

. لە سەردەمی عەباسیەکانیشدا ئەو برایەتییە هەر بەردەوام بوو، تەنانەت وەك (شبلي النعماني) گەورە نووسەری هیندی لێکۆڵینەوەی ووردی کردووە لەم مەسەلەیدا و باسی ئەکات کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا بەتایبەت زۆربەی ئەوانەی بڕیار بە دەست و قسە ڕۆیشتوو بوون لە بنەڕەتدا کۆیلەو غەیرە عەرەب بوون،[5] چونکە زاناو مامۆستاو شەرعزان بون، دەی ئیتر کامەیە کە ئەڵێی زۆری نەبردو ڕووی لە کزی کرد؟ هەرگیز نەکەی باسی ئەوە بکەی گوایە یاخی بوونی زنجەکان لە خوارووی عێراقدا لە چەرخی عەباسییەکاندا بەڵگەی قسەکەتە، چونکە ئەوە باسێکی ترەو بە فیتی دوژمنو بێگانە کراو هۆی تری هەبوو.[6]ئەگەر باسی ئەو "فیتنە"ی نێوان (عەلی)و (معاویە)یەش باس ئەکەی ئەوە، یەکەم: تاقمێکی گێرەشێوێن بەناوی (سەبەئیییەکانەوە) ئەو ئاگرەیان هەڵگیرساندو پرسەکە شتێکی ترە، دووهەم: هەموو ئاژاوەکە لەو ڕۆژەوەی دروست بوو تا کۆتایی پێهات یەك دوو ساڵی خایاندو دەستی بێگانە و دوژمن بڕڕاو فیتنەکە نیشتەوە.[7]

---

[1] (حیاة الصحابة)، الکاندهلوي.

[2] منهاج المسلم / الجزائري ص ٢٤١. ٢٤٢. هەروەها (البدایە والنهایە) ٢١٢/٩.

[3] ریاض الصالحین، ص٣٨٤. الحدیث متفق علیه.

[4] ئیسلامناسی ل٥٦.

[5] قضایا الثقافة والأدب والفن / ص٤٢٥.

[6] باسی یاخیبونی زنجەکان بە درێژی لە کتێبی (دەوڵەتی خیلافەت)داو لەلاپەڕەکانی (٣٢٥ بۆ ٣٢٩)دا باس کراوە...

[7] بۆ درێژەی ئەو باسە سەیری (دەوڵەتی خیلافەت..، ل٩١ تا ل٩٨) بکە.

. میرفطرۆس – کە بە درێژی ئەم کتێبەی – وێڵە بە شوێن بوختانو تێکەڵ کردندا و ئاواتی ئەوەیە ڕاستییەکان بشێوێنێ و زەنو دڵی لاوی کورد لارو خوار بکاتو دایبخات لە ڕووی ئیسلامو ڕێنماییەکانی ئیسلامدا.. زۆر ناحاڵییانە ئەڵێ:

".. لە ساڵی (نۆی کۆچی) کاتێك محمد بۆ شەڕی دژی . هرقل . (کە ئەو کاتە نازناوی فریاد ڕەسی ئاینی مەسیحو بنیاتنەری ئیمپراتۆری ڕۆژهەلاتی پێدرابوو) فەرمانی خۆسازدانی داو ئەوکاتەی کە بەسەردارەکانی محمد ڕاگەیەنرا کە "دەبێ" لەم شەڕەدا بەشداربن، هەریەکەیان بەهانەیەکی بۆ هەلاتن لە شەڕ هێنایەوەو نەدەچوون بۆ بەرەی جەنگ، هەندێکیان گوتیان هێشتا هەوا گەرمە کاتی بەڕێکەوتن نییەو بەشێکیان.. بەلام کۆمەڵێ فەقیرو هەژاران کە بە درێژی ژیانیان بەشێوەی مەمرەو مەژی ژیابوون لە ڕاستیدا هیچیان نەبوو، کە لەم شەڕانەدا لە دەستیان ببێتەوە بە باوەشێکی ئاوەلاوە ملیان بۆ هەموو شەڕەکان دەنا لە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی محمد و بانگەوازەکانی قورئاندا کە بەڵێنی ژیانی پڕ ئارامی و خێروخۆشی ئەو دونیای بە زەحمەت کێشەکانی دەدا تەنانەت بەبێ چەكو تفاقیشەوە بەشداریی ئەو شەڕانە دەبوونو شەهیدیان دەدا..[1] پاشان بە پیشەی هەمیشەیی دەست ئەکاتە بەرد بارانکردنی حەزرەتی عوسمانو کینەی خۆی (یان نازانم هی کێی) پێ دەڕێژێتو ئەڵێ: "خۆش ئەوەیە (!!) کە هەر لەم شەڕی (حرقل)ەدا عوسمان کە یەکێکە لە یەکەم یارە کانی محمدو لەگەورەترین ئەرستۆکراتو چەوسێنەرەکانی عەرەبستانو زاوای پێغەمبەریش بوو، هەزار حوشتری لە ماڵی خۆی (!!)* خستە بەردەست سەربازەکان . واتە سەربازە پێ پەتیو ستەملێکراوەکان . هەتاوەکو ڕوو لە شەڕ بکەن". دوای ئەمە کینەدارانە تر ئەڵێ: "عوسمان کە شارەزای گەوهەری ئەم شەڕانە بوو زۆر جاران بە بیانووی سەرقاڵی کارەوە لەم خۆی لەم شەڕانە (**) دەپاراستو لەشەڕی (غطفان)و (ذات الرقاع)و (بدر)و (أحد)یشدا هەر ئەم سیاسەتی خۆپاراستنەی گرتەبەر کەچی لەلایەن محمدەوە بەبێ ئاگاداری خۆی کرا بە پارێزگاری مەدینە"[2]... ئەم دەقانەی سەرەوە یەك دوو بڕگەی زۆر نەزانانەی تێدایەو لە ڕاستیشدا ئێمە نامانەوێ تیشك بخەینە سەر هەمووی، بەلام ئەم چەند خاڵە ئەڵێین:

١. ئەوانەی تۆ باسیان ئەکەیت خۆیان لە شەڕ دزیوەتەوە، ئەوە تاقمی دووڕووەکان بوون، نەك سەردارەکانی موحەممەد (ﷺ)، ئەوەبوو دواییش چەند ئایەتیان لەسەر هاتە خوارەوە لە سورەتی (توبە)دا هەمووی بە ووشەی (ومنهم .. ومنهم) دەست پێ ئەکات، کە لەوەوەدوا ئەو جۆرە ئایەتانە بوویە پێوەر بۆ خەڵکانی دووڕوو.. ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ) ئەڵێن ئێمە دووڕووەکانمان زۆر نەئەناسییەوە تا ئایەتەکانی سوورەتی (التوبە) هاتنە خوارەوە کە بە (منهم.. منهم) دەست پێ ئەکەن، لەوەودوا بەئاسانی ئەماننناسینەوە..[3]

٢. تەنیا هەژارانیش نەئەچوون بۆ غەزاو شەڕ بەڵکو هەموو پێکەوە ئەڕۆیشتن مەگەر هەر خۆت دوو سێ لاپەڕە پێشتر باسی ئەوە ناکەی کە ئیسلام بە ناوی پەرەسەندنی (خواپەرستی)و (جهاد) دژی کوفرو بتپەرستی کە سیمایەکی دیاری ساڵەکانی سەرەتای دەسەلاتی ئیسلامییە توانی ناکۆکی چینایەتی داپۆشێت بەجۆرێك: کۆیلەو کۆیلەدار، ئەربابو نۆکەر، لەژێر ئالای (جیهاد لەڕێی خوادا) لەڕیزو بەرەیەکدا ڕێکبخاتو یەکیان پێ بگرێ".[4] دەی ئیتر ئەمەو لەچیو ئەوەی ترت لەچی؟!

---

[1] ئیسلامناسی. ل٥٦و ٥٧ .

(*): ئەو نیشانەی سەرسوڕمانە هی (علی میرفطرۆس)ە بۆ گاڵتەپێکردن دایناوە. (**): دیارەی ووشەی (لەم) جارێکیان بەزیاد بەکاربراوە، بەلام ئێمە وەك خۆی نوسیمانەوە.

[2] ئیسلامناسی. ل٥٧و ٥٨.

[3] مختصر تفسیر ابن کثیر . (الصابوني، ٢/١٢٥)

[4] ئیسلامناسی. ل٥٥و ٥٦.

٣. ئەوەی زانراوەو گومانی تێدانییە بەرەی – صحابە – پێکهاتەیەك بوون لە هەموو ڕەگەزو هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵگەی ئەو کاتە: صوهەیبی ڕۆمیو سەلمانی فارسیو بیلالی حەبەشیو گاوانی کوردی تێدابوو.. هەروەها ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو ئەبوهورەیرەو حەنزەڵەو عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو کیٚو کێی تێدابوو، کە هەریەکەی سەر بە چین و توێژێکی تایبەت بوو، هەر هەمووشیان لە عاشقانی ڕێگای دین بوونو بۆ ئەوە هاتبوون کە خزمەتی دین بکەنو بۆ دین تیٚ بکۆشنو بەشداریی شەڕو غەزاکانیان کردووە.

٤ . لە (منطق)دا دوو بنەمای لۆژیکی هەیەو هەر ئەوەش بووەتە یاساو ڕێسا لە بەرنامە یاساییەکاندا بنەماکان ئەڵێ: "الإثبات تحتاج الی الدليل والنفي بضده"، هەروەها "الإثبات مقدم علی النفي".[1] یانی: دان نان بە شتێکدا بەڵگە ئەخوازێ، بەڵام نکوڵی کردن لە شتێ بەڵگەی ناوێ.. دان نان بەشتێکدا مافی کارپێکردنی لە پێش نکوڵی کردنەوە دێت.. واتە: ئەگەر کەسێك داوای مافێکی ئەکرد کە بەسەر کەسێکی ترەوە هەیەتی ئەوە داوای بەڵگە لە کەسی یەکەم ئەکرێو داوای بەڵگە لە کەسی دووەم ناکرێ، دەعوای کەسی یەکەم بەبێ بەڵگە وەرناگیرێ بەڵام نکوڵی کەسی دووهەم بەبێ بەڵگەش وەردەگیرێ، چونکە بناغەو بنەڕەت "بێ گوناهی"و "بەرائەت"و "گەردن خاڵی بوونە" (خلو الذمة)یە لە خەڵکدا تا بە بەڵگە ئەسەلمێنرێ کابرا فلان مافی خەڵکی کەوتووەتە سەر، یان فلانە خەتای کردووە.

هەروەها کەسێك دێت باسی شتێکی مێژووی دەکات کە ڕووی دابێت، ئەبێت بێتو بەڵگە بهێنێتو بەڵگەش ڕیوایاتی (صحيح)ە، ئەگەرنا ئەوە لاف لێدانو بوختانو درۆزنییە... شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە (منهاج السنه)دا ئەفەرموێ: "ئێمە ئەڵێین نە ئەبوبەکرو نە عومەرو نەعوسمان لە هیچ شەڕێکدا خۆیان نەدزیوتەوە، کێش ئەڵی وانییە با بێت بەڵگە بهێنێتەوەوە (إثبات)ی بکات کەوا نییە.

٥. لەو شەڕانەدا کە میرفطروس باسیان ئەکات (غطفان)و (ذات الرقاع)و (بدر)و (أحد)ە، عوسمان نەخۆی دزیوەتەوەو نەڕاشی کردووە، بەڵکو ڕاستی ئەم شەڕانە بەم شێوەیەیە (زۆر بە کورتی):

. ئەوەی بدر پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتا بۆ شەڕ نەچوو تا عوسمان یان خەڵکی تر خۆی بدزێتەوەو، بەڵکو بۆ ئەوە ڕۆیشتن قافڵەیەکی بازرگانی قوڕەیش کە هەموو سەروەتو سامانی ئەمانی لە مەکەدا موصادەرە کردبوو، بگرن. هەروەها عوسمان (ڕەزای خوای لیٚ بێ) (ڕووقیە)ی خێزانی ئەوەندە نەخۆش بوو بەتەمای نەمابوون، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) عوسمانو ئوسامەی کوڕی زەیدی بەلاوەی جێهێلا وەك مەحرەمو خزم، ئەوەبوو کاتێك کە مژدەی سەرکەوتنیان هێنایەوە بۆ مەدینە صەحابەکان لەسەر قەبران بوونو (ڕقیە)یان ئەناشت[2] پێغەمبەریش (ﷺ) کە هاتەوە بە عوسمانی فەرموو "إن لك أجر رجل ممن شهد بدرا وسهمه".[3] دەی ئیتر خۆدزینەوە یانی چی؟

. بۆ ئەوەی (ئوحود)یش عوسمان بەشداریی کردووەو خۆی نەشاردۆتەوە، بەڵی وایە عوسمانیش یەکێك بووە لەوانەی کە لەشەڕەکەدا شکانو هەڵاتن، بەڵام خۆ خوای گەورە ئەفەرموێ: "إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا اللّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ". (آل عمران: ١٥٥). ئەوانەی لەو ڕۆژەدا کە دوو دەستەکە گەیشتنە یەك شکانو هەڵاتن ئەوە شەیتان پێی خلیسکاندن، بەهۆی هەندێ گوناهەوە، دڵنیابن خوای گەورە بووراوە لێیان.[4](*)

---

[1] بۆ وەرگرتنی (تطبيقات)ی زۆر لەسەر ئەم قاعیدەیە سەیری (حقائق الايمان)ە سعیدی نورسی بکە.

[2] البداية والنهاية (٣٠١/٣).

[3] رواه البخاري في فضائل أصحاب النبی (ﷺ).

[4] سەیری (البداية والنهاية) ٢٠٤/٧، ٢٠٥. بکە

. بۆ شەڕی (ذات الرقاع) پێغەمبەر (ﷺ) عوسمان یان ئەبوزەڕی[1] لە جیاتی خۆی لە مەدینە دانا کە ئەوەش سرووشتیییەو پێغەمبەر (ﷺ) هەر جارەی یەکێکی دادەنا، جارێ (عەلی)و جارێ (أم مکتوم)و جارێ (عوسمان)و جارێ (سەعد).. وە هەروەها، ئەی خۆناکرێ مەدینە چۆڵ بکاتو بەرپرسێکی تێدا جێ نەهێڵێ تا دێتەوەو کاروبارو کێشەو گرفتەکانی بخاتە ئەستۆ بۆ ئەوەی ئیشو کارەکان ڕانەوەستێو خەڵك پەکی نەکەوێ؟!

بۆ مەسەلەی شەڕی (غطفان) ئەوە نازانم لە کوێ هێناویێتی، چونکە شەڕێك بە ئاوەها ناوێکەوە نییە لە (سیرە)دا، هەموو ئەوەی هەیە مەفرەزەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەینێرێت بۆ لای (أسیر) یان (بەشیری کوڕی زرام) کە بە نیازبووە (غطفان) هان بدات لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان ئەو مەفرەزەیەی کە بە فەرماندەیی (بەشیری کوڕی سەعدی ئەنساری) ناردی بۆ سەر (یەمەن)و (جبار) کە دوو هەرێم بوون لە زەوی (غطفان)، هەواڵ گەیشتبوو بە پێغەمبەر (ﷺ) کە کۆبوونەوەتەوە بۆ پەلاماردانی مەدینە..[2] بەهەرحاڵ هەریەك لەوانەش نەباسی عوسمانیان تێدایەو نەباسی خۆدزینەوەو راکردنی تێدایە..

بەڵام من گومان ئەبەم کە ئەو زانیارییە (غطفان) نییەو (رضوان)ە، شەڕیش نییە (بیعە)یەو عوسمانیش خۆی نەدزیوەتەوەو لەناوجەرگەی مەسەلەکەدا بووە، کورتەکەشی ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) کە ویستی بڕوات بۆ (عەمرە) موشریکەکانی قوڕەیش ڕێگەیان نەداو شەڕیان پێ ئەفرۆشت، پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردن کە ئەم بۆ شەڕ نەهاتووەو بەڵکو بۆ زیارەتی ماڵی خوا هاتووە،[3] پێغەمبەر (خراشی کوڕی ئومەیە)ی نارد بۆ لای قوڕەیش وەك نوێنەری خۆیو تەنانەت هوشترەکەی خۆشی دایە سواری بێت تا حاڵییان بکات ئەم بۆ شەڕ نەهاتووەو بۆ زیارەت هاتووە. کەچی قوڕەیش حوشترەکەیان لێ سەندو سەریان بڕی ویستیان خۆشی بکوژن، بەڵام حەبەشەکان نەیانهێڵاو (خراش) گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) عومەری کوڕی خەتتابی بانگکرد وەك نوێنەر بینێرێ بۆ لای قوڕیش، بەڵام عومەر فەرمووی: قوڕەیش گوێ بۆ من ناگرنو باشترین کەس بینێری (عوسمان کوڕی عەففان)ە، لەبەر خزمەکانیشی کەس ناوێرێ سووکایەتی پێ بکات، پێغەمبەر (ﷺ) عوسمانی ناردو هەندێ ڕاسپاردەشی بۆ دابەزاند. عوسمان ڕۆیشت بۆ مەکەو پەیامەکەی پێغەمبەری پێگەیاندن، قوڕەیش وتیان: ئەگەر خۆت تەوافی کەعبە ئەکەیت ڕێت لێناگرین، عوسمان فەرمووی: تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) "طواف" نەکات من "طواف" ناکەم، قوڕەیش عوسمانیان گل دایەوە، کە لە کاتی خۆیدا نەگەڕایەوە، هەواڵێك بڵاوبوویەوە کە قوڕەیش (عوسمان)یان کوشتووە، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر نارەحەت بوو، بۆیە فەرموی: "لا نبرح حتی نناجز القوم"[4] ئەم شوێنە جێناهێڵین تا لەگەڵ ئەو خەڵکەدا ئەم شەڕە نەبڕینەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵەکانی بانگکرد بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەن کە شەڕی مانو نەمان بکەنو هەموو بەیعەتی شەڕی مانو نەمانیان پێ دا لە ژێر درەختێکداو پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەستی ڕاستی خۆی بەرزکردەوەو فەرموی: ئەمە دەستی عوسمانەو ئەویش بەیعەت ئەدات، نووسەرانی سیرە ئەڵێن ژمارەی ئەو ئەصحابانەی کە بەیعەتیان لە ژێر درەختەکەدا دا بە پێغەمبەر

---

(*) زۆر سەیرە ئەم جۆرە عەلمانیانە پێوەری سەیر سەیریان هەیە بۆ صەحابەو بۆ موسڵمانان، قەناعەتیان وایە صەحابە یان موسڵمان نابێ بکەوێتە ناو گوناهەوە یان لە شەڕدا رابکات، یان حەز لەپارەو دنیا بکات، خۆ ئەگەر وای کرد ئەوە ئیتر موسڵمان نییە!! لە کاتێکدا صەحابە و موسڵمانیش وەك هەموو کەسێك مرۆڤنو فریشتە نینو ئەکەونە هەڵەوەو دەرگای تۆبەش تا (غەر غەرە) هەر کراوەیە لەسەر عەبدەکانی خواو ئەوەش نابێتە هۆی ئەوەی خوا دوای ئەوە وەریان نەگرێتەوە.

[1] الرحيق المختوم، ص٣٦٦.

[2] الرحيق المختوم، المباركفوري. ص٣٦٩.

[3] البداية والنهاية ٤/٥٢٣.

[4] عەرەب ئەڵێ: "المحاجزة قبل المناجزه". واتە: ئاشتی پێش شەڕ ئەکەوێ.

(ﷺ) هەزار چوارسەد صحابی بوون...[1] ئەوەبوو پاشان دەرکەوت کە کوشتنەکەی عوسمان پڕوپاگەندە بووەو قوڕەیش سوهەیلی کوڕی عەمریان ناردە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پەیماننامەی حودەیبییە، یان لەگەڵ مۆر کردو لە پێشەوە ئەم باسەمان کردووە..

ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ: کابرایەکی خەلکی میصر بۆ حەج دێتە مەککە سەیر ئەکات کۆمەڵێك لە شوێنێکدا کۆمەڵەیان کردووە، ئەڵێ ئەوە ئەوانە چ عەشیرەتێکن، ئەڵێن: قورەیش، کابرا ئەڵێ: ئەی ئەو پیاوە ڕیش سپییە کێیە لە ناویاندا؟ ئەڵێن: عەبدوڵلای کوڕی عومەرە، کابرا ئەڵێ: ئەی کوڕەکەی عومەر! چەند پرسیارێکت لێ ئەکەم وەڵامم بدەرەوە، ئاگات لەوە هەیە عوسمان لە (أحد) دا هەڵاتووە؟ عەبدوڵلا وتی: بەڵی، کابرا وتی: ئاگات لەوەش هەیە نەڕۆیشت بۆ (بدر)دو بەشداریی شەڕی نەکردووە؟ عەبدوڵلا وتی: بەڵێ، کابرا وتی: ئاگات لەوەش هەیە کە لە (بیعة الرضوان) یشدا لەوێ نەبوو، و بەیعەتەکەی نەدیوە؟ عەبدوڵلا وتی: بەڵی، کابرا وتی: الله أكبر. (ئیبن عومەر) فەرموی: کابرا وەرە با بۆت ڕوون کەمەوە، ئەوانە چۆن بوون، جارێ هەڵاتن لە (أحد) دا ئەوە هەموو شایەتین کە خوا لێی بووراوەو لێی خۆشبووە، نەچوونیشی بۆ (بدر) هۆکەی ئەوە بووە کە (رقیە) کە کچی پێغەمبەرو ژنی عوسمانی بوو زۆر نەخۆش بوو، پێغەمبەر فەرموی پێی: إن لك لأجر رجل ممن شهد بدرا وسهمه". ئەوەش کە بەشداری (بیعة الرضوان) نەبووە، هۆکەی ئەوەبووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ناردبووی بۆ مەککەو ئەگەر لەو ڕۆژەدا کەسێکی تر ببوایە لای مەکییەکان لە ئەو بە (حورمەتتر) بوایە پێغەمبەر عوسمانی نەئەنارد و ئەوی ئەنارد پاشان دەستی ڕاستی خۆی بەرزکردەوە و فەرمووی ئەوە دەستی عوسمانەو کێشای بە دەستەکەی تریداو فەرمووی: ئەمەش بەیعەتی عوسمان، جا ئیبن عومەر فەرموی: دەی بەم زانیارییانەوە ئیتر بۆ کوێ ئەڕۆی برۆ".[2]

ئیتر نازانم ئەم میرە بوختان چییە شەڕی کێ و شەڕی چی بە حەزرەتی عوسمان ئەفرۆشێت، عوسمانێك وەك لە پێشەوە باسمان کرد لە لوتکەی (شەرم)و (بەخشندەیی)و (دینداری)و (دادپەروەری)و (وەفاداری)و (ئازایەتی)یشدا بووە، ئەوەندەش پەسەندیدەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە دوو کچی پێداوەو نازناوی (ذی النورین) . خاوەن دوو نور. ی لە ناو هاوەڵاندا هەبووە، دەی ئیتر چۆن ئەوەندە (فرتو فێڵ) ئەکات، یان ئایا چۆن پێغەمبەر (ﷺ) کە تۆ بە پێغەمبەری نازانی، بەڵام بە پیاوێکی ووریاو زۆر عاقڵ و عەبقەری ئەزانی ئەو هەمووە (مەدح)ەی ئەکات و کچێکی ئەداتێ و دەرسیش وەرناگرێ، (حاشا لەوەی کە وابێت) کچێکی تریشی پێ ئەدا؟! باشە ئەمە عەقڵی منداڵیش شتی وا ئەبڕێ..[3]

. میرفطروس لە لاپەڕە (٥٨)دا باسێکی "ئەجەل" ئەکات و سەری لێ سوڕدەمێنێ و لێی تێناگاتو دەست ئەکاتە دوژمنایەتی کردنی وەك پەندەکە ئەڵێ: "الإنسان عدو لما يجهله" مرۆڤ دوژمنە بەوەی نایزانێ، قورئانیش ئەفەرموێ: "وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ فَسَيَقُولُونَ هَذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ". (الأحقاف: ١١). کە لەم قورئانە حاڵی نەبوونو بۆیان ڕۆشن نەبوو خێرا ئەڵێن . ئەمە قسەی کۆنو پڕوپووچە . لە جیاتی ئەوەی کە نازانن بپرسن، کەچی بوختان ئەکەن، ئاخر خۆ نەزانین شورەیی نییە، بەڵکو فێرنەبوون و پرسیارنەکردن شورەییەو کوردیش جوان ئەڵێت: "پرسابەو دانابە". واتە: بپرسە با ببیتە داناو شارەزا، (میرفطرۆس) باس لەوە ئەکات گوایە پێغەمبەر (ﷺ) سوودی لە سادەیی هەژارو زەحمەتکێشان وەرگرتووەو پێی سەلماندوون کە شەڕ کردن "ئەجەل" پێش ناخاتو ئەم قەناعەتەش (فانالیزم) . تەعبیری میرفطروسە . و ئازایەتی و بوێری و نەبەردی دەدایە شەڕەکەرەکان (واتە کۆمەڵانی ڕەش و

[1] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية، ص٤٨٢. والسيرة النبوية ، الصلابي (٢/ ٤٤٧).

[2] البداية والنهاية ٢٠٤/٧. بوخاریش لە (فضائل أصحاب النبی)دا باسی ئەکات.

[3] پێشتر باسی حەزرەتی عوسمانمان کردووە بە درێژی.

ڕووت) . هەر تەعبیری ئەوە . (!!) زۆر جاران دەبووە هۆی سەرکەوتنیان)[1] . ئێمە تەنیا سەرنجی خوێنەری هۆشیاری کورد بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە بچێت (حیاة محمد)ەکەی (محمد حسین هیکل) بخوێنێتەوە کە موناقەشەیەکی زانستی و لۆژیکی ڕۆژهەڵاتناسان دەکات لەم مەسەلەیەدا، کە چۆن ئەوان ناتوانن پەی بەو مەسەلەیە بەرنو بەناڕەوا ئەو جۆرە یاساو ڕێنماییانە لە جیاتی بدەنە پاڵ خوا (جل جلالە) ئەیدەنە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)[2] .

---

[1] ئیسلامناسی ل٥٨.

[2] حیاة محمد، هیکل، ص٥٤٩ بۆ ٥٥٨.

. (میرفطرۆس) ئەڵێ: "حەزرەتی محمد بە هۆی ژەهرێکەوە کە ژنێکی یەهودی کردبوویە ناو چێشتەکەیەوە لە ساڵی یازدەی کۆچیدا کۆچی دوایی کردو هەر لە یەکەمین ڕۆژی مردنیدا ناتەبایی ناکۆکیەکان لە ناو دەسەڵاتی ئیسلامیدا ئاشکرابوو.. نزیکترین یارانو ئەسحابەکانی بۆ گرتنی جێگاکەی و پلەی خەلافەت کەوتنە کێشەوە"[1]... جا بە ناوی (أمين عاملی)یەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: "هیچ چەشنە ڕێزێکیان لە نێردراوی خودا نەگرتو چاوەڕوانی کفنو دفنی نەبوونو هێشتا تەرمەکەی بە خاك نەسپێردرابوو، بۆ وەچنگ خستنی ماڵو میراتەکەی کەوتبوونە سەروگوێلاکی یەکتری" ئەمەی بە قسەی خۆی لە ل ٢٦٢. ٢٦٣ی (أعيان الشيعة)ی سید محسن أمين العاملی وەرگرتووە. پاشان بە درێژی باسی ڕووداوی سەقیفە ئەکات و ناوی ئەنێ (کارەساتی سەقیفە) بەکورتی هەرچی بیروڕای شیعەکانە ئەیهێنێ کە گوایە ئەبوبەکر خیلافەتی لە (علی) داگیرکردووەو ئەبوو (علی) ببوایە بە خەلیفە نەك ئەبوبەکر، ئیتر دیارە بە تەعبیری موغریازنەی بێتام بێتام بۆ نموونە ئەڵێ (عەلی زاوای)، (ئەبوبەرکی خەزوری)، (عەلی ڕای وابوو ئەبوبەکر پلەی خەلافەتی زەوت کردووە).. ئێمە بۆ وەڵامی ئەم مەسەلەیە ناچارین قسەی تەواو بکەین ئەگەر بە برگەی کورت کورتیش بووە، سەرتا ئەبێ ئەوەش بڵێین کەس نەکەوتووەتە سەرو گوێلاکی یەکتریو کەس بۆ چنگخستنی ماڵو میراتی پێغەمبەریش نەکۆشاوەو ئەو قسانە شورەییە بۆ (میرفطرۆس)و ئەوەشی لەسەر ڕاو بۆچوونی ئەوە، ڕاستی ڕووداوی سەقیفە بەم شێوەیەی خوارەوەیە وەك ڕیوایەتە –صحیح–ەکانی مێژوو باسی ئەکەن:

"پێغەمبەر (ﷺ) کە فەوتی کرد، ئەنسارەکان لە شوێنێکدا کۆبوونەوە کە پێیان ئەوت (سەقیفەی بەنی ساعدە) – کە کەپرێکی گەورە بوو بۆ بۆنەو ئاهەنگەکان –[*] لەوێدا کەوتنە باسو خواستی مردنی پێغەمبەر (ﷺ)و باسەکەیان سەری کێشا بۆ ئەوەی دوای پێغەمبەر (ﷺ) کێ شیاوە کە ئەم سپاردەیە هەڵبگرێ، ڕاگۆڕینەوە دەستی پێکرد، ئەم هەواڵەش گەیشتە موهاجیرەکان بەتایبەتی (ئەبوبەکرو عومەر) زۆر لە سەرەنجامی ئەو مەجلیسو کۆبوونەوانە ترسان نەوەك سەر بکێشێ بۆ تەفرەقە و جیاوازییەکی وا دوایی چارەسەرکردنی سەخت بێت، بۆیە بەپەلە خۆیان گەیاندە کۆبوونەوەکەیانو دەستیان کردە بەشداریی لەگەڵ ئەنصارەکان دا .. ئەنصارەکان سەرەتا بیروڕایان وابوو کە دوو ئەمیر دابنرێ یەکێك لە ئەنصارو یەکێك لە مهاجرین پاش را گۆڕینەوەو موناقەشەی ئەو ڕایەو قەبووڵ نەکردنی لای هەموان ڕایەکی تر هاتە ناو کە ئەمیر لە موهاجرین بێتو وەزیر لە ئەنصار بێت، ئەوەبوو ئەو ڕایەش دوای موناقەشەکردن چانسی قەبوڵکردنی وەرنەگرتو جا ئەوبەکر ڕایەکی وردی دا و مەدحێکی زۆری ئەنصاری کردو[2] فەرمووی: ".. ئەو قسە باشانەی کە کردتان دەربارەی خۆتان ئێوە بە ڕاستی شایانن پێی". جا ڕووی کردە سەعدی کوڕی عوبادەو فەرمووی: "سەعد تۆ خۆت باش ئاگات لەوەیە کە پێغەمبەر جارێکیان فەرمووی . کە تۆش دانیشتبووی: "قريش ولاة هذا الامر فبر الناس تبع لبرهم وفاجرهم تبع لفاجرهم. سەعد وتی : بەڵێ ڕاست ئەفەرمووی، دەی کەواتە من ڕام وایە (ئەمیر) لە ئێوە بێتو (وەزیر)یش لە ئێمە بێت".[3] عومەر ئەفەرموێ: "وەڵڵاهی کە چوینە سەقیفەی بەنی ساعدە، چاکترین ئیشێك کە کردمان ئەوەبوو ڕێکەوتین لەسەر بە خەلیفەبوونی ئەبوبەکر، چونکە زۆر لەوە ئەترساین کە ئەگەر ئەو مەجلیسە بەجێبهێڵین و مەسەلەی بەیعەت تەواو نەکەین دوای ئێمە ئەوان بەیعەت بدەن بە یەکێك و پاشان خەڵکی پێی ناڕازی نەبنو فیتنەو

---

[1] ئیسلامناسی ل٥٩.

[*] چۆن ئێستا باخچەو هۆڵەکان شوێنی ئاهەنگ و بۆنە جۆربەجۆرەکانن سەقیفەی بەنی ساعیدەش شتێك بووە لەو جۆرانە.

[2] (إبن كثير) لە (البداية والنهاية) (٥/ ٢٣٢) ئەڵێ: "فتكلم أبوبكر فلم يترك شيئا أنزل في الأنصار ولا ذكره رسول الله (ﷺ) من شأنه الا ذكره". واتە: کە ئەبوبەکر دەستی کردە قسەکردن باسی هەموو ئەو ئایەتانەی کرد کە لە مەدحی ئەنسار‌دا دابەزیون و باسی هەموو ئەو فەرموودانەشی کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەقی ئەنساردا فەرموویەتی.

[3] البداية والنهاية ٥/٢٣٢.

خراپەیەك ڕووبدات یان ناچار ببین بەیعەتی نابەدڵی بدەین، چونکە هەرکەسێك بەبێ موشاوەرەی موسڵمانان بەیعەت بدات بە کەسێك ئەوە بەیعەتەکەی دروست نییەو خیلافەتەکەش بۆ ئەو دانامەزرێ لە ترسی ئەوەی نەك یەکتری بخەنە ناو کوشتو کوشتارەوە".[1]

(إبن کثیر) زۆر بە وردی سات و کاتەکانی ئەم موناقەشەیە باس ئەکات بۆ نموونە ئەفەرموێ: "ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا فەوتی کرد، بەیانییەکەی ئەبوبەکر نوێژی بەیانی کرد بە ئیمامەت بۆ موسڵمانان، پێغەمبەر (ﷺ) لە ژوورەکەی خۆیەوە پەردەکەی لادا موسڵمانان زۆر دڵخۆش بوون و تەنانەت خەریك بو نوێژەکەش بپڕن، کە ئەبوبەکر نوێژەکەی تەواو کرد چوویە ژورەکەی عائیشە وتی: وا ئەبینم پێغەمبەر (ﷺ) حاڵی باشەو ئازاری نەماوە، ئەمڕۆش سەرەی کچەکەی (خارجە)یە . واتە یەکێك لە ژنەکانی لە . مسبخ . کە ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە ماڵی لەوێ بۆ کردبوو، ئەبوبەکر سواری ئەسپ بوو چوو بۆ ئەوێ کە گەیشتە چێشتەنگاو هەندێك ئەڵێن (زەوال) هەواڵیان برد بۆ ئەبوبەکر کە پێغەمبەر (ﷺ) فەوتی کردووە.[2]. هەروەها ئەڵێ: ".. ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) مرد عەلی و زوبەیر و ئەوانەش کە لەگەڵیاندا بوون لە ژوورەوە لە ماڵی فاتیمەی کچی پێغەمبەردا بوون و موهاجیرەکانیش دەوری ئەبوبەکریان دابوو لە مزگەوتداو ئەنسارەکانیش هەموویان لە سەقیفەی بەنی ساعدە دا کۆبوونەوە[3].. هەروەها ئەڵێ: "لە کۆتایی ڕۆژی دووشەممەدا بوو (واتە دوای نیوەڕۆ بە دواوە) لە سەقیفە بەیعەت درا بە ئەبوبەکرو بۆ ڕۆژی دوایی لە مزگەوتدا بەیعەتی گشتی درایە.[4] کەواتە لەم چەند دەقە کورتەوە ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە:

١. پێغەمبەر (ﷺ) کە فەوتی کردووە، بنەماڵەو مەحرەمەکانی بەدەورییەوە بوون و ئەوەش شتێکی سروشتییەو باقی صەحابەکان هەموو لە مزگەوتداو لە دەوری ئەبوبەکردا خەفەتبارانە دانیشتبون و تەسلیمی واقیعەکە بوون کە مردنی پێغەمبەرە (ﷺ). چونکە تا ئەبوبەکر لە ماڵی خۆیەوە نەهات و نەچوە سەر تەرمەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و پەردەکەی لەسەر دەم و چاوی لانەبردو نەهاتە ناو خەڵکەکەو نەیفەرموو: "من کان یعبد محمدا فإن محمدا قد مات ومن کان یعبد الله فإن الله حی لایموت" زۆر کەس هەر بڕوای نەبوو، بەڵکو هەبووە قەناعەتی وابوو کە پێغەمبەریش هەروەك حەزرەتی عیسا چووەتەوە بۆ ئاسمان و پاش ماوەیەك ئەگەڕێتەوە..

٢. کۆبوونەوەی ئەنصاریش لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) دا دوور نییە هەروەك کۆمەڵێك تەعزیەباری کۆس کەوتوو دانیشتبن و، بەڵام لە ئەنجامی قسەیەکی ئەم و قسەیەکی ئەوەوە ئەنجام گەیشتبێتە ئەوەی باس لە خەلیفەیەك بکرێت کە برا گەورەیەتیان بکات دوای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەش شتێکی سروشتییەو نەك هەر عەیبەیەکی تێدانییە بەڵکو ڕەنج و زەحمەت و تێکۆشانیان ئەوە ئەخوازێت بیر لەوە بکەنەوە کە بەری ڕەنجیان ئاو نەیبات و دوژمن چاویان تێنەبرێت.[5]

٣. کە عومەریش دێت بە خەیاڵیدا خێرا بچن بۆ سەقیفەی بەنی ساعیدە نەوەك شتێك بڕیار بدەن و دوایی پێچەوانەی ڕای زۆرینە بێت و ببێتە مایەی ئاژاوەیەك لە ناو موسڵماناندا، ئەوەش هەر شتێکی سروشتییەو نەك هەر عەیبە نییە، بەڵکو نیشانەی زیندوێتی و هۆشیاری ئەصحابی پێغەمبەریشە (ﷺ).

---

[1] هەمان سەرچاوە ٥/٢٣١.

[2] هەمان سەرچاوە ٥/٢٢٩.

[3] البدایة والنهایة ٥/٢٣٠

[4] البدایة والنهایة، ٥/٢٣٢.

[5] هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەنصارییەکان بۆیە بیریان لە دانانی خەلیفە کردەوە چونکە گومانی ئەوەیان هەبوو کە موهاجیرەکان پاش مردنی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) بچنەوە بۆ مەککەو مەدینە بەجێ بهێڵن.

٤. كه له سهقیفهی (بنی ساعده) شدا ئهو ههمووه گفتوگۆو ڕاگۆڕینهوه ڕوویئهدات و ئهم ڕایهك ئهڵێتو ئهو ڕایهك ئهڵێتو گوێ بۆ یهكتری ئهگرن.. ئهوهش ههر شتێكی سروشتییهو مهسهلهیهكی گهورهی واش ئهوه ئههێنێ یهك دوو سهعاتێك خاوهن كێشه بنهڕهتییهكان پێوهی خهریك بنو تهنهنات دهنگ بهسهر یهكتریشدا بهرزبكهنهوهو لهیهكتریش توڕه ببن..

٥. ئهوهش كه عومهر ئهفهرموێ: "أما ولله ماوجدنا فيما حضرنا امرا هو ارفق من مبايعة أبي بكر خشينا أن فارقنا القوم ولم تكن بيعة ان يحدثوا بعدنا بيعة فاما نبايعهم على مالا نرضى وأما ان نخالفهم فيكون فساد فمن بايع اميرا عن غير مشورة المسلمين فلا بيعة له ولا بيعة للذي بايعه تغرة ان يقتلا".[1] ئهمهش شتێكی سروشتییهو له ڕاستیشدا ههروایهو ئهگهر بهڵگه بێت لهسهر شتێك ئهوه بهڵگهیه له سهر زیندوێتی ههستی بهرپرسیارێتی عومهرو جگه له عومهریش.

٦. ئهوهش كه ئهبوبهكر ئهفهرموێت: "ولقد علمت يا سعد ان رسول الله (ﷺ) قال . وأنت قاعد .: "قريش ولاة هذا الأمر فبر الناس تبع لبرهم وفاجرهم تبع لفاجرهم".

واته: قوریش بهرپرسو كاربهدهستانی ئهم كارهن، چونكه چاكهكانیان بهشوێن چاكهكانیاندا ئهڕۆنو خراپهكانیشیان به شوێن خراپهكانیاندا ئهڕۆن..

ئهمهش ههر شتێكی سروشتییه ئهبوبهكر لای . ئهنصارهكان . بیڵێو شتێكی سروشتیشه كه پێغهمبهر (ﷺ) بیفهرموێ، چونكه ئهوكاته قوڕهیش زۆرینهی خهڵكی ناوچهكه بووهو ناسازو ناڕاست بووه كه كهمینهیهك بكرێته حاكمی سهر زۆرینه.. وهك له ههموو دونیاشدا ئهم ڕێسایه پهیڕهوی لێدهكرێت.

٧. ئهوهش ههر سروشتییه كه ئهبوبهكرو عومهرو ئهبوعهبیده . وهك له ڕیوایهتێكدا هاتووه بهسێ قوڵی بچن بۆ سهقیفهو عهلی یان زوبهیر بۆ نمونه لهگهڵ خۆیان نهبهن، چونكه لهلایهك ئهوان وهكو مهحرهمی پێغهمبهر (ﷺ) له ژوورهوه نزیك به جهنازهی پێغهمبهر (ﷺ) بوونو زیاد له خهڵكی تر دڵ بریندار بوونو لهلایهكی تریشهوه حاڵهتهكه وانهبووه كه ههرچی ههیه ئاگاداربكرێ له ڕۆیشتنهكهیانو لهلایهكی تریشهوه ئهوان بۆ ئهوه نهڕۆیشتن ئهو ههموو موناقهشهو (جهڕو بهحسه) بكهن، بهڵكو سروشتی كۆبوونهوهكه ئهوهی هێنایهپێشهوهو له پاشانیشدا كه ئهبوبهكر كرایه خهلیفه (عوزرخوایی) هێنایهوه بۆیان ئهوانیش ڕهچاوی ههلو مهرجهكهیان كرد. ئهوهتا (ئیبن كهثیر) ئهفهرموێ: ئهبوبهكر ڕوداوی سهقیفهی بۆ (رافعی طائي) ئهگێڕایهوه فهرموی: كاتێك ئهنصار بهیعهتیان پێدام له سهقیفهدا منیش له ترسی ئهوهی نهك فیتنهیهك و بهدوایدا پاشگهزبوونهوهیهك ڕووبدات ناچار قهبووڵم كرد" جا ئیبن كهثیر به دوای ئهم قسهیهی ئهبوبهكردا ئهفهرموێ (ئهبوبهكر (ڕهزای خوای لێ بێت) ئیمامهتی بۆیه قهبووڵ كرد ترسا ئهو فیتنهیهی له قهبوڵنهكردنی ئهكهوێتهوه زۆر گهورهتر بێت لهم قهبوڵكردنهی"[2].. ئهصحابی پێغهمبهر (ﷺ) بهتایبهتی موهاجیرهكانو به تایبهتی تر عهلی و زوبهیر ههر زوو له مهبهستی قهبوڵكردنی ئهبوبهكر بۆ خیلافهت حاڵی بوون، بۆیه كه ئهبوبهكر عوزرخوایی بۆ ئهكردنو ئهیوت: "ماكنت حريصا على الامارة ولا ليلة، ولا سألتها في سر ولا علانية". علیو زوبهیر وتیان: "ما غضبنا الا لأنا أخرنا عن المشورة، وإنا نرى أن أبابكر أحق الناس بها، إنه لصاحب الغار وإنا لنعرف شرفه وخبره، ولقد أمره رسول الله ﷺ أن يصلي بالناس وهو حي".[3] واته: توڕهییو عادزی ئێمه ههر لهبهرئهوه بوو كه هیچ پرسێكمان پێنهكرابوو ئهگینا گشتمان ئهزانین شایهنترین

---

[1] البداية والنهاية ٥/٢٣١. له پێشهوه تهرجهمهی ئهم قسهیهمان كرد.

[2] البداية والنهاية ٥/٢٣٢.

[3] البداية والنهاية ٥/٢٣٤.

کەس بۆ ئەم کارە ئەبوبەکرە، ئەبوبەکر هاوڕێکەی ئەشکەوتەو هەموومان ئاگامان لە هەواڵو شەریفی ئەو هەیە، ئەوە ئەزانین کە پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە ژیاندا بوو فەرمانی پێکرد ئیمامەتی نوێژ بکات بۆ خەڵکی..

ئیتر نازانم (میرفطرۆس) بۆ ڕووداوی سەقیفە ناوئەنێ کارەسات و سەدو یەك عەیبەی لێ ئەدۆزێتەوە؟ و بە تەعبیری ناعاقڵانەو نامرۆڤانە ئەڵێ: "ئەبوبەکر کە کەسایەتییەکی هەلپەرستو دەوڵەمەند بوو کرا بە جێگری یەکەمی پێغەمبەرو خەلیفەی یەکەم".[1] یان ئەڵێ: "کۆچی دوایی موحەمەد کۆتایی ئەو (یەکێتییە پیرۆزە) بوو کە لە ژێر دروشمی (برایەتی و یەکسانی ئیسلامی)دا ئەرستۆکراتو دەوڵەمەندە چەوسێنەرەکانی بە زەحمەتکێشانی هەژارەو گرێدەدا".[2] ئاخر کەی وابوو؟ یانی تۆ قەبوڵت نییە ئەصحاب ڕاگۆڕینە بکەن؟ قەبوڵت نییە ڕای یەکتر موناقەشە بکەن. ئەوە ئەم جۆرە بنیادەمانە چۆن بیردەکەنەوەو بە چی ڕازی ئەبن، ئیسلام خەڵك فێری عەقڵو موناقەشەو ڕاگۆڕینەوە ئەکات ڕەخنە ئەگرن، فێری تەسلیم بوونو ملکەچییان ئەکات هەر ڕەخنە ئەگرن، بنەما گشتییەکانی مەسەلەیەك وەك (حوکم) یان هەر شتێکی تر دائەنێ ئەڵێن ئیسلام عەقڵ لە قاڵب ئەدات ئەگەر جێی ئەهێڵێ بۆ (عەقڵ)ی خەڵك ئەڵێن ئیسلام ئەو جۆرە باسە گرنگانە (!)ی باس نەکردووە.

باشە خۆ هەرپاش ئەو موناقەشە کەمەو لەسەر ئەو مەسەلە گەورەیە کە ئەمڕۆ عاقڵانی دنیا جاری واهەیە هەفتەو مانگو ساڵ پێوەی خەریك ئەبن و بۆیان حەل ناکرێ و دواییش هەر ئەبێتە مایەی (تەفرەقە)و ئاژاوەی ئەو وڵاتە، ئەنصارەکان لە ڕۆژی دوایداو لە ماڵی سەعدی کوڕی عوبادە(*)دا کە ئەبوبەکرو عومەریشی تێدا بوو، وتارخوێنەکەیان هەستاو وتی: خۆ ئێوە ئاگادارن پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لە کۆچکەران بوو، خەلیفەکەشی هەر لە کۆچکەرانە، ئێمەش ئەنصارو پشتیوانی پێغەمبەری خوا بووین و ئێستاش ئەنصارو پشتیوانی خەلیفەکەی ئەبین وەك چۆن پشتیوانی ئەو بووین".[3] دەی ئیتر کوا سێبەری بوختانەکەی تۆ کە ئەڵێی برایەتییەکەیان نەما؟!

. (میرفطرۆس) باسێکی (غدیر خم) ئەکات، گوایە پێغەمبەر لە "غدیر خم" دا بەیعەتی لە هەرچی (صحابە) هەیە وەرگرتووە کە ئەبێ دوای خۆی (علی) بکەنە خەلیفەی خۆیان، بەڵام هەر خۆی (هەشت) ڕەخنەی لۆژیکانەی لێ ئەگرێتو ڕەتی ئەکاتەوە کە گوایە ناکرێ ئەو شتە ڕووی دابێت، لەوەشدا ئەلهەق ڕاست بۆی چووە هەرچەندە ئەو تێبینیو ڕەخنانە هەمووی هی خۆی نینو لە (طبری)و (فلیپ حتي)و (نەوبەختی) هەندێکیانی وەرگرتووە، بەڵام لە دەروازەی ئەو ڕەخنانەوە قسەی ناڕاستو نابەجێ و ناشیرینی زۆر ئەکاتو ئێمە باسی ناکەین و بەجێی دێڵین.

دوای ئەم هەشت ڕەخنەیە ئەڵێ: "هەرچۆنێك بێت کارەساتی سەقیفەو ناکۆکی لەسەر خەلافەت و ئیمامەت سەرەکیترین ناکۆکی ئاشکرای نێوان پێشەواو ڕێبەرایەتییەکەی ئیسلام بوو".[4] ئاخر نازانم کام ناکۆکی، ئێ هەموو مەسەلەکە ئەوە بوو گفتوگۆیەکی برایانە لە نێوان (ئەنصارو مهاجرین) دا ڕووی داو هەموو ڕێککەوتن لەسەر ئەبوبەکرو ئاو بێنەو دەست بشۆ، ئیتر ناکۆکی چیو کەوتنەسەرو گوێلاکی یەکتری چی، ئەم کابرایە ڕێز نە لە خۆی نە لە عەقڵیو نە لە خوێنەرانی ناگرێت، بەڵام دیارە هەر حەدیسەکەیە کە ئەفەرموێ: "إذا لم تستح فاصنع ماشئت".[5]

. (علی میرفطرۆس) گەڕ ئەپێچێتە (حەزرەتی ئەبوبەکر)و (حەزرەتی عومەر) و ئەڵێ: "سەردەمی کورتی دەسەڵاتی ئەبوبەکر پڕ بوو لە سەرکوتو دامرکاندنەوەی سەختو خوێناوییانەی ڕاپەڕینەکانی خەڵك، هەروەها

---

[1] ئیسلامناسی ل٦٣.

[2] ئیسلامناسی ل٦٣.

(*) قسەکە هی (أبن کثیر)ەو قسەی ئێمە نییە سەیری (البدایه والنهایه / ٢٣٣/٥) بکە.

[3] البدایەی والنهایه ٢٣٣/٥.

[4] ئیسلامناسی ل٦٦.

[5] لە پێشەوە سەرچاوەکەیمان وتوە.

سەردەمی خەلافەتی عومەریش بە جۆرێك سەختو پڕ لە كاری توندوتیژی بوو كە هیچ كەسێك نەیدەتوانی بەرانبەر بە هیچ شتێك دەنگ هەڵبڕێت.. تەنانەت عومەر تەفسیركردنی قورئانیشی بەناڕەوا دەزانی و لەوەش زیاتر دەمەتەقێی لەسەر ئایەتەكانی قورئان بە كفر دەزانی".[1] ئەم زانیارییە سەقەتانەی بە قسەی خۆی لە (نهج الفصاحە) وەرگێڕانی (أبوقاسم پایندە) ل٨٩و ٢٧٨) (!!) وەرگرتووە.

بۆ وەڵامی ئەم زماندرێژییەشی دەربارەی ئەو دوو زاتە پڕ كەماڵە ئەڵێین:

١. سەركوتكردنی كێ؟ پێغەمبەرەكانی درۆیی؟ كە تۆ ناویان ئەنێیی ڕاپەڕینەكانی خەڵك (!!) ئاخر ئەوە ویژدانە بۆت! یان ئەوە ویژدانە ئەڵێی: كاتێك پێغەمبەر كۆچی دوای كرد زۆربەی خەڵك لە ئایین وەرگەڕان" ل٦٩. ئاخر زۆربەی یان خەڵكێكی زۆر، یان ئەڵێ: "پێغەمبەری خوا لە ژیاندا بوو كە (طلیحة) لە ئایین وەرگەڕاو داوای پێغەمبەری كرد لەوكاتەوە ژمارەی موسڵمانان بەردەوام ڕووی لە كەمی دەكردو خەڵكەكەش روویان لە "طلیحة" دەكردو كارەكەی سەری گرت". ل٧٠.

یان بەبێ شەرمو شورەیی ئەڵێ: ".. لایەنگرانی موسەیلەمە لە گۆڕەپانی شەردا ئازایانە و خۆڕاگرانە خۆیان گرتو داكۆكییەكی پیاوانەیان كرد". ل٧١، پاشان نەزانانەو بێویژدانانە ئەڵێ: "لەم شەرەدا (مەبەستی شەری یەمامەیە لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا) تەتەرەكەی حەزرەتی محمد (رحال) كە لێی هەڵگەڕابویەوە،[2] ببووە كەواسووری بەرلەشكری موسەیلەمە خۆڕاگرییەكەیان بە ڕادەیەك بوو كە ئەوەندەی نەمابوو موسڵمانان تێكبشكێنن". ئاخر وەك كابرای عەرەب ئەڵێ "شر البلیه مایضحك".

بەڕاستی ئەمەی میرفطرۆسیش هەر وایە، ئەو هەمووە مەدحەی موسەیلەمەو شوێنكەوتەكانی لەپای چی ئەكات، ئاخر هەرچی مێژونووسی دنیا هەیە چ موسەیلەمەو چ طلیحةو چ عەنسیو چ سجاح و ئەمانە بە خەڵكانێكی درۆزنو لادەرو خاوەن فەرهەنگی بێ مانا ئەزانن، ئەم (علی میرفطرۆس)ە نەبێت بەریبەری ڕاپەڕینو ئازاو خۆگرو داكۆكی پیاوانە (!)و چیو چی ئەزانێ، نازانم جگە لە پەندە كوردییەكە چی ترە كە ئەڵێ: "تەیری گول عاشق بە داری ژەقنە بووتە".

٢. ئەی عومەر سەختیو توندوتیژی لە چی بوو؟ كە كەس نەیوێراوە دەنگ هەڵبڕێ، كەی وابووە؟ مەگەر عومەر نەیفەرموو: ئەم كاربەدەستانە كە دانراون بۆ ئەوە دانروان خزمەتكاری ئێوە بن نەك مایەی زەحمەت بن بۆتان، هەركەسیش گلەیی و گازندەیەكی لە كاربەدەستو بەرپرسانی خۆی هەیە با پێی بگەیەنێت.. عومەر شیعاری: "متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم أحرارا"ی بەرزكردەوە لە هەموو هەرێمەكاندا. ئەبوبەكری جەزائیری لە كتێبی (منهاج المسلم)دا ئەڵێ: "عومەری كوڕی خەتتاب لە شوێنێكدا دانیشتبوو كابرایەك هاتە لای كە خەڵكی میصر بوو وتی: "ئەی ئەمیری موسلمانان، پەنام بۆ هیناوی، عومەر فەرمووی: چیت لێقەوماوە؟ وتی: لەگەڵ كوڕێكی عەمری كوڕی عاصدا (كە سەرۆكی هەرێمی میصر بوو لەو كاتەدا) پێشبڕكێیەكمان كردو من لەوم بردەوە كەچی بەدار هات پێمداو ئەیوت من كوڕی ئەشرافم كە ئەمەگەییە (عەمری باوكی) لەترسی ئەوەی نەیەمە خزمەت جەنابت زیندانی كردم وا خۆم گەیاندوەتە جەنابت.

عومەری كوڕی خەتتاب نامەیەكی بۆ عەمر نووسی كە تێیدا ئەڵێ: "ئەگەر ئەم نامەیەت گەیشتە دەست خێرا خۆتو فلانە كوڕت بۆ حەجی ئەمساڵ لێرە ئەبن". بە كابرای میصریشی وت: "لای ئیمە بمێننەوە تا ئەوان ئەگەنە ئێرە، عەمر لەكاتی حەجدا گەیشتە مەككەو كە عومەر لە حەجەكەی بوویەوە لەناو خەڵكەكەدا دانیشتو عەمرو كورەكەشی لە نزیكی عومەرەوە دانیشتبوون، عومەر (درە)[3] كەی خۆی هەڵدا بۆ كابرای میصریو فەرمووی:

---

[1] ئیسلامناسی ل٦٧.

[2] لە پێشەوە وەڵامی ئەوەمان دایەوە كە ئەوەنە ناوی (رحال)ەو نە نوێنەری پێغەمبەریش (ﷺ)بووە، سەیری ل٨٧) بكە.

[3] "درە" ناوی ئەو دارە بوو كە بەردەوام وەك گۆچانی دەست، بە دەستی حەزرەتی عومەرەوە بوو.

ئادەی تا ئەتوانی دارکاری ئەم کوڕی ئەشرافە بکە، ئەوەندەی داردا لە کوڕەکەی عەمر خەڵکەکە حەزیان ئەکرد ئیتر دەست هەڵبگرێ عومەر هەر ئەیفەرموو: "إضرب إبن الأكرمين". کابرا وتی: ئەی (أمير المؤمنين) هەقی خۆمم لێکردەوە بە زیادەوە ئیتر بەسە، عومەر فەرمووی: ئادەی ئەو دارە ڕابگرە لەسەر سەرە (ئەصلەعەکەی) عەمری باوکیشی، کابرا تەریق بوویەوەو وتی: "ئەی (ئەمیری موسڵمانان) من هەقم بەلای کێوە بوو بە زیادەوە لێم سەندەوە. عومەر فەرمووی: دەی سوێند بەخوا ئەگەر دارکاری باوکیشت بکردایە تاخۆت وازت نەهێنایە کەس دەستی نەئەگرتی.. پاشان ڕووی کردە عەمرو فەرمووی: "یاعمرو! متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا".[1] ئەوە کەی ئەم خەڵکەتان کردووەتە کۆیلەی خۆتان لە کاتێکدا دایکی ئەوان بە ئازادی ئەمانی بووە.

قەیصەری ڕۆم نوێنەرێکی ناردە لای عومەر تا هەواڵێکی وردی عومەری بۆ بهێنێتەوە کە نوێنەرەکەی قەیسەر هاتە مەدینە پرسی: ئەرێ پاشاکەتان لە کوێیە؟ وتیان ئێمە پاشامان نییەو ئەمیرمان هەیە، شوێنەکەیان نیشان دا و کابرا سەیری کرد حەزرەتی عومەر (درە)کەی ناوەتە ژێر سەری‌و لەبن دارێکدا پاڵکەوتووە، کابرا سام گرتی‌و وتی: .. زۆر سەیرە هەرچی پاشای دونیا هەیە لە ترسی ئەم کابرایە خەویان لێناکەوێ، کەچی ئەمیش ئالێرەدا بە کەماڵی ئیسراحەت بێترس لێی ڕاکشاوە (جا ئەو قسە بە ناوبانگەکەی کرد کە بوویە پەند لەناو خەڵکیداو دەم بە دەم ئەگێڕایەوە؟) وتی: یاعومەر! "عدلت فامنت فنمت" بەڵام پاشاکانی ئێمە بۆیە خەویان لێناکەوێت چونکە هەمیشە دەستیان لە ستەمکاریدایە.[2]

دادو دادپەروەری عومەر هەموو دونیای پڕکردووەو دوورو نزیك باسی دەکەن کەچی (میرفطرۆس) باسی سەختگیری عومەر ئەکات‌و ئەڵێت: نەیهێڵاوە کەس دەنگ هەڵبڕێت.

ڕاستە نەیهێڵاوە خەڵکی خراپ، یان خەڵکی نەفس نزم دەنگ هەڵبڕن! بەڵام ئەوەش بوو بە رەخنە ؟!

یان ئەڵێ عومەر تەفسیرکردنی قورئانی بە ڕەوا نەزانیوە!! و موناقەشەو دەمەتەقێی لەسەر ئایەتەکان بە کفر زانیوە!!

ئاخر کوا بەڵگە؟ ئەڵێی لە ل٨٩. ٢٧٨ی نهج الفصاحەی پایندە وەرمگرتووە.. کەس نەما ژیانی عومەری لێوەربگری (پایندە) نەبێت، ڕاستە من ئەو کتێبەم نەدیووەو دەستیشم نەکەوت، نازانم ئایا میرفطرۆس پاکانە یان ناپاکانە ئەم زانیارییەی گواستووەتەوە، بەڵام ئەوەی گومانی لێناکرێت زانیارییەکە وا نییە.

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەوەندە خۆشی لە کەسێك هاتووە بتوانێت مانای وورد لە قورئان دەربهێنێت، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی هەر لە بەرئەوە کردبوویە یەکێك لە ئەندامانی شوراکەی خۆی کە تەمەنی لە هەموویان مناڵ تر بوو، کە هەستی کرد پیاوە بە تەمەنەکانی ناو شوراکەی جۆرێك لە تێبینی‌و گلەییان لەو بڕیارەی هەیە، هات تاقی کردنەوەیەکی کردن‌و پرسیاری ئەوەی لێکردن هەریەکە لای خۆیەوە ئاماژەکانی سوورەتی (النصر)ی بۆ باس بکات، هەریەکەیان شتێکی ووت، پاشان ڕووی کردە عەبدوڵڵاو فەرمووی ئەی تۆ چی دەڵێی؟ عەبدوڵڵا وتی: قوربان! من وا ئەزانم ئایەتی: "إذا جاء نصر الله" ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتۆتە کۆتاییەکانی و کاری لە تەواو بووندایە، بۆیە فەرمانی پێئەکات کە تۆبە تازە بکاتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی.. عومەر فەرمووی: منیش هەروەك تۆ لێی تێئەگەم".[3]

ڕاستە عومەر خۆشی لەوە نەهاتووە موسڵمان زۆر لە خۆی بکات بۆ دەرهێنانی مانایەکی تایبەتی لە ئایەتێکی قورئان یان لە حەدیسێك، هەروەها دژی ئەوە بووە بە دوای (متشابهات)ی قورئاندا بڕۆی، ئەویش لەبەرئەوە بووە

---

[1] منهاج المسلم/ أبوبكر الجزائري ص٢٣٢. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم فریشتیە کە (میرفطرۆس) بە گلەییەوە باسی ئەکات سەیری (فریشتەکانی سەر زەوی) – طە بابان – بکە، ئەو بەشەی باسی عومەری کوری خەتتاب ئەکات.

[2] منهاج المسلم ص٢٣٣. هەروەها، نظرات في السيرة / حسن البنا ص٨٤.

[3] تذكرة الدعاة، البهي الخولي/ ص٧٦. هەروەها (السيرة النبوية / الصلابي) ٢/ ٦١٢.

که قورئان نەبێتە شتێکی منداڵانەو زاناو نەزان دەمی بۆ بەرن، وەك چۆن ئێستا "میرفطرۆس" بە نەزانی دەم لە تەفسیری قورئان ئەکوتێ‌و کەچی جوان بۆشی ناڕواتو ئاوەژووی ئەکاتەوە، وەك چۆن لە پێشەوە چەند نموونەیەکمان باس کرد.. بەڵام خۆ ئەوە مانای ئەوە نییە کە عومەر دژی تەفسیرکردنی قورئان بووبێت.

بۆ ئەوەش کە ئەڵێی: عومەر دەمە تەقێی لەسەر قورئان پێ کوفر بووە، لەوانەی پێشوو زیاتر لە ڕاستی دوورە، عومەر دەمەتەقێی پێ کوفر نەبووە، بەڵکو (جدل)و دەمەدەمێ‌و ئایەت بەشەڕدانی لانادروست بووە، چونکە ئەم قورئانە بۆ ئەوە نەهاتوە کە ئایەتێکی بچێت بەگژ ئایەتێکی تردا، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە مانای ئەم ئایەتەیان مانای ئەو ئایەتەی تریان تەواو بکات، وەك چەند نموونەیەکمان لە پێشەوە باس کرد، کە عومەر چ فقهێکی (سیاسیو یاسایی) گەورەی لە ئایەتەکانی سوورەتی (الحشر) وەرگرتووەو چۆن هاوەڵانی پێغەمبەری تێگەیاند کە ئەو ئایەتانە ئەمیان مانای ئەوی تریان تەواو دەکات، ئیتر (میرفطرۆس) ئەو زانیاریە سەقەتو ناتەواوانە با بباتەوە بۆ (پایندە)کەی لای خۆی، چونکەماڵی قەڵب سەر بە ساحێبی خۆیەتی.

. (میرفطرۆس) لە کۆتاییەکانی ئەم بەشەدا کە بە ناونیشانێکی کینەدارانە دەست پێدەکات و ئەڵێ[1]: "دەسەڵاتی خەلیفەکانی ڕاشدین و سەردەمی دەستدرێژی و پەلهاویشتنی ئیسلام" کە ئەوە جگە لەوەی تەعبیرێکی بوغزنانەو کینەدارانەیە لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکانیشدا ناگونجێ، چونکە فتوحاتی ئیسلامی بۆ ڕزگارکردنی میللەتانی ژێر دەستەو بێ دەرەتان بووە، بۆ ڕماندنی قەڵای زۆرداری بووە ئەوەش مێژوو با بدوێ‌و ئەوەش زانایان و مێژوونووسانی بە ویژدان با باسی ئەوە بکەن، خەڵکی وڵاتی فارس بۆچی باوەشیان بۆ ئیسلام کردەوە، ئەی خەڵکی بندەستی ڕۆم بۆ پێشوازییان لە سوپای موسڵمانان ئەکرد.. لە کۆتاییەکانی ئەم بەشەشدا هەندێ تووڕەیی پێوە دیارە، چونکە وا دیارە باسەکە باسی ئێران و سوپای ئیسلامو ڕمانی دەوڵەتی ساسانیو ئەو شتانەیە بۆیە ئەڵێ: "دروشمی بریقەدارو دڵخوازانەی (یەکسانی ئیسلامی) کە ئێرانییەکان بە هەڵە تێیگەیشتبوون (!).. بوونە هۆی ئەوەی کە داکۆکیکەرانی سنورەکانی ئێران یەك لە دوای یەك لە لایەن سوپای عەرەبەوە تێکبشکێنرێن).[2].. (لە شەڕی نەهاوەندیشدا ئێرانییەکان نزیکەی چوار سەد هەزار کەس بوونو لەسەر خۆڕاگری و لە خۆبووردوویی سوێندیان خوارد بوو، عەرەبەکان ئەوەندەیان لە ئێرانییەکان کوشت کە مەگەر خوا هەر بۆ خۆی بزانێت.. ئەوەندەشیان موڵکانە و تالانی بەرکەوت کە لە هیچ کتێبێکدا بەو ئەندازەیە باس نەکراوە).[3]

"عەلی میرفطرۆس" لەسەر باسەکەیەوە بە تووڕەیی دەست پێئەکات تا کۆتایی ئەم باسە، ئەوەتا ئەم سەر باسەی تر دائەنێ و ئەڵێ (هێرشی عەرەبەکان بۆ سەر ئێران) لە کاتێکدا لە هیچ کتێبێکدا ئەو باسە وا نانووسرێ، بەڵکو لە جیاتی عەرەب موسڵمانو لە جیاتی ئێران وڵاتی فارس ئەوترێ، بەڵام وادیارە (میرفطرۆس) لەوەدا خۆی باشتری لێ ئەزانێ‌و خۆی ئەزانێ ئەڵێ چی، ئەزانێ لە ڕاستیدا موسڵمانەکان دەوڵەتی ڕیشەداری هەزارساڵەی ئێرانیان ڕووخاند، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەو دەوڵەتە تا بینە قاقای لە ستەمکاری و کاری نامرۆڤانەدا غەرق بوو بوو.. ئاخر خۆ (میرفطرۆس) خۆی کەباسی هۆکارەکانی کەوتنی دەوڵەتی ساسانی ئەکات یەك ڕیز هۆکار باس ئەکاتو ئەڵێ: ".. ناکۆکییە ناوەکییەکانی ناوخۆی ساسانییەکان و بوونی ناتەبایی قوڵی چینایەتیو چەوساندنەوەو هەژاری کۆمەڵانی خەڵك و بیستو چوار ساڵ بەردەوامبوونی شەڕیان لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵاتی (بیزانس) داو لە ئاکامدا: (خاڵی بوونەوەی خەزێنەی دەوڵەتو بەکارهێنانی زەبرو زەنگ دژی خەڵکی و داسەپاندنی سەرانەو باجی قورس بەسەر کۆمەڵانی شارو لادێداو هەروەها ڕێککەوتنی ڕۆحانیو کۆنەپەرستە ئاینییەکان لەتەك ئەرستۆکراتو مڵکدارو دەربارییەکانداو نائومێدی و دڵساردی ئێرانییەکان پاش سەرکوتکردنی

[1] ئیسلامناسی ل ٧٤، ٧٥.
[2] ئیسلامناسی ل٧٤و ٧٥.
[3] ئیسلامناسی ل٧٦.

بزووتنەوەی هاوبەشی "مەزدەك" و بە گشتی هیواو چاوەڕوانی کۆمەڵانی خەڵك بۆ سەر هەڵدانی ئەو قارەمانو فریادڕەسەی کە لە ئاییینی زەردەشتو "مانی"دا باسی لێوە کرابوو.. ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە داکۆکی کەرانی سنوورەکانی ئێران یەك لە دوای یەك لە لایەن سوپای عەرەبەوە تێکبشکێنرێن).[1]

دەی ئەبێ بۆ ڕماندنو ڕووخاندنی دەوڵەتێکی ستەمکارو ڕزیووی وا گریانو فوغان بکرێت؟ یان ئاهەنگو شایی بکرێت؟ ڕزگارکردنی ئەو هەمووە دانیشتوەی لە ئیمپراتۆریەتێکی زوڵم لێووچووی ئاوادا ئەبێ (میرفطرۆس) بخاتە سەماو کەیف یان ئاوەها خەفەتبارو تووەڕەی بکات؟ ئێمە هەر ئەوەندە ئەڵێین: دیارە (میرفطرۆس) خۆی ئەزانێ چی ئەنووسێ و بۆچی بەداخە، بەڵام سەد حەیف بۆ (شوان .ع)و کوردە وەرگێڕەکەی لای خۆمان کە بەبێ ئەوەی بزانن، شین بۆ دەوڵەتی ساسانی فارسی ئەکەن کە یەکێك لە تاوانەکانی ئەو دەوڵەتە تواندنەوەی میللەتی کورد بووە.. نەفرین لە نەزانینو لە گێلیو بودەڵەیی کە مرۆڤ هەر لە لای خەڵکی ڕیسوا ناکات بەڵکو ڕووزەردی بەردەمی خواشی ئەکات.

. (میرفطرۆس) پێی ناخۆشە خەڵکی ئێرانی دەوڵەتی ساسانییان داوە بە ئاوداو موسڵمان بوون، بۆیە ڕەخنە لەو خەڵکە دەگرێو ئەڵێ: "ئەرستۆکۆاتەکانی ئێران دەبنە موسڵمان".[2](!!) هەروەها ئەڵێ: "ئەرستۆکرات و فیئوداڵە ئێرانییەکان وایان بە چاك زانی ببنە موسڵمانو بەرژەوەندی قازانجە چینایەتییەکانیان وەکو جاران ئاسایی بپارێزن".[3] هەروەها باسی گەورە پیاوانی ئەسفەهان دەکات، و ئەڵێ: "هەر ئەوەندەی دێی (جی) داگیر کرا ملیان کەچ کردو بوونە باجدەر، پاشان خۆیان لە دانی سەرانەش لاداو بوونە موسڵمان".[4] بە هەناسەساردییەکیشەوە ئەڵێ: "ئینتەرناسیۆنالیزمی ئیسلامی بەهێورکردنەوەی خەڵك بوویە چەکی ئایین بەرانبەر بەو ئیمپریالیزمە توندوتیژەی کە ئەرستۆکراتی عەرەبو کۆیلە تورکەکانیان بنیاتیان نابوو".[5]

لێرەدا تەنیا یەك ڕاستی هەیە ئەمەوێ بیڵێم بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بڕگانەی سەرەوە ئەویش ئەوەیە کە سوپای ئیسلامی ڕووی لە وڵاتان ئەکرد لە سەرتادا ئەو خەڵکە وەك پێویست نە ئیسلامو نە موسڵمانانی نەئەناسی بۆیە هەندێ لە میللەتان شەڕیان هەڵبژارد یان (جزیە)دانیان هەڵدەبژارد، بەڵام کە لەوەودوا خەڵکی لەگەڵ موسڵماناندا ئەژیان و گوێبیستی ئامۆژگاری و ڕاسپاردەکانی ئیسلام ئەبوونو دەستپاکیو ڕەوشت بەرزی موسڵمانانیان بۆ دەرئەکەوت، سەیر ئەکەن ئەم دینە لە خێر بەولاوە شتێکی تری تێدا نییە، بۆیە زۆری نەئەبرد لە دڵەوەو بە قەناعەتەوە ئیسلامیان قەبووڵ ئەکردو ئەبوونە موسڵمانو لە پێناوی گەیاندنیشیدا تێدەکۆشان، ئەوەش شتێکی سورشتییەو مرۆڤ دوژمنە بەو شتەی کە نایناسێتو زانیاریی نییە دەربارەی، هەرکە بۆشی دەرکەوت کە ئەو شتەی ئەم دوژمنایەتی ئەکات شتێکی بە کەڵکە، قەناعەتی بەرانبەری ئەگۆڕێت مەگەر ئەو کەسە لە خودی خۆیدا خراپ بێت . مەگەر نەگبەتی گرتبێتی . ئەگینا ڕای ئەگۆڕێتو لەو بیروڕایەی پێشووی پەشیمان ئەبێتەوە .

ئەم بزاڤی بە موسڵمان بوونە لە هەندێ کاتو سەردەمدا ئەوەندە زۆر بووە چاوەڕوانی ئەوە کراوە کە ناموسڵمان نەمێنێت، وەك سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، بۆ نموونە: کاربەدەستێکی عومەر نامەیەکی بۆ نووسی و تێیدا ووتبووی: "ئەهلی زیممە" بەلێشاو موسڵمان ئەبنو دێنە ناو ئیسلام و دوورنییە کە (جزیە) وەك سەرچاوەیەکی دارایی دەوڵەت هەر نەمێنێ، عومەر بۆی نوسییەوە و فەرمووی: من ئەوکاتەم پێخۆشە دیاردەی وا

---

1 ئیسلامناسی ل٧٤و ٧٥.

2 ئیسلامناسی ل٧٧.

3 ئیسلامناسی ل٧٨.

4 ئیسلامناسی ل٧٨.

5 ئیسلامناسی ل٧٩.

ببینم، ئەگەر "بیت المال"یش نەیتوانی مووچەی منو تۆ بدات هەریەکەمان دەست ئەکەینە جوتیاریو لە نانی دەستی خۆمان ئەخۆین.[1]

حەزرەتی عومەر "جەڕاحی کوڕی عەبدوڵڵای حەکەمی" لە سەرۆکایەتی هەرێمی خۆراسان لادا لەسەر ئەوەی کە وتبووی من "جزیە" هەر ئەسەنم لە کافرەکان با موسڵمانیش بن، عومەر کاغەزێکی بۆ نووسی و تێیدا فەرمووی: "إن الله إنما بعث محمدا داعیا ولم یبعث جابیا". ئیتر عەبدوڕڕەحمانی کوڕی نەعیمی قوشەیری خستە جێگەکەی.[2]

لەبەرئەوە (میرفطرۆس) ناهەقی ئەکات بەبێ زانیاریی تەواو یان بەبێ زانیاری دروست، گلەیی لە خەڵکی ئێران ئەکاتو ئەڵێ: "ملیان کەچکردوو بوونە باجدەرو پاشان خۆیان لە دانی سەرانەش لاداو بونە موسڵمان"!! ئەی باشە چی بکەن بە ڕای تۆ؟ هەر لە سەر نکولیو عینادی بەردەوام بن (تۆ ئاسا) لە کاتێکدا بۆشیان ڕۆشن ئەبێتەوە کە ئیسلام لە خێرو چاکە بەولاوە هیچی تری تێدا نییە.

کابرا سەرەتا هیچی لە ئیسلام نەزانیوە، هەرکەسیشی بینیبێ باسی لەدواکەوتوویی عەرەبو خەڵکی (دوورگەی عەرەب) کردووە، تەنانەت لە ناو فارسدا وا باوو بوو کە عەرەب کۆیلەو دەرباری فارسەکانن، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) کە نامە ئەنووسێ بۆ (کیسرا ئەپرۆیز)ی پاشای فارسەکان "کیسرا" نامەکە ئەدڕێنێ و ئەڵێ: "ئەو کۆیلەی منە چۆن زاتی کردووە نامەم بۆ بنووسێ". کە ئەمەش گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "مزق ملکە" خوا موڵکەکەت لەتو پەت بکات".[3] مەحوی شاعیریش ئەو هەڵوێستە ئەکاتە شیعرو ئەفەرموێ:

خودا بیدا ئەدەب "حرز الأمان"ێکە عەطییەی رەب

چ بوو جەرگی بڕی غەیری ئەمەی نامەی دڕی خوسرەو[*]

دەی ئەو میللەتە هەژارە کە لە لایەک تیرۆری فیکری کراونو لە لایەک تیرۆری دەوڵەتی و سوڵتانی، چی بکەن لە کاتێکدا کە سوپای ئیسلامی (سێ) شت ئەخاتە ئیختیاریان: یان قەبوڵکردنی ئیسلام یان جزیە دان یان شەڕکردن، ئەوکاتە ئەوان نە قەبوڵکردنی ئیسلامیان پێ چاک بووە نە شەڕیان پێ چاک بووە، بۆیە جزیە دانیان بە ژیرانەترین کار زانیوە کە بیکەن، تا لەوەو دوا کە تێکەڵاوی موسڵمانو ڕاسپاردەکانی ئیسلامیان کردوەو بۆیان دەرکەوتووە کە نەک هەر قەبوڵکردنی ئیسلام شتێکی ژیرانەو باشە، بەڵکو تێکۆشانو خۆبەختکردنیش بۆ ئیسلام لەو باشترە.

ئێستاش هەروایەو مێژوو دووبارە ئەبێتەوە، چەند کەس هەیە بەدبینکراوە بەرانبەر بە ئیسلامو موسڵمانان، بەڵام کە لە خۆی ئەبووڕێتو ئازایانە تێکەڵی هەندێ موسڵمانی ڕۆشنبیرو موحافیزکار ئەکات یان بابەتیانە لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی ئیسلامو خوداو دینو پێغەمبەرەکەی (سەلامی خوای لێ بێت) ئەکات، بۆی دەرئەکەوێ نەک نەنگی نییە مرۆڤ پەیڕەوی لە ئیسلام بکات بەڵکو ئەوە نەنگیو بێ عەقڵییە کە مرۆڤ لە ڕاسپاردەکانی ئەم دینە یاخی ببێتو خۆی و خوای لە بیربچێتەوە. ئارنۆڵد توبینی (گەورە مێژوونووسی بەریتانی) ئەڵێ: ".. خەڵک لە نێوان قەبوڵکردنی ئیسلام یان کوشتندا دانەئەنرا، بەڵکو لە نێوان ئیسلامو ئازادبووندا دائەنرا، کە ئەمەش تا بڵێی سیاسەتێکی بەهێزو پڕ ڕووناکی بووە، کە هەمو دنیا ئەو سیاسەتە پەسەند ئەکەنو باسی چاکی ئەکەن، ئیسلام پشت ئەستوور بە خەسڵەتو بنەما گرنگەکانی خۆی لەناو ڕەوەندە غەیرە عەرەبەکانی دونیای خیلافەتدا بەردەوام ئەجوڵاو بڵاوئەبوویەوە، ڕاستە لەسەرخۆ بڵاوئەبوویەوە بەڵام بێگومان بەردەوام لەتەشەنەکردنو بڵاوبوونەوەدا بوو، .. ئەتوانین بە دڵنیایشەوە ئەوە بڵێین کە ئەو هەمووە بەروبوومەی دەستی موسڵمانان کەوت لە کێڵگەی

---

[1] رجال الفکر والدعوة / الندوی ص٤٩.

[2] البدایة والنهایة ٧/ ١٩٢.

[3] السیرة النبویة / الصلابي ٢/٥٣١.

(*) دیوانی مەحوی بە شەرحی مەلا عەبدولکەریمی مدرس.

**بانگەوازی ئیسلامیدا سەرئەنجامی جوڵەیەکی جەماوەری بەردەوام و سروشتی بووەو هیچ کات لە ئەنجامی فشاری سیاسییدا خەڵك بەرەو ئیسلام نەهاتووە.."[1]**

**ئیتر نەخوێندەوارو کینە لە دڵێکی وەك (میرفطرۆس) با هەر بوختان هەڵببەستێتو درۆ ڕیز بکات.**

**. (میرفطرۆس) بە داخو کەسەرێکی زۆرەوە هەرچی کینەی ڕەگەزپەرستانەی خۆی هەیە لە باسی شەهیدکردنی حەزرەتی عومەر دا ئەیرێژێت، ئەوەتا ئەڵێت: "کوژرانی عومەر لە ساڵی (٢٤)ی کۆچیدا، بەدەست کۆیلەیەکی (فەیروز) ناو یان (أبو لؤلؤ) کە یەکێك لە دیلەکانی شەڕی نەهاوەند بوو، دەکرێت لە دوو لایەنەوە بدرێتە بەر سەرنج:**

**١. کارەکەی فەیرۆز وەك کۆیلەیەك دەکرێت کاردانەوەیەکی بێزاری و دەنگهەڵبڕینی ئەو کۆیلانە بێت کە (برایەتی یەکسانی ئیسلامی)یان وەك سەرپۆشێك بۆ حەشاردانی ناکۆکییە چینایەتیو درێژەی کۆیلەیەتی هاتبووە پێش چاو..**

**٢. کارەکەی فەیرۆز – وەك ئێرانییەکی نیشتمانپەروەر – دەتوانرێت وەك نوێنەری تۆڵەی نەتەوەیەکی تێکشاو بێت کە ئایینو نەریتو ڕێو ڕەسمی نەتەوایەتی خۆی بە زۆر و هەڕەشەو تۆقاندن لە دەست دابێتو ئیسلامی بەسەردا سەپێنرابێت)،[2] ڕقاویتر ئەڵی: "بەدرێژایی ئەو ساڵانەی ئێران لەلایەن عەرەبەکانەوە داگیرکرابوو، خەڵك بەردەوام دژی دەسەڵاتە بەکرێگیراوە ئیسلامییەکان . کە نوێنەری ئایینی داسەپێنەر بوون . خەباتیان دەکرد".[3] هەروەها باسی ئەوە ئەکات کە کاتێك دیلی ئێرانیان هێناوەتە مەدینە فەیرۆز سەیری دیلەکانی کردووەو دڵی داونەتەوەو پێی وتوون: "عومەر جەرگمی خوارد"[4].!! بە ڕاستی کاتێك ئەم بڕگانە ئەخوێنمەوە ئەو لێکۆڵینەوەم دێتە پێشچاو کە کاك ئەحمەدی مفتی زادە – بیریاری گەورەی ئێرانی – ئەیفەرموێت، کاك ئەحمەد ئەفەرموێت: "کەس نییە لە دونیا بتوانێت تا سەر بە (تناقض)ەوە بژی، دەری جۆرێك بێتو ناوەوەی جۆرێکی تر بێت، بەڵکو هەر ئەبێ کاتێك بێت ئەو (تناقض)ە ڕەفع ببێتو دەرو ناوی هاوشێوە بن، جا ئەوکاتە هەمیشە بە نەفعی ناوەوە تەواو دەبێت".[5] پاش ئەوە کاك ئەحمەد بەنموونەوە ئەو بنەمایە ڕوون ئەکاتەوە، کە کورتەکەی ئەوەیە: کەسێك چی لە ناخیدا هەبێت لە خراپەو گزیبازی و فرتو فێڵ، چەند هەوڵ بدات بیشارێتەوە و بە قسەی خۆشو زمانی لووس هەوڵی پێچانەوەی بدات بەشتی ترەوە، هەر هەڵوێستێك دێتە پێشەوە کە ئەو ناخەی دەرەوەی و دونیا پێی ئەزانێت.**

**(میرفطرۆس) چەند لەوەو پێش ناخی خۆی ئەشاردەوە، کەچی ئەوەتا بە تەواوەتی ناخی خۆی دەرئەخات کە هیچ نییە ڕەگەزپەرستێکی ئێرانی مەزدەکی مەزهەب نەبێت کە شین و گریان ئەکات بۆ سەرنگومبوونی دەوڵەتی سەرکەوتکەری ساسانی کە ئەوەی خوا پێی ناخۆشە بە فارسو بە میلەتانی ئەم ناوچەیان کردووەو لەسەر خوێنی خەڵك و ڕێزو ناموسی خەڵك مەملەکەتیان پێکەوە ناوەو میرفطرۆس خۆشی لە پێشەوە شتێکی وای باسکردو ئێمەش پاشبەندییەکمان لەسەری ووت.**

---

[1] ئارنۆڵد توینبی: مختصر دراسة التأريخ ٧٣/٣. پەراوێزی: (قالوا عن الإسلام/ عمادالدين خليل ص٢٧٩. ئەم کتێبەی (توینبی) بە یەکێك لە شاکارە گەورەکانی دائەنرێت کە لە ساڵی (١٩٢١)ەوە دەستی بە دانانی کردو لە ساڵی ١٩٦١ لە نووسینی بوویەوە، کتێبەکە (١٢) بەرگەو (سومرفیل) بە سەرپەرشتی (توینبی) خۆی لە دوو بەرگدا کورتی کردووەتەوە ئێستا ئەو دوو بەرگەی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی لە چوار بەرگدا بە ناوی (مختصر دراسة التأريخ)و (د. عمادالدين خليل)یش زانیارییەکانی لەوێوە وەرگرتووە.

[2] ئیسلامناسی ل٨١.

[3] ئیسلامناسی ل٨٢.

[4] ئیسلامناسی ل٨٢.

[5] کاسێتی ڤیدیۆی (٢ سەعاتی) کە ماوەیەك پێش دەرچوونی لە زیندان تۆماری کردووە.

هەرچۆن بێت کابرا فارسەو ئێرانییەو بێدینە، بۆ میللەت و وڵات و مەزهەب و مێژووی خۆی ئەگری، ئارەزووی خۆیەتی، بەڵام سەیر ئەوەیە (شوان . ع) و (سیامەك)و (کوردە عەلمانییەکانی خۆمان) وەك کەرەی شەربەت بەبێ هۆشینی لەگەڵدا بگێرن!! بۆچی؟ خۆشیان نازانن! یان لەوانەیە بزانن و هەریەکەیان بۆ کۆسی کەوتووی خۆی ئەگری و ئەوە ئەکاتە بۆنەیەك بۆ دەنگ بەرزکردنەوەو لاواندنەوەی شینەکەی!

بەهەرحاڵ ئێمە ناکرێ باسی کۆیلەو ڕاسپاردەکانی ئیسلام دەربارەی کۆیلە لێرەدا دووبارە بکەینەوە، بەڵکو تەنیا ئەوەندە ئەڵێین: لەناو میللەتەکانی تردا کۆیلەیەتی ڕەسمو عورفێك بووەو مەبەست پێی مانەوەیان بووە بۆ هەتا هەتایی، بەڵام لە ئیسلامدا کۆیلەیەتی هەنگاوێك بووە بۆ ڕزگارکردن و پاراستنی گیانی ئەو خەڵکەی لەشەڕدا ئەگیرێت و ناکوژرێت، بۆ ئەوەی لە پاشاندا چانسی ژیانی بۆ دروست بکرێتەوە و دەرگای ئازادی لێ بکرێتەوەو خۆی مەیلی لە کامیان بوو لەو دەرگایەوە بچێتە دەر، ئەمەش هەر تەنیا قسە نەبوە لە ئیسلامدا، بەڵکو ئیسلام بە کردەوە ئەمەی سەلماندووەو پشکێکی گەورەی زەکاتیشی تەرخان کردووە بۆ کڕینی کۆیلە بە دانە دانەو کۆمەڵ کۆمەڵ تا ئازاد بکرێن.[1]

بەڵام مەسەلەی "ئەبولوئلوئە" و شەهیدکردنی حەزرەتی عومەر مەسەلەیەکی تایبەتەو مویەکی تێدایەو پەیوەندی نییە بەوەی (عومەر) پیاوێکی دڵڕەق بووبێت، بەڵکو لەوەناچێت لە هەمو مێژووی مرۆڤایەتیدا کەسێکی تر وەك عومەر هەڵکەوتبێت کە هەموو کەس ئاوەها شایەتی دادپەروەری و موسڵمانێتی و لێهاتووی بۆ بدات.[*]

نووسەرانی مێژووی ئیسلامی بە درێژی باسی دین و ڕەوشت و دادو زوهدو سۆزو سیاسەت و بەڕێوەبەرایەتی و.. هتدی حەزرەتی عومەریان کردووە، هەرکەس تەنیا بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت کات لەگەڵ ژیاننامەی عومەردا بەسەربەرێت بڕوا ناکەم کەمەندکێش نەبێت بۆی.. کەسێك کە لە سەردەمی ئەودا (وڵاتی شام) هەمووی، (جەزیرە)و (موسڵ)و (ئامەد)و (میافارقین)و (ئەرمینیا)و (میصر)و (ئەسکەندەریە) هەمووی ئازاد بکرێ، شارەکانی (یەرموك)و (بصری)و (دمشق)و (ئوردون)و (بیسان)و (طبریة)و (فەلەستین)و (ڕەملە)و (عەسقەلان)و (غەززە)و (کەنارەکانی دەریا)و (قدس)و (بەعلەبەك)و (حمص)و (قەنسرین)و (حلب)و (ئەنطاکیە)و (جەزیرە)و (حەڕان)و (روها)و (ریقە)و (نەصیبین)و .. (دیاربەکر)و (دیارڕبیعە)و (وڵاتی موسڵ)و (ئەرمیینا)و (قادسیە)و (حیرە)و (دەریای سەیر)و (ساباط)و (بەصرە)و (ئەهواز)و (فارس)و (نەهاوەند)و (هەمەدان)و (ڕەی)و (خۆراسان)و (ئەستەخر)و (ئەسبەهان)و (سوس)و (مەروە)و (نیسابور)و (جورجان)و (ئازەربایجان).. هتد ڕزگار بکرێت و خەراج و غەنیمەتی هەموو ئەو وڵاتانەی بێتە بەردەست کەچی کە (ئەچێتە سەر مینبەرو وتار ئەدات، خەڵکی دوانزە پینە بە کەواکەیەوە ئەبینن).[2] خۆی جلی خۆی ئەدورییەوە، گۆزەی ئەنا بەشانییەوەو بەناو خەڵکدا ڕێی ئەکرد، بە پشتی ڕووت و بێ ئەوەی جلی لێ بکات سواری کەر ئەبوو، کە لێیان پرسی: قوربان ئەو گۆزەیەت بۆ گرتووە بە شانەوەو بەناو خەڵکدا ڕێت ئەکرد؟ فەرموی: "إن نفسي أعجبتني فأردت أن أذلها"[3]!! نەفسم خەریك بوو لە خۆی بایی ئەبوو، منیش ویستم بیشکێنم!!.

. هەر کاربەدەستێکی دادەنا چەند شایەتی لە (ئەنصارو مهاجرین) لێ ئەگرت و مەرجی لەسەر دائەنا کە:

---

[1] لەم کتێبەدا بە کورتی و لە کتێبی (دەوڵەتی خیلافەت بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت)دا بە درێژی باسی ئەو هەنگاوانەمان کردوە کە ئیسلام دایناوە بۆ قەلاچۆکردنی (کۆیلایەتی).

[*] فەرەج فۆدە) زۆر سەرسامانە باسی عومەر ئەکات لە (الحقيقة الغائبة)داو (حسن العلوی)یش لە (عمر والتشیع)دا بەهەمان شێوە سەرسامی خۆی بە عومەر دەرئەبڕێ لە کاتێکدا کە (حسن العلوی) شیعەیەکی عێراقی ناوداریشە.

[2] البداية والنهاية ١٣٢/٧.

[3] البداية والنهاية ١٣٢/٧.

سواری جوانە ماین نەبێ، خواردنی سەیرو سەمەرە نەخوات، جلی تەنك لەبەرنەكاتو دەرگای دانەخات لە رووی هەركەسێكدا پێویستییەكی هەبێت، ئەگەر وای نەكردایە ئەوە سزای توندی ئەدا".[1]

. چووە مەیدانی حەیوانفرۆشتن لە مەدینە، سەیری كرد خەڵكی لە دەوری حوشترێكی قەڵەو گردبوونەتەوە، ئەویش نزیك بوویەوەو فەرمووی: ئەم هوشترە هی كێیە؟ وتیان: هی عبدالله ی كوڕتە. فەرمووی: بۆمی بانگ بكەن، كە عبدالله یان بۆ بانگكرد فەرمووی: عبدالله ئەوە چەندت داوە بەم هوشترە؟ عبدالله وتی: ئەوەندەم پێ داوە، ماوەیەكە دامبەستووەو ئێستا بۆ قازانج ئەیفرۆشم، عومەر فەرمووی: چەندت پێ داوە، بنمایەكە هەڵگرەوەو ئەوی تری بخەرە (بیت المال)، چونكە دیارە ئەوە هەر لەبەرئەوەی كوڕی (أمیر المؤمنین)ی هوشترەكەیان باش بۆ لەوەڕاندووی!! حەزرەتی عومەر ئەو لەقەبو شۆرەتەی بە "ئیستغلالكردنی سوڵتە" داناو نەیهێڵاوە خراپ سوودی لێ وەربگیرێ.

. لە نیوەڕۆیەكی گەرما كە پێستی چرچ ئەكرد، عومەر بە دارێكەوە بۆ دەرەوەی مەدینە ئەڕۆیشت، (علی) لە پەنجەرەی ماڵەوە سەرێكی دەرهێناو وتی: قوربان ئەوە خێرە؟ عومەر فەرمووی: هوشترێكی (بیت المال) ون بووەو ئەچم بزانم نایدۆزمەوە، علی وتی: قوربان تۆ بفەرموو وەرە ژوورەوە با یەكێكی تر بنێرین بگەڕێت بە شوێنیدا، عومەر فەرمووی: لە قیامەتدا لێ پرسینەوە لەگەڵ مندا ئەكرێت نەك لەگەڵ ئەو كەسەدا.[2]

. عومەر ئەفەرموێ: "إن الله لایمحوا السيء بالسيء ولكن یمحوا السيء بالحسن، وإن الله لیس بینه وبین أحد نسب إلا بطاعته، فالناس شریفهم ووضیعهم في ذات الله سواء، هو ربهم وهم عباده، یتفاضلون بالعافیة ویدركون ماعندالله بالطاعة".[3] واتە: خوا شتی خراپی خەڵك بە شتی خراپی خەڵكی ناسڕێتەوە، بەڵكو خراپە بە شتی چاك ئەسڕێتەوە، خوای گەورە خزمایەتی لەگەڵ كەسدا نییە عیبادەتكردنو گوێڕایەڵی نەبێت، خەڵكی ئەشراف و خەڵكی هەژار لەلای خوا یەكسانن بەیەك، ئەو خوای ئەوانەو ئەمانیش هەمو بەندەی ئەون، لەدونیادا پارەو سەروەت پلەوپایەیان پێ ئەداتو لە ئاخیرەتیشدا گوێڕایەڵی و عیبادەتكردن بە هەشتیان بۆ مسۆگەر ئەكات.

. هەروەها ئەفەرموێ: إن للعدل أمارات وتباشیر، فأما الأمارات فالحیاة والسخاء والهین واللین، وأما التباشیر فالرحمة، وقد جعل الله لكل أمر بابا، ویسر لكل باب مفتاحا، فباب العدل الاعتبار ومفتاحه الزهد".[4] واتە: بە دڵنیاییەوە دادپەروەری نیشانەشی هەیەو سەرەتاشی هەیە نیشانەكانی بریتییە لە زیندەگی خۆشو دەستكراوەییو بێ نەفسی و نەرمو نیانیو سەرەتاكەشی دروست بوونی سۆزو ڕەحمە لەناو خەڵكیدا، خوای گەورە بۆ هەموو كارێ دەرگایەكی داناوەو بۆ هەموو دەرگایەكیش كلیلێكی داناوە، دەرگای دادپەروەری بریتییە لە دەرس وەرگرتن لە خەڵكی و كلیلەكەشی بریتییە لە دونیا نەویستی.

ئەگەر ئەم قسەیەی عومەر هەڵبگێریتەوە ئەوە بە جوانی نادادی و ستەمكاریت بۆ روون ئەبێتەوە، تێربوونو دنیا خۆری كلیلی دەرگای ستەمكارییە، سەرەتای ستەمكاریش بێ ڕەحمی و جەفاو بێ وەفایی ناو خەڵكە، نیشانەكانی بێ دادیش بریتییە لە قاتو قڕی و قەیرانی شتە پێویستەكانی ژیان و ڕەزیلی و لوتبەرزی و توندوتیژی كە ئەمڕۆ سیمای ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی خەڵكی ئەم سەردەمەیە.

میرفطرۆس چی دەڵێ دەربارەی عومەر با بیڵێ ئەو دەریایە بە دەمی ئەو پیس نابێت، ئەو زانیارییانەش ئەو هێناونیو بەو صیغەو ڕستانە لە بناغەدا هی (كارل بروكلمان)ە لە كتێبی (تأریخ الشعوب الاسلامیة)دا كە لە لاپەڕە (١٠٩)دا باسی ئەكاتو ئەمەی میرفطرۆس وەرگێڕدراوی ئەوە .[5]

---

[1] البدایة والنهایة ١٣٢/٧.

[2] البدایة والنهایة ١٣٤/٧. و هەروەها فریشتەكانی سەرزەوی ل٤٥.

[3] البدایة والنهایة ٣٥/٧.

[4] البدایة والنهایة ٣٥/٧.

[5] هەڵسەنگاندنمان بۆ (كارل بروكلمان) و ئەو كتێبەی كردووە لە كتێبی ژمارە (١٣)ی (پرۆژەی تیشك) دا.

حەزرەتی عومەر ڕەزای خوای لێ بێ سیاسەتێکی هەبووە دەربارەی "علوجەکان"[1] ئەویش ئەوە بوو کە نەیدەهێڵا بێنە مەدینە، بەڵام چەند جارێك (عباس) تکای کرد کە هەندێ کەسی دەستڕەنگییان هەیە با بهێنرێنە مەدینە هەر ڕێگەی نەدا، لە کۆتاییدا جارێکیان موغیرەی کوڕی شوعبە هاتە لای و زۆر تکای کرد کە (فەیروز) کابرایەکی شارەزایەو ئەزانێ ئاش دروست بکات کە بە هەواش کار بکات، ئەوەبوو ڕێگەی پێ دا بیهێننە مەدینە، حەزرەتی عومەر لەبەر چەند هۆیەك ئەم سیاسەتەی پیادە ئەکرد، لەلایەك ئەو علوجانە زۆربەیان داخ لە دڵن‌و بەرژەوەندیان لە دەست چووە بە لەناوچوونی دەوڵەتی ساسانی، بۆیە دوورنییە بۆ تۆڵەکردنەوە هەمیشە لە کەمیندا بن، لەلایەکیش هەریەك لەوانە هەڵگری هەندێ بیروڕای ئایینی خۆیەتی‌و دوورنییە بە مەبەستی بانگەشەکردن بۆی، کەش هەوای پاك و بێگەردی مەدینە ئالودە بکات لەگەڵ ئەمانەشدا دووردنییە هەر لەو سەرەتایە وە جارێ نەئیسلام‌و نەموسوڵمانانیان نەناسیوە بۆ زیندووکردنەوەی ڕەگەزو مەزهەبی خۆیان دەست بدەنە باندو تۆڕ دروست کردن و کۆمەڵگەی ئیسلامی سەرقاڵی دەمە دەمەو شەڕی لابەلا بکەن. ئەوە بوو لە کۆتاییدا بۆچوونەکەی حەزرەتی عومەریش ڕاست دەرچوو، "ئەبولۆلۆئە" هەرئەوەندەی جێی پێی خۆی کردەوە خێرا لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کلکیان پێکەوە گرێ داو بەرنامەی تیرۆرکردنی دادپەروەرێکی وەك عومەریان دانا، نووسەرانی ژیاننامەی عومەر بە درێژیی باسی پیلانێکی سێ قۆڵی کە لەلایەن (هورمزان)و (فەیرۆز)و یەکێکی ترەوە دانراوە ئەکەن، کە ڕۆژێك پێش شەهیدکردنی عومەر لە شوێنێکدا پێکە ئەیانبینن خەریکی چل‌و چڤ کردنن، عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکری صدیق نزیکیان ئەبیێتەوە، بەپەلە بڵاوەی لێ ئەکەن‌و هورموزان خەنجەرێکی دوو دەمی لێ ئەکەوێتە خوارەوەوە بەپەلە هەڵی ئەگرێتەوە، بۆ بەیانی کە عومەر شەهید ئەکرێت سەیر ئەکەن بە ئەو خەنجەرە دوو دەمە شەهید کراوەو (عبدالرحمن) ئەیناسێتەوەو ئەم شایەتیە لەبەردەم (علی)و صەحابەکاندا ئەدات‌و (ئەبولۆلۆئە)ش کە تا لە مزگەوت دێتە دەرەوە بە ڕاست‌و چەپدا خەنجەر ئەوەشێنێ و دوانزە کەس بریندار ئەکات‌و شەشیان شەهید ئەبن تا عەبدوڵڵای کوڕی عەوف عەبایەکی گەورەی بۆ هەڵداو بو بە ژێرییەوە. فەیرۆزیش بۆ ئەوەی هەرچی نهێنی خۆی‌و باندەکەی هەیە لەگەڵ خۆیدا بیباتە ژێر گڵ یەکسەر ورگی خۆی دڕی‌و خۆی کوشت..[2] جا عومەر کە ئەپرسێ کێ بو ئەو ناپاکییەی کرد، پێی ئەڵێن: غوڵامەکەی موغیرە بوو! سوپاسی خوا ئەکات کە بە دەستی کەسێك شەهید کراوە کە سوجدەی بۆ خوا نەبردووە، بەڵام بە گلەییەکەوە ڕوو ئەکاتە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و ئەفەرموێ: باوکت زۆر تکای کرد ئەم علوجانە تێکەڵ بە مەدینە بێن، ئەوەبو ئەو کەتنەیان نایەوە، عومەر کە زانی برینەکەی کاریگەرە، عەبدوڵڵای کوڕی نارد بۆ لای حەزرەتی عائیشە تا ئەگەر ئەو ڕێگە بدات لە خزمەتی پێغەمبەرو ئەبوبەکردا ئەویش بنێژن، عائیشە فەرمووی: ئەو شوێنەم بۆ خۆم دانابوو، سوێند بە خوا بۆ عومەر بەشیاوتری ئەزانم، کە عەبدوڵڵا هاتەوەو ئەم هەواڵەی پێدا، حەزرەتی عومەر زۆر سوپاسی خوای کرد، بەڵام هەر فەرمووی: ڕۆڵە! ئەگەر نزیکی حوجرەکەی پێغەمبەرتان کردمەوە جارێکی تر پرس بە عائیشە بکەنەوە ئەگەر ڕازی نەبوو بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان،[3] بەڵام دایکمان عائیشە بۆ جاری دووهەمیش ڕەزامەندی داو لە خزمەتی پێغەمبەرو ئەبوبەکردا نێژرا، ڕیوایەت کراوە کە کاتێکیش عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) دێتە خوارەوەو دەجال ئەکوژێ‌و دونیا پڕ ئەکات لە دادو خێرو خۆشی پاشان وەك هەموو خەڵکی ئەمرێت، ئەبرێت لە خزمەت پێغەمبەردا ئەنێژرێت‌و ئەو کاتە ئەبوبەکرو عومەر ئەکەونە نێوان موحەممەدو

---

[1] "علوج، علج"بەو کۆیلانە ئەوترا کە لە شەڕەکانی فارسدا بە ئەسیری گیرابوون، هەروەها بە هەموو کەسێکی وشکی توندوتیژ سروشت ئەوترێ (علج)، معاوية بن أبي سفيان/ الصلابي ص٩٣.

[2] سەیری (العواصم من القواصم) ص١٠٧ بکە، بۆ نموونە.

[3] البداية والنهاية ٤٧٨/٢.

عیساو پێغەمبەرەوە (صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەربێ).[1] مەولەویش (بە رەحمەت بێت) کە باسی هاتنە خوارەوەی عیسا و مردنی ئەکات، جوان ئەفەرموێ:

لە ئەمری عیسا هیچ پەشێو نەبی　　　　بەر لە محمد بوگە بە (نبي)

کە هاتە خواریچ هیچ شوبهەی نییە　　　　هەر تابع شەرعی محمدییە

دینی خۆی مەنسوخ تازەی بۆ نایە　　　　خەلیفەی جەناب (رسول الله)یە

کاتێك کە ئەمرێت بە ئەمری بێ چوون　　دەکرێت لە خزمەت حەزرەتدا مەدفون

ئەبوبەکرو عومەر ئەکەونە ناوبەین　　　　(طوبی للشیخین بین النبیین)[2]

. (میرفطرۆس) زۆر لەسەر شەڕەکانی ناو ئێران ئەڕوات داغو فوغان ئەخوا بۆ ڕمانی یەك لە دوای یەکی شارودێی ئەو ئیمپراتۆریەتە و درۆو بوختانی دنیا ئەکات بەدەم سوپای ئیسلامەوە. وا گۆمی خوێنیان لە فلانە شوێنەداو وا لافاوی خوێنیان لە فلانە شوێنی تردا دروست کرد تەنانەت سڵ لە شتی منالانە و ناعاقلانە ناکاتەوەو ئەڵێ: (یزید بن المهلب) لە گورگاندا پێستی کوژراوەکانی هەمو گوریو لەم سەرو ئەوسەری ڕێگاکەدا هەڵی واسی.[3] جا نازانم ئایا پێستی مرۆڤ کە هەمویو چەوریو بێ سنور تەنکە چۆن وەك چارەکەو پەڕۆ هەڵدەواسرێ، ئەبێ لاشەی ئەو گورگانیانە وەك خەڵکی تر نەبووبێو پێستیان قایم ببوێ و وەك چەرمی ئاژەڵ پەڕۆو چارەکەی تێدا بووبێت تا بە ئەم سەرو ئەوسەری ڕێگاکەدا هەڵبواسرێ!!

یان ئەوە عەقڵ لە دەست دانی (میرفطرۆس)ەو نازانێ درۆی کێ بگوازێتەوە، تا سوپای فتوحاتی پێ ناشیرین بکات چونکە ئەو سوپایە تەختو بەختی دەوڵەتی ساسانی هێنایە لەرزەو دای بە ئاوی میللەتانی هەژارو ستەملێکراوداو دوای ئەوە هەرچەند پەلەقاژەیان کرد نەیانتوانی ئەو سەروەرییە پڕ گزیو غەدرە دروست بکەنەوەو قسەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دی کە فەرموی: "اذا هلك کیسری فلا کیسری بعده". رواە مسلم[4] ئەگەر ئەم کیسرایە فەوتا ئیتر دوای ئەو کیسرای تر دروست نابێتەوە.

. (میرفطرۆس) لە ئەو چەند پەڕەی کۆتاییدا باسی (شەڕی جمل)و (صفین)و (قەیرەوان)و شەهیدکردنی حەزرەتی (علی) دەکات، بەڵام دیارە بە بوختان و پێوە نانەوە، بۆ نموونە لە لاپەڕە (٨٧)دا ئەڵێ: "پاش کوژرانی (عوسمان) حەزرەتی (عەلی) پێی وابوو[5]، کە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ بەدەستهێنانی پلەی خەلافەت لەبارو ئامادەیە"!!.

هەروەها ئەڵی: ئەوەندەی نەبرد (طلحة)و (زوبەیر) کە لە هاوڕێیانی نزیکی پێغەمبەر بوونو هەروەها (عائیشە) ژنی پێغەمبەر کەوتنە دژایەتی کردنی عەلیو .. لێی ڕاست بوونەوە).. هەروەها ئەڵێ: "(طلحة)و (زوبەیر) بە پاڵپشتی (عائیشە) بۆ داگیرکردنی شاری (بەسرە)و (کوفە) هێرشیان کردە سەر ئەو ناوچانەو لەدەوروبەری شاری (بەسرە)دا شەڕێکی توند لە نێوان لەشکری (علی)و هێزە نەیارەکانیدا ڕوویداو (طلحة)و (زوبەیر) کوژران و (عائیشە)ش بە دیل گیراو پاش ماوەیەك ئازاد کرا"..

پاشان لە لاپەڕە ٨٨دا ئەڵێ: ئەوانە ی لە شەڕی (جمل)دا شکان ڕووەو شامو سوریا ڕۆیشتنو چوونە پاڵ عوسمانییەکانو بە پاڵپشتی لەشکرەکانی معاویە خۆیان بۆ شەڕی دژی (علی) سازدا، وە لە ناوچەی (صفین)

---

[1] مختصر منهاج القاصدین/ الغزالي ص٣٩٢. و (شنقیطي)یش لە (زاد المسلم)دا باسی ئەکات بە درێژی.

[2] شەرحی عەقیدەی مەرضیە/ مەلا عبدالکریمی مدرس / ل٤٢٥.

[3] ئیسلامناسی ل٨٦.

[4] البدایة والنهایة ٦٣٨/٤.

[5] سەیری کابرا لەگەڵ ئەوەدا هیچ ڕێزێك بۆ خواو پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) دانانێ، کەچی ووشەی حەزرەت بۆ علی بەکاردێنێ، بەڵام بۆ عوسمان بەکاری ناهێنێ، چونکە کابرا ئێرانییەو لە هەستی شارەوایدا شتێکی وا هەیە..

شەڕێکی خوێناوی لە نێوان لەشکری (عەلی)و (موعاویە)دا دەستی پێ کرد، ئاکام ئەم شەڕە بەلای (عەلی)دا شکایەوە، بەڵام ... بەفرو فێڵی (عمرو بن عاص) فەرمانی بە سەربازەکانی دا کە پارچە قورئان بکەن بە سەر سەری نێزەکانیانەوە و گوتیان (ئێمە هەردووکمان موسڵمانین و دەبێت ملکەچی بڕیاری قورئان بین.. سەربازەکانی (علی) وازیان لەشەڕ هێناو (عەلی) کە تووشی شكو گومان بوو بوو ناچاریان کرد مل بۆ وتوێژو داوەری (حکمیت دانەوێنێت).[1]

ئێمە لە وەڵامی ئەم قسانەی سەرەوەدا ناچارین ڕاستی ئەو دوو ڕووداوە (شەڕی جمل)و (شەڕی صفین) وەك خۆیو وەك ئەوەی مێژوونووسان بە ڕیوایەتی (صحیح) هێناویانە بنووسین، چونکە ئەوە خۆی تیشك ئەخاتە سەر بوختانو ساختەچێتییەکانی (میرفطرۆس) کە ئەڵێ: "عەلی بۆ بەدەستهێنانی پلەی خەلافەت هەوڵی داوە". (طلحة(و (زوبەیر)و (عائیشە) لە (علي) ڕاست بوونەوەو کەوتنە دژایەتی کردنی)، (چون بۆ لای عوسمانیەکان)!!..

## ڕاستی ڕووداوی ( جمل )و ( صفین )

(محب الدين الخطيب) لە کتێبی (حملة رسالة الاسلام الاولون وماكانوا عليه من المحبة والتعاون على الحق والخير وكيف شوه المغرضون جمال سيرتهم)[*]دا بە درێژی باسی ئەو ڕووداوانە و بە ڕیوایاتی (صحیح) ئەیسەلمێنێت کە دوژمنانی ئیسلام دەستێکی زۆریان خستۆتە ناو مێژووی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی جوانی ئەو مێژووە لە خەڵك بشارنەوەو بە دبینیان بکەن بەرانبەر بە ئیسلامو صەحابەی پێغەمبەرو ئەهلی ئیسلام، (محب الدین) ئەڵێ: "سوکترین و ناماقوڵترین درۆیان ئەو قسەیەیە کە گوایە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) یەك بۆ ئەوی تریان دوژمنایەتیو ڕقی هەڵگرتووە، لە کاتێکدا خوا دەربارەیان ئەفەرموێ: "أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ.."[2]. هەروەها ئەڵێ: "سەرەتای ئەم ئوممەتی ئیسلامی بە دوو کۆمەڵ خەڵك دەستی پێ کرد، کۆمەڵێکیان کەپێك هاتبوون لە ئەصحابەو تابعینو قوتابییەکانیان خۆیان یەکلاکردەوە بۆ هەڵگرتنی ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ)، کە وڵات بە وڵاتو شار بە شار ئەگەڕان بە دوای ئەو کەسانەدا کە فەرمودەیەکی پێغەمبەریان لاهەبوو ئەچوون لە دەمی خۆی ڕاستەوخۆ وەریان ئەگرت، کابرایەکی دونیایی چەند دڵی بە کۆکردنەوەی ئاڵتون خۆشە ئەوان زیاتر دڵیان بە کۆکردنەوەی ئەو حەدیسانە خۆش بوو". پاشان ئەڵێ: "هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا کە خۆیان یەکلاکردبوویەوە بۆ پاراستنی گشت بنەماکانی شەریعەت، کۆمەڵێکی تر لە نەوەکانی صەحابەو تابعینە پاڵەوانەکان ڕاسپاردەکانی ئیمامەت و جیهاد و فەتحی ئیسلامیان خستە ئەستۆی خۆیانو میللەت میللەت ئەیانهێنانە ناو ئەم ئیسلامەو گۆشیان ئەکردن بە ڕێنماییەکانی ئیسلامو فێری برایەتی ئینسانییان ئەکردن و هانیان ئەدان کە هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی هەموو مرۆڤەکان بدەن لە ژێر یەك ئاڵادا..

هەروەها ئەڵێ: "خوا بەرەکەتی خستە کاتو هەوڵی ئەو بەرە نەجیبزادەو ناوازانە، ئەوەی ئەوان لە چەند ساڵێکدا کردیان خەڵکی تر لە هەزاران ساڵدا ناتوانن بیکەن..". پاشان باسی ئەوە ئەکات کە ئیسلام چەند قۆناغێکی (غەریبی) بەسەردا هاتووەو یەکێك لەو غەریبایەتییەی ئەوەیە کە دوای ئەو سێ سەردەمە (سەردەمی پێغەمبەرو صەحابەو تابعین) کەسانێك سەریان دەرهێناو دەستیان دایە نووسین بۆ ناشیرینکردنی مێژووی ئەو بەرە ناوازەیە، لە پێناوی ڕەزامەندی شەیتانو ڕەزامەندی کاربەدەستاندا و وایان لە خەڵکی ئەگەیاند کە ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ) نەك هەموو برای یەکتری نەبوونو بەرانبەر یەك ڕەحمو بەزەییان نەبووە، بەڵکو دوژمنی یەکتری

---

[*] ئەو کتێبە لە بناغەدا پرۆژەیەکی ئەکادیمی مامۆستا (محب الدين الخطيب) بۆ زانکۆکانی میسر بە مەبەستی سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی ئیسلامی.

[1] ئیسلامناسی ل٨٨.

[2] مختصر التحفة الاثنا عشرية/ شاه عبدالعزيز الدهلوي ص٣٠٦.

بوون‌و ئه‌میان نه‌فرینی له‌ویان کردووه‌ و ئه‌م فێڵی له‌ویان کردوه‌و ئه‌ویان دووڕوویی له‌گه‌ڵ ئه‌میاندا کردووه‌ و شتیان له‌ یه‌کتری زه‌وت کردووه‌..

پاشان ئه‌ڵی: نه‌(علی)و نه‌ (عائیشه‌)و ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵیدا بوون به‌ تایبه‌ت (طلحة)و (زوبێر) به‌ نیازی شه‌ڕ کردن نه‌چوون بۆ عێراق، به‌ڵكو (عائیشه‌)و (طلحة)و (زوبێر) بۆ ئه‌وه‌ ڕۆیشتن بۆ لای (علی) تا كێشه‌ی (بكوژانی عوسمان) چاره‌سه‌ر بكه‌ن.[1] چونكه‌ خه‌ڵكی نه‌یانئه‌توانی له‌و (چینایه‌تییه‌)[2] گه‌وره‌یه‌ بێده‌نگ بن‌و بێن به‌یعه‌ت به‌ (علی) بده‌ن‌و بكوژانی عوسمانیش له‌ناو سوپاكه‌ی ئه‌ودا بێن‌و بچن، به‌ڵام بكوژانی عوسمان نه‌یانهێڵا (عائیشه‌)و (طلحة)و (زوبێر) ده‌میان بگاته‌ (علی)و هه‌ر له‌ ڕێگه‌دا شه‌ڕیان هه‌ڵگیرساندو به‌ناچاری ئه‌وانیش ده‌ستیان كرده‌وه‌ لێیان و زۆرێك له‌و ئاژاوه‌چی‌و بكوژانه‌ی عوسمان له‌و شه‌ڕه‌دا كوژران‌و به‌ داخه‌وه‌ (طلحة)و (زوبێر)یش شه‌هیدبوون‌و (علی) تا فریاكه‌وت كاره‌ساته‌كه‌ ڕووی دابوو، بۆیه‌ (علی) نوێژی له‌سه‌ر كوژراوی هه‌ردوولا كردو و زۆر دڵگران بو به‌ڕووداوه‌كه‌و ئه‌وه‌تا ئه‌فه‌رموێ: "خۆزگه‌ هه‌ر زوو بمردامایه‌م‌و شتی وام نه‌دیایه‌". ئه‌م بكوژانه‌ی عوسمان ئه‌وه‌نده‌ بێ شه‌رم‌و بێ ئابڕوو بوون وتیان به‌ (علی): ئه‌بێ ماڵ‌و مناڵه‌كانیان بكه‌ینه‌ غه‌نیمه‌ت، (علی) فه‌رمووی: ڕووتان ڕه‌ش بێ،[3] كێ دایكی خۆی ئه‌كاته‌ كۆیله‌و كه‌نیزه‌ك!!

بكوژانی عوسمان كه‌ ئه‌م شه‌ڕه‌یان بۆ چووه‌ سه‌ر، كه‌وتنه‌ ئاگرخۆشكردن بۆ شه‌ڕی (معاویه‌)و شام به‌رده‌وام له‌ هاندانی سوپای عێراق‌و حه‌زره‌تی (علی) دا بوون بۆ ئه‌و شه‌ڕه‌، به‌ڵام (علی) "جه‌ریری كوڕی عبدالله‌"ی . كه‌ صه‌حابییه‌كی به‌ڕێزی ناو ئه‌صحابه‌كان بوو . نارد بۆ لای (معاویه‌) تا پێی ڕابگه‌یه‌نێ، كه‌ ئه‌و چی ئه‌وێ له‌ (علی)، نووسه‌رانی مێژووی ئیسلامی ئه‌ڵێن: یه‌كێك له‌ گه‌وره‌ بكوژانی (عوسمان) كه‌ (مالكی ئه‌شتره‌) وتی: قوربان ئه‌م مه‌نێره‌، ئه‌مه‌ دڵی له‌گه‌ڵ (ئه‌و)دایه‌، (علی) هه‌ر ناردی، (جه‌ریر) هێشتا نه‌گه‌ڕابوویه‌وه‌، بكوژانی (عوسمان) ترسی ئه‌وه‌یان لێ نیشت كه‌ (علی)و (معاویه‌) ڕێبكه‌ون‌و دیاره‌ ڕێكه‌وتنه‌كه‌شیان له‌سه‌ر حسابی ئه‌وان ئه‌بێت‌و به‌ دڵنیاییه‌وه‌ ئه‌وان هه‌موو ئه‌درێنه‌ دادگاو (قیصاص)یان لێ ئه‌سه‌نرێ بۆیه‌ خۆیان كۆكرده‌وه‌و بڕیاری شه‌ڕ هه‌ڵگیرساندنیان دا، وه‌ك له‌ (نهج البلاغه‌)دا باسی ئه‌كات، به‌ڵام (علی) فریاكه‌وت‌و نه‌یهێشت و فه‌رموی: ته‌نانه‌ت خۆئاماده‌كردن و سوپا پێكه‌وه‌ نان بۆ شه‌ڕی (شام)و (جه‌ریر) هێشتا هه‌ر له‌وێیه‌ بریتییه‌ له‌ده‌رگا داخستن به‌ڕووی ئه‌و وڵاته‌دا.[4]

ئه‌وه‌بوو (جریر) گه‌ڕایه‌وه‌و (علی) پرسی چی ئه‌ڵێن: وتی: قوربان جگه‌ له‌ (قیصاص) داوایه‌كی تریان نییه‌.[5]

(علي محمد الصلابي) له‌ هه‌ر سێ كتێبی (ژیاننامه‌ی) – عوسمان – علی – حسن – دا به‌درێژی باسی هه‌ریه‌ك له‌و شه‌ڕانه‌ ئه‌كات كه‌ به‌ كورتی به‌م شێوه‌یه‌یه‌.

١. أم حبیبه‌ (دایكی موسڵمانان) كراسه‌ خوێناوییه‌كه‌ی (عوسمان)و ده‌ستوپه‌نجه‌ بڕاوه‌كانی (نائله‌)ی ژنی عوسمان به‌ (نعمانی كوڕی به‌شیر)دا ئه‌نێرێت بۆ شام‌و (معاویه‌)ش له‌ مینبه‌ری مزگه‌وتی (دمشق)دا هه‌ڵی ئه‌واسێ و ئه‌و خه‌ڵكه‌ش ڕۆژانه‌ له‌ ژێریدا ئه‌گریان‌و داوای تۆڵه‌و (قیصاص)یان ئه‌كرد.

---

[1] هه‌مان سه‌رچاوه‌، ل٣٢٠. نوێنه‌رێكی حه‌زره‌تی (علی) هاته‌ی لای حه‌زره‌تی (عائیشه‌)و وتی: ئه‌رێ دایه‌ گیان بۆچی هاتوویت بۆ ئێره‌؟ فه‌رمووی: ڕۆڵه‌ گیان تا ئه‌م خه‌ڵكانه‌ ئاشت بكه‌مه‌وه‌و وتی: ده‌ی بنێره‌ به‌ شوێن (طلحة)و (زوبیر)یشدا كه‌ ناردی به‌ شوێنیاندا هه‌مان پرسیاری له‌وانیش كرد هه‌ر قسه‌كه‌ی دایكمان عائیشه‌یان كرده‌وه‌ (البدایة والنهایة) ٧/ ٢٣٥.

[2] مه‌به‌ستی شه‌هیدكردنی حه‌زره‌تی عوسمانه‌.

[3] ئه‌و ده‌سته‌واژه‌یه‌م بۆ ووشه‌ی (ویلكم) به‌كاربردووه‌.

[4] نهج البلاغة ص١١٧ .

[5] البدایةو والنهایة ٢٢٧/٧.

٢. (معاویه) هۆی چی بوو کە بەیعەتی بە (علی) نەئەدا؟ معاویە ئامۆزای حەزرەتی عوسمان بوو خۆی بەوە ئەزانی کە داوای (قیصاص) بکات، بەڵام حەزرەتی (علی) ڕای وابوو جارێ بەیعەت لە هەمووی وەربگرێو پاشان دادگایی بکوژانی عوسمان بکات، بەڵام (موعاویە)و ئەوەی هاوڕای ئەو بوو ڕایان پێچەوانەوە بوو.

(موعاویە) وەك (إبن كثير) لە (البداية والنهاية)دا ئەڵی: ڕای (موعاویە)و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ئەوەبوو کە بکوژانی (عوسمان) بکوژرێنەوە پاش ئەوە هەموو بەیعەت بدەن بە (علی)".[1]

٣. لەوەڵامی چەند نامەیەکی (علی)دا بۆ سوپای شام، (معاویە) کابرایەك بە تۆمارێکەوە ئەنێرێت بۆ لای (علی)، (علی) لێی ئەپرسێ: هەواڵی خەڵکی شام چییە؟ کابرا ئەڵێ: قوربان میللەتێکن بە تۆڵەو (قیصاص) نەبێ بەهیچی تر ڕازی نین، کە هاتم شەست هەزار ڕیش سپیم لە ژێر کراسە خوێناوییەکەی عوسماندا بینی کە بە مینبەری (دمشق)ەوە هەڵواسرابوو، هەموو ئەگریانو داوای خوێنی عوسمانیان ئەکرد، (علی) فەرمووی: خوایە من بەریم لە خوێنی (عوسمان)، کابرا کە لای علی هاتە دەرەوە، فیتنەچیو بکوژەکانی (عوسمان) پەلاماریان دا بیکوژن، بەفەلاکەت خۆی ڕزگار کرد.[2]

٤. هەردوو سوپای عێراقو شام لە ناوچەیەکدا کە پێی ئەوترێ (صفين) بە یەکتر گەیشتن کە سوپای عێراق گەیشتە صفين سوپای شام لەسەر ئاوی ناوچەکە بوون، نوێنەرێکی سوپای (علی) کە ناوی (أشعث) بوو هاتە لای (معاویە)و وتی: هاوار خوا هاوار! معاویە! باشە ئەگەر هەموو خەڵکی عێراقیشتان کوشت باشە کێ شەڕی دوژمنان و سەرپەرشتی منداڵی موسڵمانان بکات مەگەر خوا نافەرموێ: "وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا.."، (معاویە) وتی: باشە داواتان چییە؟ "أشعث" وتی: بڵێ با سەر ئەو ئاوە چۆڵ کەن بۆمان! (معاویە) بە (أبى الأعور)ی وت: سەر ئەم ئاوە بۆ ئەم برایانەمان چۆڵ بکەن! .. مانگی موحەڕڕەم هاتە پێشەوەو دەستکرایەوە بە نوێنەر ناردن بۆ لای یەکتری بۆ ئەوەی لە داوای هەر دوولا پرۆسەیەکی هاوبەش دروست ببێت و کاری لەسەر بکرێت، تەنانەت دوان لەوانەی لە هەوڵی ئەم ئاشتییەدا بوون کە سەیریان کرد ئەم هاتوچۆیە بێ ئەنجامەو دەستێك هەیە نایەڵێ بگاتە ئەنجام هەردوولاش لەسەر ڕای خۆیان پێ دائەگرن، (علی) ئەفەرموێ ئەبێ یەکەمجار بەیعەت بدەن پاشان باس لە بکوژانی عوسمان بکرێو (معاویە)ش ئەفەرموێ: سەرەتا یان بکوژانی عوسمان بکوژرێن یان تەسلیم بەمان بکرێن، بۆیە ئەو دووانە (أبو إمامه)و (أبو درداء)، سوپاکەیان بەجێهێشتو چوونەوە ماڵی خۆیان.[3] فیتنەچیو سەبەئییەکان ئارامیان لێ هەڵگیرابوو بە مەفرەزەی بچوك بچوك هەر جارەی لە قوڵێکەوە شەڕیان هەڵدەگیرساند، بەڵام زۆری نەئەخایاندو پاشەکشەیان پێ ئەکرا، ئەم جۆرە شەڕە هەفتەیەکی خایاند.[4] دوای ئەم هەفتەیە بەناوی (علی)یەوە هاوار کرا، خەڵکی شام! ئەوە (ئەمیرولموئمینین) بەشی پێویست لێتان وەستا بە خۆتاندا بچنەوە، بەیانی مافی پەلاماردانتان بەخۆمان ئەدەینو ئاگادارىن.[5] بۆ بەیانی شەڕ دەستی پێ کردکە ڕۆژی چوارشەممە بوو کە شەو داهات شەڕیان ڕاگرتو پێنجشەممە شەڕ دەستی پێکردەوەو شەوی جومعەی خایاندو لەشەوەدا شەڕەکە زۆر گەرم بوو ئەو شەوە لە مێژوودا ناوی (ليلة الهرير)ە کە ڕۆژ بوویەوە خەڵکی شام قورئانیان بەرزکردەوەو تکایان کرد با ئەم شەڕە بوەستێ، هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن: (معاویە) کابرایەکی نارد بۆ لای (علی)و قورئانێکی لەگەڵدا ناردو پێی وت: بڵێ پێی با ئەم قورئانە حاکمو دادوەر بێت لە نێوانماندا، کابرا

---

[1] ٢٥١/٧.

[2] ڕیوایەتەکە ئەڵی: (فما أفلت الا بعد جهد) معاوية بن ابي سفيان، الصلابي، ص١٠١.

[3] البداية والنهاية، (٢٥٧/٧).

[4] معاوية بن أبي سفيان / الصلابي، ص١٠٧.

[5] البداية والنهاية (٧/ ٢٥٧).

قورئانەکەی بردو ئەم ئایەتەی بۆ (علی) خوێند: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوْتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ) (آل عمران: ٢٣) (علی) فەرمووی: من پێش ئێوە قورئان ئەکەمە داوەری نێوانمان.[1] هەندێ لە توندڕەوەکانی ناو سوپای (علی) کە شمشێرەکانیان بەسەرملیانەوە نابوو وتیان: با بەردەوام بین لە پەلاماردانیان، سەهلی کوڕی (حنیف) دەستی کردە ئامۆژگاری کردنیان‌و باسی ڕووداوی (حودەیبیە)ی بۆ کردن، کە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) صوڵح‌و ئاشتی پێ باشتر بوو لە شەڕو خوێنڕشتن و هەرچۆنێك بێت دای مرکاندنەوە.[2]

بەهەرحاڵ ئەوە بوو ئاشتی ڕاگەیەنراو یەك ساڵ دانرا کە دوو لیژنەی (دەسەڵاتدار) لە نێوانیاندا کار بۆ چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان بکەن‌و ڕاوێژی هەموو کەسێك بکەن، لەلایەن (علی)یەوە (ئەبوموسا)ی ئەشعەری و لە لایەن (معاویە)وە (عمروی کوڕی عاص) دانراو ئەوانیش ڕێکەوتننامەیەکیان وەك (پرۆسەیەکی ئامادەکراو) بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکرێ دانا، کە ئەمەی خوارەوە کورتەیەکی ئەو خاڵانەیە:

ئەمە ئەو بڕیارنامەیەیە کە بەڕەزامەندی (علی کوڕی ئەبوتالیب)و (معاویەی کوڕی ئەبوسفیان) نوسراوە:

. ئەم بڕیارنامەیە ئیلزامیە بۆ (علی)و ئەوانەی لەگەڵیدان‌و ئیلزامیشە بۆ (معاویە)و ئەوانەی لەگەڵیدان.

. عەبدوڵلای کوڕی قەیس واتە (ئەبوموسای ئەشعەری) مافی بڕیاردانی هەیە لە جیاتی (علی)و ئەوەی لەگەڵیدایە، هەروەها (عمروی کوڕی عاص)یش مافی بڕیاردانی هەیە لە جیاتی (معاویە)و ئەوەی لەگەڵیدایە.

. هەردوولاو لە هەردوو هەرێمەکەیاندا (ئەمان) یان بۆ دابین کراوەو ماڵ‌و خوێن‌و ئەهل‌و منداڵیان پارێزراوە... میللەتیش لە پشتیانەوەیە.

. ئەگەر لەو ماوەیەی دانراوە کە ئەم کێشەیەی تێدا یەکلا بکرێتەوە و بڕیاری کۆتایی تێدا بدرێت یەکێك لە نوێنەرەکان مرد، ئەوە لایەنەکەی خۆی کەسێکی تری صاڵح‌و دادپەروەر ئەخاتە جێگەی بەو مەرجەی لەسەر هەمان پەیمان بڕوات کە نوێنەری پێشوو لەسەری بووە.

. ئەگەر یەکێکیش لەم دوو ئەمیرە پێش تەواو بوونی ماوەی دیاری کراو مرد، ئەوە لایەنەکەی خۆی ئەمیرێکی تر هەڵدەبژێرێت کە لە (داد)ی ڕازی بن.

. هەردوو نوێنەرەکە بۆیان هەیە لە ناوچەیەکدا کە بکەوێتە نێوان هەردوو هەرێمەکە جێگەو شوێن بۆ کارەکەیان دابمەزرێنن‌و بۆ کەسیش نییە لە نزیکیانەوە نیشتەجێ ببێ بەڕەزامەندی هەردوو لایان نەبێت.[3]

ئەوەبوو ساڵێك دانرا بۆ ئەم ئاشتییە ( بەزاراوەی هاوچەرخ ئەم ئاگربەستە) و دەسەڵات درا بەو دوو نوێنەرە، ڕاوێژ بە هەموو پیاوێکی ژیرو موسڵمان‌و دڵسۆز بکەن لە "صەحابە"و "جگە لە صەحابە" و سوود لە ئەزمون‌و عەقڵ‌و دڵسۆزی وەربگرن..

(معاویە)و سوپای شام گەڕانەو بۆ شام‌و (علی)و سوپای عێراقیش گەڕانەوە بۆ (کوفە). بەڵام وەك مێژوونووسان ئەڵێن: لەڕێگەداو بەرلەوەی بگەنەوە کوفە بە چەند قۆناغێك هەشت هەزار کەس لە سوپاکەی علی جیابوونەوەوە ناڕازیی بوونی خۆیان بەو پەیماننامەیە ڕاگەیاند".[4] کە ئەوانە زۆربەیان "فیتنەچی‌و توندڕەوەکانی ناو سوپای (علی) بوون، کە دەستیان بە خوێنی عوسمان سور بوو بوو، ئەیانزانی ئامانجە پیسەکانیان بە ئاشتی نایەتەدی و خێرێك بێت لەو شەڕەدایە کە هەڵی دەگیرسێنن!!

---

[1] البداية والنهاية. ٧/ ٢٧٠.

[2] البداية والنهاية. ٧/ ٢٧٠.

[3] اسمى المطالب في حياة علي بن أبي طالب/ الصلابي (٢/ ١٧٣. ١٧٤). لەوێدا هەر حەڤدە خاڵەکەی پەیماننامەکەی هێناوە.

[4] لە هەندێ ڕیوایەتدا ئەڵێ: (چوارده هەزار) و لە هەندێ ڕیوایەتی تردا ئەڵێ: (بیست هەزار). هەمان سەرچاوە، (٢/٧٤٢).

ئەوەبوو ئەم کۆمەڵە هەر بەوەوە نەوەستان کە دژ بەو پەیماننامەیە بوەستن، بەڵکو دەستیان دایە فەتوای ناهەق و رایان گەیاند کە (علی)و (معاویە)و هەرچی لەگەڵیاندان (کافر)ن و خوێنیان حەڵاڵەو نەفام و نەفس نزم و گەندەڵەکانیش شوێنیان کەوتن.[1] "علی"، "عبدالله کوڕی عباس"ی نارده لایان بۆ ئەوەی بە (زانیاری)و بە (عەقڵ) موناقەشەیان بکات و لەو کەللە ڕەقییەیان دایان بەزێنێ، بەڵام هەر سوور بوون لەسەر ڕاکانی خۆیان بەڵی چەند هەزار کەسێکیان لێ گەڕایەوە، بەڵام ئەوەندە نەبوو کە شەوکەتیان پێی بشکێ، "علی" خۆی ئەمجارە ڕۆیشت بۆ ناویان بۆ (حروراء)، بەڵام سوودی نەبوو، ناچار لەسەر چەند خاڵێك ڕێکەوت لەگەڵیاندا وەك (نیوە چارەسەر)..

١. ئێمە ڕێگەی مزگەوت و دەرس و دەورتان لێ ناگرین.

٢. مافی خۆتان هەیە لە (بیت المال) دا تا دەستمان بە یەکەوە بێت.

٣. مافی شەڕکردن لەگەڵتاندا بە خۆمان نادەین ئەگەر ئێوە شەڕمان پێ نەفرۆشن.[2]

ئەمانە هەر داوای پەلاماردانی شامیان لە (علی) ئەکرد، "علی"یش ئەیفەرموو: "من پەیمانم داوەو پەیمانی خۆم ناشکێنم و خوای گەورەش ئەفەرموێ: "وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ .."."[3] لەو ماوەیەدا (خوارج)ەکان ئەوەندە ئەزیەتی دڵی (علی)یان داو قسەی ناقۆڵاو خراپیان پێ ئەکرد، ناچاربوو خۆی کۆبکاتەوەو سوپا بەرێتە سەریان لە (نهروان)، کە وەك مێژوونووسان ئەڵێن لە ڕۆژی (٣٨/٩/٢)ی کۆچیدا (علی) بە سوپاکەیەوە پەلاماری (نهروان)ی داو هەموویانی لەناوبردو تەنیا (١٠) کەسیان مایەوە و ئەوانیش هەڵاتن یەکێك لەوانە (أبو ملجم) بوو کە بڕیاری دا لە تۆڵەی هاوڕێکانی دا (علی) شەهید بکات و ئەوە بوو پەیمانەکەی خۆی بردە سەرو لە نوێژی بەیانیدا خۆی داگرت بۆ (علی)و دایە بەر خەنجەرو ئەوەندەش بە (حیرسەوە) خەنجەرەکانی لێ دابوو تەنیا سێ ڕۆژ ماو دوای سێ ڕۆژەکە گیانی سپارد".[4] و پاشان خەڵکی (حەسەن)ی کوڕیانی خستە جێگەکەی (علی باوکی)و کردیانە خەلیفە، ئەویش بە سیاسەتێکی ووردو حەکیمانە خەڵکەکەی سازو ئامادە کردو هات (بەیعەتی دا بە موعاویە)و کۆتایی بە هەموو ئەو ئاوە لێڵە هێنا کە پاشماوەکانی بکوژانی عوسمان و سەبەئییەکان بەردەوام ڕاویان تێدا ئەکرد، ئەوەبوو ئیتر ئەو برینەی کە لە جەستەی میللەتی ئیسلامیدا دروست بوو قەدماغەی بەست و سوپای شام و سوپای عێراق و هەموو وڵاتان بوونەوە بە یەك سوپای ئیسلامی و ئەو ساڵەش ناونرا (عام الجماعة)و سوپای ئیسلامی دەستیان بە "فتوحات" کردەوە.

بۆ زیاتر شارەزابوون لەم مەسەلەیەو بۆ ئەوەش خوێنەری بەڕێز سەر دەر بکات لە ئەو هەمووە ڕیوایەتە نادروستانەی خراوەتە ناو مێژووەوە با کتێبی (معاوية بن أبي سفيان. شخصيته وعصره/ د. علي محمد الصلابي) بخوێنێتەوە کە ڕیوایەتە (صحيح)ەکانی مێژووی هێناوەو ڕیوایەتە نادروست و درۆینەکانیشی هەڵسەنگاندووەو ڕەتی کردونەتەوە.

ئێمە ئەمەندە بەشیاو ئەزانین کە بیڵێین لەو ڕوداوانەدا و زانیاری بێ بناغەو نادروستەکانی (میرفطرۆس)یش ئەدەینەوە بە کۆڵی خۆی و سەرچاوە ناڕەسەنەکانیدا بۆ کوێیان ئەبات بیبات.

[1] زانایان هەموو ئەوەیان سەلماندووە کە ئەم (خوارج)انە یەك تاکە (صحابە)ش چییە تیایاندا نەبووە. اسمی المطالب (٢٢٢/٢).

[2] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە، هەروەها البداية والنهاية (٢٨٢/٧).

[3] البدايه والنهايه، (٢٨٢/٧)و (٧/ ٣٠٧).

[4] اسمی المطالب، الصلابي، (٢/ ٥٠٠).

خوێنەری بەڕێز:

وەك لە پێشەکییەکەدا باسم کردووە چ (میرفطرۆس)و چ (شوان . ع) و (سیامەکی بابەك)، فرتو فێڵو گزی زۆریان کردووە لە خوێنەرەکانیان و بۆ نموونە دوو جۆر پەراوێزیان بۆ کتێبەکە داناوە، جا ئەم پەراوێزانە لەبەرئەوە ئێمە لەناو وەڵامەکاندا وەڵامی زۆربەیمان داوەتەوە لێرەدا تەنیا پاشبەند لەسەر ئەوانەیان ئەنووسین، کە ناڕاستترین زانیاری لە خۆگرتووە.

. میرفطرۆس لە پەراوێزی (٢٥)دا ئەڵێ: محمد هەر ئەوەندە دەسەڵاتە ئایینو سیاسییەکەی سەقامگیر بوو زۆر زوو هەر ئەو هاوڕێو دۆستە مەدینەییانەی (یەهودی)و مەسیحییەکانی بەگەورەترین دوژمنانی موسڵمانان لەقەڵەمداو موسڵمانانی هاندا دژیان دەست بدەنە خەبات.. دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین کە دژایەتی لە ڕادە بەدەری محمد لەگەڵ یەهوددا بەر لە هەموو شتێك دەگەڕایەوە بۆ لایەنی ئابووری مەسەلەکە نەك لایەنی ئاینی، چونکە یەهودییەکان خاوەنی زۆربەی سامانی (حیجاز) بوونو موسڵمانان دوای کوشتنیان غەنیمەتو دەستکەوتی فراوانیان دەستکەوت.." جا دوای ئەمە ڕاستەوخۆ ئەنووسێ: (بڕوانە: تأریخ الطبري.ب٣. ل١١٤٨. ١١٤٩. ١١٥٣).

ئەمە جگە لەوەی گزیبازییەکی تێدایە و ئەیەوێ کڵاوبخاتە سەر خوێنەرەکانی گوایە ئەو قسانەی لە (تأریخ طبري)دایەو لە ڕاستیشدا وانییە و دوو سێ هەڵەی تریشی تێدایە.

١. ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) نەبوو دەستی دایە دوژمنایەتی جولەکەو گاور، بەڵکو پێغەمبەر دەستوورو پەیمانی لەگەڵدا مۆر کردنو ئەوان دەستیان دایە پەیمان شکاندنو کلك گرێدان لەگەڵ دوژمنداو لە ژێرەوە پیلانی لەناوبردنی ئیسلامو ئەهلی ئیسلامیان لەگەڵ بتپەرستانی مەککەدا دائەڕشتو لە پێشەوە بە درێژی باسی ئەمەمان سەلماند.[1]

٢. قورئان جیاوازی لە نێوان گاورو جولەکەدا ئەکاتو ئەفەرموێ: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَاناً وَأَنَّهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ). (المائدة: ٨٢).

واتە: بە دڵنیاییەوە وردی بکەیتەوە ئەبینی سەرسەختترین دوژمنی ئیمانداران بریتین لە (یەهود)و (ئەوانەی موشیرك)ن، ئەگەر وردی بکەیتەوە ئەبینی بەسۆزترین کەسیش بەرانبەر ئیمانداران ئەوانەن کە ئەڵێن ئێمە (نصاری)ین لەبەرئەوەی گەورەو (قسیس)و (رهبان)یان تێدایەو بێ گومان لوتبەرزیش نانوێنن". ئیتر کوا (یەهود)و (نصاری) بەیەك چاو سەیر کراون.

٣. ململانێیو دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ یەهووددا کەی لەسەر سامان بووە، ئەگەر یەهود مەردبوونایە و پەیمانو بەڵێنی خۆیان جێبەجێ بکردایە و بیانپاراستایە، پێغەمبەر (ﷺ) لەگوڵێ کاڵتری پێئەوتن، یان ئەگەر دیناریکیشیان شك نەبردایە، بەو شێوەیە دەستیان بدایەتە غەدرو ناپاکی پێغەمبەر (ﷺ) تۆڵەی ناپاکیەکەی لێ نەئەسەندن، ئیتر نازانم تۆ ئاگات لە مێژووی جولەکە نییە چییان کرد، یان ئاگات لێیەتی، بەڵام هەر ئەتەوێ بوختان و درۆ هەڵببەستی بەدەم ئیسلامو مێژووی ئیسلامەوە.

. (میرفطرۆس) لە پەراوێزی ژمارە (٣٠)دا ئەڵێ: مێژوونووسانی جێگای باوەڕ ژمارەی ژنانی پێغەمبەریان بە (١٥ تا ٢٣) کەس نووسیوە ئەمە بێجگە لەو ژنە (صیغە)یەیو کەنیزەکانەی کە حەزرەتی محمد هەیبوە". (جا ئەڵێ) بڕوانە: أفرینش وتأریخ . مقدسی . ب . ٥ . ل ١٠٥، تأریخ یعقوبی . ب١. ٤٥٢. ٤٥٤/ تأریخ الطبري ب٤ل١٢٩١. ١٢٩٥).

شایانی باسە قورئان هەقی هێنانی چوار ژنی بە موسڵمان داوە سەرەڕای ئەوە بە پێچەوانەی فەرمانی ئاشکرای قورئان محمد (١١) ژنی بەسەر یەکەوە هەبووە!

[1] سەیری لاپەڕەکانی پێشوو بکە.

زۆری ژنانی پێغەمبەرو دەستبەسەراگرتنیان لەماڵەوە یان لە حەرەمسەرادا .. بێگومان نەیدەتوانی نەبێتە هۆی بچڕانی شیرازەی پەیوەندی ڕێکوپێك و سروشتی ناوخێزان و لەم ڕووەوە بۆ – نموونە – دەنگۆیەکی فراوان لەمەڕ پەیوەندی (نامەشروع) ی ئایشە – ژنی محمد – لەتەك – صفوان بن معطل – دا هەبوو).

جا زۆر شەیتانانە بەدوای ئەم بێ نەزاکەتییەدا ئەڵێ: سورەتی النور لە قورئاندا ئاماژەیە بۆ ئەم کارەساتە (بڕوانە قورئان سورەتی النور ٤. ١١. ١٢. ١٣. ١٤. ١٥. ١٦. ١٧. ١٨. ١٩)و بۆ خەڵەتاندنی زیاتری خوێنەر ئەڵێ: "تأريخ الطبري و ترجمه تفسير طبري . ترجمه تفسير طبري".

لەوەڵامی ئەم بێ نەزاکەتیو بوختانو چەواشەکاریانەدا ئەڵێین:

١. کوا ئەو مێژوونووسەی کە جێگەی باوەڕە، ئەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) (٢٣،١٥) ژنی هەبووە، ئەوە هەمو کتێبی باوەڕپێکراز (الطبري)و (إبن كثير)و (إبن هشام)و (إبن إسحاق)و (إبن الأثير) لە کۆنداو ئەوەش (غەزالی)و (مبارکفوری)و (صلابی)و (أكرم ضياء العمری) بۆ کەسیان وا ناڵێن، (إبن كثير) لە ژێر ناونیشانی (باب زوجاته (صلوات الله وسلامه عليه ورضی عنهن وأولاده) دا ئەڵێ: جیاوازی نییە لەوەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە مرد (٩) ژنی لە دوای خۆی بەجێهێشت کە ئەمانەن: "عائيشة، حفصة، ام حبيبة، زينب كچی جحش، ام سلمة، ميمونة، سودة، جويرية، صفية".[1]

ئیبن کثیر لە هەمان لاپەڕەدا ئەفەرموێ: دوو ژنی تریشی هەبوو (دایکی منداڵ بوون . أم ولد) کە (ماریە)و (ریحانە) بوون، باسی یەك دوو ئافرەتی تر ئەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای کردوەو، بەڵام پێش ئەوەی مارەیان بیڕێو ببنە ژنی دەستی لێ بەرداون هەریەکەی لەبەر هۆیەك (٣٢٥/٥).

بەهەرحاڵ پێغەمبەر (ﷺ) (٩) ژنی هەبووە لەگەڵ ئەو دوو (دایك منداڵ)ە.

٢. ئەڵێ پێغەمبەر ژنی (صیغە)ی هەبووە، ژنی (صیغە) کەلای شیعەکان باوە بریتییە لە ژنێك بۆ سەعاتێك یان ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێك مارەی بکاو لەگەڵیدا ڕاببوێرێو پاشان بەرەڵای بکا، لای شیعە ئەم جۆرە ژنهێنانە لە (حج)و (جهاد)و هەرچی عیبادەت هەیە گەورەترە و بە درۆو بوختان ئەڵێن پێغەمبەر فەرموویەتی: "من تمتع مرة أمن من سخط الجبار ومن تمتع مرتين حشر مع الأبرار ومن تمتع ثلاث مرات زاحمني في الجنان".[2]

واتە: "هەرکەسێك یەکجار (صیغە) بکات دوور ئەبێت لە عادزی خوای گەورەو هەرکەسێ دووجار (صیغە) بکات لەگەڵ پیاوانی پاكو بی گوناهاندا حەشر دەکرێتو هەرکەسێ سێ جار (صیغە) بکات ئەوە پاڵپاڵێنم لەگەڵدا ئەکات لە بەهەشتدا"!!

ئاخر میرفطرۆسی ستەمکارو نەزان! لە کوێی مێژوودا هەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) (صیغە)ی کردبێت، ئەگەر (صیغە)و (موتعەکردن)یش لە قۆناغێکی تایبەتی مێژوودا ڕێی پێ درابێت بۆ چارەسەرێکی کێشەیەکی کاتی بووەو، پێغەمبەر (ﷺ) چ پێویستی بەو (رخصە)یەش هەبووە، یان چۆن پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر کارێکی (جائز) نەك (فەرز)و (سونەت)یش ئەو پاداشتە خەیاڵیو گەورەیە دائەنێ، ئەو قسەیە قسەی ئارەزوبازو بەرەڵایە، نەك هی پێغەمبەر (ﷺ).

٣. ئەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) پێچەوانەی قورئان جوڵاوەتەوەو لە جیاتی (٤) ژن (١١) ژنی هێناوە). ئەوە جارێ لەوەدا هەڵەی کە ئەڵێی پێچەوانەی قورئان جوڵاوەتەوە، چونکە کاتێك کە قورئان باسی چوار ژن ئەکات زۆرێك لە خەڵکی پێ ئەوە زیاتر لە چوار ژنی هەبووە، بەڵام کە قورئان دیاری کرد ئەبێ (چواریان) بهێڵنەوە هەر صەحابەیەك لە چوار ژن زیاتری هەبوو زیادەکەی (طلاق) دا، بەڵام خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەئەکرا کەسیان (طلاق) بدات چونکە ئەوانە بە دەقی ئایەت خوای گەورە کردبوونییە دایکی موسلمانان و بۆ کەس نەبوو بیانخوازێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: "النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ...". دەی کەواتە لەو ڕووەوە ستەمێکی گەورە

---

[1] البداية والنهاية (٣١٦/٥).

[2] تفسير منهج الصادقين/ فتح الله كاشانی، پەراوێزی (الشيعة وأهل البيت/ أحسان الهی ظبير)، (ص٢١٨. ٢١٩).

بوو ئەکرا لەو ژنانە (طلاق) بدرێن‌و کەسیش نەیانخوازێ، تەنانەت ئەگەر (طلاق)یش بردایەن‌و بۆشیان ببوایە شووبکەنەوە کێیان دەست ئەکەوت هاوشانی پێغەمبەر بوایەو چۆن ئەیانتوانی لەگەڵی بە ئاسودەیی بژین..

لە لایەکی تریشەوە، هەر خوا خۆی حەڵاڵی کرد بۆ پێغەمبەری خوا کە زیاتر لە چوار ژنی ببێت وەك ئەفەرموێت: "يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ...". (الأحزاب/ ٥٠)، ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەو ژنانەتمان بۆ حەڵاڵ کردوەو کە مارەییەکانت داون..

ئیتر میرفطرۆس ئەفەندی! (پێچەوانەی قورئانی چی)و درۆو دەلەسەی چی؟!

٤. ئەڵێ: (پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەسەر ئەو ژنانەدا گرتووە)، ئاخر ڕیسوا بیت دەست بەسەردا گرتن یانی چی؟ ژنێك بە مێردی خۆی ڕازی بێت‌و خۆشی بوێت‌و بە مەردو پیاوی بزانێ، ئامادەنەبێ بۆ جگە لە ئەو خۆی تەرخان بکات، ئیتر دەست بەسەرداگرتن یانی چی؟ ئێ خۆ کەسیش نەبووە لەناو ئەو کۆمەلگەیەدا شیرینترو پیاوترو جوانتر لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەروها پێغەمبەری خواش (ﷺ) لە قۆناغێکی ژیانیدا مەسەلەی مانەوەی ژنەکانی لای پێغەمبەری خوا یان وەرگرتنی (طلاق)ی خستۆتە دەستی هەریەکەیان‌و فەرموویەتی من وەك خەڵك دونیام لا دەست ناکەوێ، کێ دونیاو زینەت‌و خۆشی دونیای ئەوێ با بێت بە خۆشی لەیەك جیاببینەوەو کێش منی ئەوێ با بێت لەسەر ئەوەی هەمە ژیانم لەگەڵدا بەسەربەرێ، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ: "يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً * وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً". (الأحزاب: ٢٨ ـ ٢٩).

٥. چونکە (میرفطرۆس) کەسێکە گوێ بە ئابڕووی خۆی نادات، بێ ئابڕووانە ئەڵێ: (عائشە) پەیوەندی نامەشروعی لەگەڵ (صفوان)دا هەبووەو سورەتی (النور)یش باسی ئەو کارەساتە ئەکات!!

مرۆڤ نازانێ لەوەها هەڵوێستێکدا چی بڵێ، قسە بڵێ؟ بێسوودەو ناشایستەیە!! وازی لێ دێنی؟! وازهێنانیش دیسان بێسوودە! دێت‌و بە درێژی لەسەر ئەو مەسەلەیە ئەڕوات‌و برگە برگەو بوختان بوختان هەموو هەڵدەوەشێنێتەوە!! باسەکە درێژ ئەبێـەوە و کتێبەکە لە مەبەست لائەدات! بەڵام هەرچۆنێك بێت خۆ هەرئەبێ ئەو بوختانە پووچ بکرێتەوە.

پێش هەموو شتێ ئەم بوختانە بۆ دایکمان (عائیشە) پرۆژەی دەستی دوڕووەکانی مەدینە بوو، ئەیانزانی بە هەموو پیلانێك ئیسلام لە جیاتی بێهێزبوون زیاتر قەدی قایم ئەبوو، بۆیە بیریان لەوەکردەوە ئەم مەسەلەی (ئابڕو)ە بکەنە هۆکارێك بۆ بێهێزکردنی ئیسلام‌و پێغەمبەری ئیسلام‌و موسڵمانان، تا ماوەیەك ئەم بوختانەیان ئازاری موسڵمانان‌و بنەماڵەی ئەبوبەکرو تەنانەت پێغەمبەریش (ﷺ)دا کە هەندێ لە موفەسیرەکان بە (٤٠) ڕۆژیك دیاری دەکەن، بەڵام لە پاشدا خوای گەورە (١٣) ئایەتی و سورەتی (النور)ی نارده خوارەوە بۆ سەلماندنی پاکی حەزرەتی (عائیشە)و قوڕی دا بە دەمی دووڕووەکانداو دڵی پێغەمبەرو موسڵمانان‌و (عائیشە)و بنەماڵەی (ئەبوبەکری صدیقی) خۆش کرد.

قورئان ئەو بوختانە ناو ئەنێ (إفك) وەك ئەفەرموێ: "إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ..". جا ووشەی (إفك) لە زمانی عەرەبیدا بە هەڵگەڕانەوەی شتێك ئەوترێ کە دیوە پێچەوانەکەی پیشان بدەی واتە (عائیشەیەکی پاك‌و پاك داوێن، دووڕووەکان بە پێچەوانەوە باسیان ئەکرد لە ناو خەڵکدا)[*].

ئەوەش ذکولی لێناکرێ کە (صفوان) یەکێك بووە لە پیاوە صاڵح‌و زۆر خواناسەکانی ناو (صەحابە)، تەنانەت دوای ئەوەی خوای گەورە لۆمەی موسڵمانان دەکات ئەفەرموێ: "لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْراً وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ". (النور: ١٢). دوای دوو سێ ئایەتی تر ئەفەرموێ: "وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا

[*] عەرەب دەڵێ: (أفك: صرفه وقلبه)، معجم القاموس المحيط، الفيروز آبادي (ص٥٣)، وشەی (أفك).

يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ". (النور: ١٦). ئەبوو موسڵمانەكان چ پیاو چ ژنیان گومانی باشیان بە خۆیان ببوایەو كە ئەو بوختانە گەورەیان بیست یەكسەر بیانووتایە بێ گەردی بۆ تۆ ئەی خوا بە ڕاستی ئەمە بوختانیكی گەورەیە". چونكە شتەكە پەیوەندە بە پێغەمبەری خواو بنەماڵەی ئەبوبەكرو ئافرەتێكی بە دین و زاناو داوێن پاكی وەك (عائیشە)وە، ئەبوبەكر جوانی فەرموو لەو كاتە ناهەموارەدا: "سوێند بە خوا ئێمە لە نەفامیشدا شتی وانەكەوتووتە شوێنمان ئێستا لە ئیسلامەتیدا شتی وامان لێئەوەشێتەوە".. دووڕووەكان ئەیانزانی دروستكردنی بوختانێكی وا چ كاریگەرییەكی خراپی ئەبێت لەسەر ئیسلامو پێغەمبەرو ئەهلی ئیسلام، بەڵام خوای گەورە بۆ تاقیكردنەوەی گشت لایەك ماوەیەكی زۆر لەسەر ئەو مەسەلەیە هیچ ئایەتی دانەبەزاند تا هەمووی (كول) بوو، پاشان ئەو ئایەتانە سورەتی (النور)ی دابەزاند، كە دڵنیایی بە سەحابەو موسڵمانان ئەدات دەربارەی (پاكی) دایكمان (عائیشە) (ڕەزای خوای لێ بێت).

ڕاستە زۆربەی شیعە تا ئێستاش هەر لەسەر ئەو عەقیدەیەن كە عائیشە پەیوەندی نامەشروعی بووە لەگەڵ صفوان دا – حاشاهما – بەڵام هەر لە ناو شیعەدا هەیە كە ئەڵێ ئەوەی بیروڕای وابێت كە (عائیشە) پاك نییە كافرە لەوانە (طباطبائي) كە ئەڵێ:

یاعائشة سبك محرم          من أجل عین ألف عین یكرم[1]

كەواتە خوێنەری بەڕێز بەمەدا بۆت دەرئەكەوێ ئەم میرفطرۆسە بەری چ گیایەكی پیسە و بیروڕاو بوختانی كێ ئەجوێتەوە.

فەلسەفەی ئەو ژنهێنانەی پێغەمبەریش باسێكی دووردرێژەو ناكرێ ئێمە لێرەدا ئەوەندە لەسەری بڕۆین، تەنیا ئەوەندە ئەڵێین پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنهێنانەكانی هەندێكی بۆ ئامانجی سیاسیو هەندێكی بۆ ئامانجی ئینسانیو هەندێكی بۆ ئامانجی تەشریعیو هەندێكی بۆ ئامانجی كۆمەڵایەتیو هەندێكیشی وەك مرۆڤێكی خاوەن غەریزەیەكی مەشروع هێناوەو ئەوەش نەشورەییەو نەزیان بە پێغەمبەرایەتییەكەی ئەگەیەنێتو نە لە قەدرو حورمەتی كۆمەڵایەتی ئەهێنێـە خوارەوە [2].

من هەر ئەوەندە لەسەر ئەم پەراوێزانە ئەڕۆمو دڵنیام كە قسەی زۆرتر هەڵدەگرنو هەر پەراوێزەی جێگەی خۆیەتی بدەی بە وێزەی زۆربەی بڕگەكانیدا، بەڵام با ئەمەندە بەس بێتو ئەوانی تری یان نووسەرێكی شارەزا لەسەریان بنووسێ یان خوای گەورە ئەگەر فرسەتی دا لە بوارێكی تردا نەشتەری ڕەخنەیان لێ هەڵدەگرینو ئەوە ئیتر لەسەر خوا..

---

[1] الشیعة والتصحیح/ موسی الموسوي/ ص١٥.

[2] محمود غریب/ لە نامیلكەی (هذا نبیك یا ولدي) بە درێژی فەلسەفەی ئەم فرە ژنییەی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) باس ئەكات، هەركەس زانیاری زیاتری بەبەڵگەوە ئەوێت بابچێت ئەو نامیلكەیە بخوێنێـەوە.

## وتەی کۆتایی

پاش ئەوەی کە گەشتێکم کرد بە کتێبی (ئیسلامنەناسی)دا نەك (ئیسلامناسی) بۆم دەرکەوت کە:

ئەم کتێبە بێ ماناو بێ ناوەڕۆکە، چونکە لە لایەك سەرچاوەکانی بڕوا پێکراوو ڕەسەن نین، لە لایەکی ترەوە زانیارییەکانیش لارو خوارن، لە لایەکی تریشەوە نووسەرەکەی زۆر دەمپیس و بێئەدەبە، بەڵام بێدەنگ بوون لە ئاستی کتێبێکی وادا یەکێکە لە دوو شت لە دیدی ئەوانەدا کە نرخ بەو جۆرە کتێبانە ئەدەن:

١. یان ئەو زانیارییانەی ئەوان ئەیڵێن ڕاستن و نکوڵی لێ ناکرێ.

٢. یان لەناو نووسەرە ئیسلامییەکاندا کەسێك نییە بوێربێت و گیانی ڕەخنەگرتنی تێدابێت و ناچارن ئەبێ ملکەچ بن بۆ هەر بوختان و درۆیەك کە بە ناوی دینەکەیانەوە ئەکرێ.

جا من بۆ سەلماندنی دژەکانی ئەو دوو خاڵە ئەم کتێبەم نووسی، نووسیم تا بۆ دوژمنان بسەلمێ کە:

١. ئەو زانیارییانە هەموو هەڵەن و پەڵەن بەناوچاوی نووسەرەکانیانەوە .

٢. ئەگەر ئێمەی موسڵمان هەموو شتێکی دونیایمان لەدەست دەرچووبێ ئەوەمان لە دەست دەرنەچووە، کە شانازی بکەین بەم ئیسلامەوە و بوێرانە باس لە کەلتوور و مێژووی ئەم دینە بکەین، چونکە لە ڕاستیدا لە ئیسلامدا شتێك نییە کە ئێمە ڕوومان نەیەت باسی بکەین، یان ئەو شتە هاوئاهەنگ نەبێت لەگەڵ (عقل) و (زانست) و (ڕۆشدی مرۆڤایەتی)دا، کێش لەمە دڵنیا نییە با بابەتییانە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئیسلام بکات، بەڵام لەسەرچاوە ڕەسەنەکانییەوە نەك لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسان و دوژمنانی ئیسلامەوە، چونکە بە ڕاستی دەگمەن ڕێدەکەوێ کە دوژمن بە ویژدانەوە لەسەر دوژمنەکەی بنووسی و هیچ عەقڵێکیش لە دونیادا ڕێگە بەوە نادات بۆ ناسین و ناساندنی کەسێك بوختانی دوژمنەکانی بکەی بە بەڵگە.

## سەرچاوەکان


. ئیسلامناسی — علی میرفردەوس
. الأحكام السلطانية — الماوردي الشافعي
. الأحكام السلطانية — إبن الفراء الحنبلي
. قصة الإيمان — نديم الجسر
. قالوا عن الإسلام — عماد الدين خليل
. نهج البلاغة — الامام علی / حسين الاعلمي
. الدعاة والدعوة المعاصرة — محمد حسن الحمصي
. مفردات القرآن — محمد حسن الحمصي
. دەوڵەتی خیلافەت — اکرام كريم
. حتى لا تخطىء فهم القرآن — محمود غريب
. السنة ومكانتها في التشريع الاسلامي — د. مصطفى السباعي
. الموسوعة العلمية لإعجاز القرآن والسنة المطهرة — يوسف الحاج أحمد
. السيرة النبوية — الندوي
. السيرة النبوية — الصلابي
. صحيح البخاري — الامام البخاري
. فتح الباري — إبن حجر العسقلاني
. وتەی زانایان و باوەڕ بە خوا — ئەحمەد کاکە مەحمود

. مباحث في علوم القرآن مناع القطان
. الدولة العباسية محمد خضر بگ
. السيرة النبوية إبن هشا م
. فقة السيرة محمد الغزالي
. حياة محمد محمد حسين هيكل
. حياة الصحابة يوسف كاندهلوى
. الموجز في تأريخ الاسلام والمسلمين أ. د أمير عبدالعزيز
. السيرة الحركية منير الغضبان
. زاد المعاد إبن القيم
. عەلمانيەتو ئوصوليەت عفيف ئەصغەر
. البداية والنهاية إبن كثير
. دلائل النبوة البيهقي
. المدخل في العقيدة والاستراتيجية العسكرية جمال محفوظ
. الاسس الشرعية للعمل الاسلامي الاثري
. عەقيدەى مەرضية مەلا عەبدولكەريمى مدريس
. الحركات الاسلامية بين القبول والرفض اكرام كريم
. نقض المنطق ابن تيمية
. الاستشراق والمستشرقون د. مصطفى السباعي
. المدخل الى القرآن الكريم محمد عبدالله الدراز
. ئيسلامو عەرەب مەزدەكى
. تأريخ الطبري الامام الطبري
. دراسة في السيرة عماد الدين خليل
. المنجد في اللغة
. إرشاد السارى شرح صحيح البخاري القسطلاني
. مختصر تفسير إبن كثير الصابوني
. مناهل العرفان في علوم القرآن الزرقاني
. تأريخ الشعوب الاسلامية كارل بروكلمان
. الرحيق المختوم المباركفوري
. لباب النقول في أسباب النزول السيوطي
. زاد المسير ابن القيم
. اليهود في السنة المطهرة عبدالله الشقاري
. غزوة الاحزاب أحمد باشميل
. مختصر تفسير الامام الطبري أبي يحي التجيبي
. الروض الانف السهيلى
. رياض الصالحين النووي

. النظام السياسي في الاسلام          محمد عبدالقادر أبو فارس
. الشيعة وأهل البيت          أحسان الهى ظهير
. منهاج السنة النبوية          أبن تيمية
. العواصم من القواصم          أبن العربي
. الكافي في الفروع          الكليذى
. مختصر التحفة الاثنا عشرية          شاه عبدالعزيز الدهلوي
. الفصل في الاهواء والملل والنحل          أبن حزم
. جامع العلوم والحكم          أبن رجب الحنبلي
. نظرات في السيرة          حسن البنا
. قضايا الأدب والثقافة والفن          انور الجندي
. التربية الجهادية          منير الغضبان
. صحيح السيرة النبوية          اكرم ضياء العمرى
. معاوية بن أبي سفيان          الصلابي
. مەلای جەزیری          مامۆستا هەژار
. العبادة في الاسلام          يوسف القرضاوي
. الاسلام          سعيد حوى
. التعبير القرآني          د. فاضل السامرائي
. منهاج المسلم          أبوبكر الجزائري
. السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية          د. مهدي رزق الله
. تذكرة الدعاة          البهي الخولي
. رجال الفكر والدعوة          الندوي
. فريشتەکانی سەر زەوی          طه بابان
. مختصر منهاج القاصدين          المقديسي
. اسنى المطالب في حياة على ابن أبي طالب          الصلابي
. الشيعة والتصحيح          موسى الموسوي
. هذا نبيك يا ولدي          محمود غريب

هەندێ سەرچاوەی تریش کە لە شوێنەکانی خۆیاندا باسمان کردوون.

## پێڕست (ژمارەی لاپەڕەکان بە پێی کتێبە چاپکراوەکە )

## بڵاوكراوەكانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، رووداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |

| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان<br>رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
|---|---|---|
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا<br>بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |